# الاكاديمي

## مجلة المجمع العلمي الكردستاني

**العدد: ٤**

**كردستان – اربيل**
**٢٠٠٦**

# ACADEMY

*a Periodical Published by Kurdistan Aacademy*

Vol .4

Kurdistan – Hawler (Arbil)
2006

## ناورۆك

# سەروتار

نەتـەوەی کـورد لـە مێـژووی کـۆن و تـازەی خۆیـدا هـیچ دەرفـەتێکی ئـەوتۆی بـۆ هەڵنکەوت بایەخ بە زمان و ئەدەبیات و نووسینەوەی مێژووی خۆی بدات. بەتایبەتی لـە پرسـی زمانـدا، کـورد نـەیتوانی وەك نەتەوەیـەك خـاوەنی یـەك زمـان و یـەك ئـەلفابێی نووسین بێت. بەردەوامبوونی ئەم رەوشە تا سەردەمی نوێ کە سـەردەمی پێـشکەوتنی خوێنـدەواری و تەقینـەوەی شۆڕشـی تـەکنیکی و خێرابـوونی هۆیـەکانی راگەیاندنـە، کێـشەی نـەبوونی یەکـەتیی زمـان و ئـەلفابێ و رێنووسـی‌بردە قۆنـاغێکی دژوارتـرەوە، بەتایبەتیش کە هێشتا لە ناو کورددا دەسەڵاتێکی ئـەوتۆ نەچەسـپیوە یـان چـاتر بڵـێین هەلومـەرجێکی لـەبار و گونجـاو نەهاتووەتـە بـەرەوە تـا چارەسـەری سـەرجەم ئـەم کێشەگەلەی لە سایەدا بێتە دی.

کـۆڕی زانیـاری کوردسـتان بـەپێی یاسـایەك کـە لـە پەرلـەمانی کوردسـتانەوە دەرچـووە، دەزگـای هـەرە بـاڵای بڕیـاردەر و یەکلاکەرەوەیـە بـۆ چارەسـەری تـەواوی پرسگەلی ئاڵۆزی سەر بە کولتووری کوردی. کۆڕ، لەم ساڵەدا پێی نایە شەشەمین سـاڵی تەمەنیەوە. دەبوایە لەم ماوەیەدا کە ماوەیەکی کەم نییە، رووالّەت و بیچمی گـەلێك لـەو چارەسەرانە دەربکەوتنیایە کە بۆ کێشەگەلی زمان و ئەدەبیاتی کوردی پێویستن. بـەڵام بە داخەوە وانەبوو. ئێمە لە کۆڕی زانیاریدا دان بـەوەدا دەنـێین کـە کـۆڕ لـەو ماوەیـەدا دەزگایەکی بە بڕشت و بەرهەم نەبووە، بەڵام دەبێ ئـەو هەلومەرجـەش روون بکرێتـەوە کە کۆڕ بەسەری بردووە.

کۆڕ نەیتوانی ئەو کەش و هەوایە بخوولقێنێ کە بۆ کارەکانی پێویستن. بەهۆی ڕەوشی ناجێگیرەوە زۆربەی پسپۆڕ و شارەزایان بە دەنگ بانگەوازەکانی کۆڕەوە نەهاتن و بەشدارییان لە بەرنامەکانیدا نەکرد. جگە لەوەی کە ژمارەیەکیان لە هیچی نەبوو لێی لاڵووت بوون. زانستگە و دەزگا ئەکادیمییەکانی کوردستان هیچ دەستێکی هاریکارییان بۆ کۆڕ درێژ نەکرد. بگرە دەبوون بەکۆسپ و لەمپەر بۆ بەرنامەکانی، گەلێك کاریش کران کەنەدەبوایەبەبێ ئاگەداری و پرس و راوێژی کۆڕ بکرێن، لەبەرئەوەی ئەنجامی چەوتی ئەم کارانە نیشانەی نەبوون یان کارانەبوونی کۆڕی زانیاری کوردستان دەگەینن. گەلێك جار تیر و توانج لە کۆڕ و سستیی کارەکانی گیراوە بەلاّم کەس بیری لەوە نەکردووتەوە کەوا دەزگایەکی بێ دەسەلاّت و دەستەپاچە دەتوانێ چی ئەنجام بدات. ئەمانە وێرای نەبوونی ئیمکانیاتی مادی و نەبوونی سەرۆکێکی خۆ تەرخانکردوو بۆ راپەراندنی پرۆژەکانی کۆڕ و جێبەجێ کردنی پێوەندی و پێداویستییەکانی.

وا ژمارەیەکی تازەی کۆواری کۆڕ دەخەینە بەردەست. ئەمە چوارەمین ژمارەیە لە ماوەی ئەم شەش ساڵەدا. سەرنجدانێکی خێرا بەم ژمارانەدا راستیی قسەکانی سەرەوە و هەلومەرجی کارکردنی کۆڕمان بۆ دەردەخات. وێرای چەندان بانگەواز و چەندان نامە و نووسراوی تایبەت بۆ ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕان، کەمێکیان نەبێ کەس بە دەنگمانەوە نەهات بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم کۆوارە. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم چەند ژمارە کەمەش لە کۆواری کۆڕ بە ئەزیەتێکی زۆرەوە دەرکراوە.

هەرچۆن بێت، وا نەبێ مەبەستمان ئەوەبێت کۆڕ لە بەرپرسیارییەکانی بدزینەوە، بەلاّم ئەوەش هەیە هیچ کارێك لە کوردستانی ئەمرۆدا بەتەنیا باڵی و بێ پشت و پەنا نایەتە دی. هیوادارین ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم هەلومەرجە گۆڕانی بەسەرداییت و کۆڕ بتوانێ بەو ئەرکانە هەڵستێ کە لە یاساکەیدا بۆی نووسراوە.

دەستەی نووسەران

# پاراستنی ئەدگاری نەتەوەیی لە ووشەی فەرهەنگی زمانی نووسینی کوردیدا

مارف خەزنەدار

-١-

### دەنگی «غ» لە ئەلفوبێی زمانی کوردیدا

ئەلفوبێی هەموو زمانێك لەو تیپانە پێك دێ کە ووشە دروست دەکەن. ئەو ووشانە دەچنە ناو فەرهەنگی زمانەکەوە. ئەلفوبێی هەموو زمانانی گێتی دوو بابەتە دەنگ دەگرنە خۆیان، یەکێکیان ئەو دەنگە بنچینەیییانەن ووشەی ڕەسەنی خۆماڵی زمانەکە دروست دەکەن، ئەوی دیکەیان ئەو دەنگە بێگانە و لاوەکییانەن لە زمانی دیکەوە هاتوونەتە ناو زمانەکەوە. بە گشتی ژمارەی ئەم جۆرە دەنگانە لە ئەلفوبێی زمانی نەتەوەیی (قەومی)دا کەمە.

زمانی کوردی وەکو هەموو زمانێکی دیکە چەند دەنگێکی گرتۆتە خۆ لە ووشە ڕەسەنە خۆماڵییەکانیدا بەر گوێ ناکەون، ئەو دەنگانە چوونەتە ناو تەرکیبی هەندێ ووشەی بێگانەوە، بە زۆری لە بنەماڵەی زمانانی عەرەبی (سامی) و تورکی مەغۆلی وەرگیراون و کەوتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە و بوون بە بەشێك لە ئەلفوبێ و فەرهەنگی زمانی کوردی.

دەنگی «غ» یەکێکە لەو تیپە بێگانانەی هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە.

له حەفتاكانی سەدەی بیستەم دا دۆستی بەڕێزم شاعیری ناسراو هێمن له بەغدا بوو، لـه نیوەندی ڕۆشنبیری و خوێندەواریی‌یەوە نزیك بوو. بیروڕاكانی بە زۆری كاریگەر بوون لـه بابەت هەموو لایەنەكانی كولتووری كوردەوە، بەتایبەتی لە زمان و ئەدەب دا.

یەكێ لە بۆچوونەكانی ئەوە بوو «دەنگی (غ) لە زمانی كوردی‌دا نی‌یـە، پێویـستە لـەناو ئەو ئەلفوبێ‌یە لاببرێ، هەموو ووشەیێكی ئەم دەنگەی تێدا بـێ دەكـرێ لـەباتی ئـەو بـە دەنگی (خ) بنووسرێ».

ئەم بیروڕا و بڕیارە كاریگەر بوو، تائێستا شوێنەواری ماوە، لەبەر ئـەوە لـەپێناوی بنـبڕ كردنی ئەم دیاردەیە بیر لە نووسینەوەی ئەم پەرەگرافە كرایەوە.

له فەرهەنگی زمـانی كوردی‌ـدا ژمـارەی ئـەو «غ»انـەی چـوونەتە نـاو دروسـت بـوونی ووشەوە كەم نی‌یە. لەكاتی بەكارهێنانی ئەو ووشانە لە بەشێكیان دا (غ)ەكانیـان وەكـو خۆیان دەمێننەوە، لە بەشێكی دیكەیان دا (غ)ەكان دەبن بە (خ). لەم لایەنـەوە ئەگـەر لە بڕێك لەو ووشانە دەنگی (غ) ببێ بە (خ) تا پلەیێك ئاسایی بێ، لە هەندێكی دیكـەیان دا دەبێتە مایەی پێكەنین. وەكو ئەوەی «بەغـدا» ببـێ بـە «بەخـدا»، یـا نـاوی كەسـانی كوردی وەكو «غەفوور و غەریب» ببن بە «خەفوور و خەریب». جگە لەوەش كورد بەهیچ جۆرێ «قۆناغ» و «قەدەغە»ی نەكردووە بە «قۆناخ» و «قەدەخە»، لـە ڕووی فۆنێتیـك و ئاوازی مۆسیقی‌یەوە دەنگـی «غ» لـە دەنگـی «خ» ناسـكتر و سـووكتر و لەسـەرخۆترە. بێگومـان ڕۆژی ئـەمڕۆ بـەهۆی ئـامێری ئـەلیكترۆنی لەرینـەوەی دەنگـی ئـەو دوو تیپـە دەتوانرێ بە میلیۆن شەپۆل تۆمار بكرێ لەپێناوی ئەوەی كـورتی و درێـژی و ناسـكی و درشتی‌یان بكەوێتە ڕوو.

بـۆ دیـاركردنی جێگـەی ئـەو ووشـانەی دەنگـی «غ»یـان تێدایـە لـە زمـانی كوردی‌ـدا فەرهەنگی «كـوردی ـ ئینگلیـزی» تۆفیـق وەهبـی و سـی. جـەی. ئەدمۆنـدس كـراوە بـە سەرچاوە و هەموو ووشـەكانی لـەم بابەتـەوە تێیـدا هەڵبـژێرراون. ئەمـە و كـەڵكیش لـە فەرهەنگەكانی دیكەی زمانی كوردی وەرگیراوە، بەڵام لەم باسەدا هەموو ووشەكانی لـەم بابەتەی تێدا تۆمار نەكراوە.

ووشەی فەرهەنگی ((کوردی - ئینگلیزی)) و بەشێکی کەمیش لە هەموو فەرهەنگەکانی دیکەی زمانی کوردی کە دەنگی ((غ))یان تێدا هەیە ئەمانەن:

## ئـ

ئاغا، ئاغزە، ئۆغر، ئیسپەناغ

## ب

باغ، باغچە، باغە (سیلۆلۆید celluloid)، باغەڵ، بالغ (بالق)، بەرداغ، بەڵغ، بەڵغەم، بناغە، بۆیاغ.

## پ

پێغەمبەر.

## ت

تەغار، تیغ.

## ج

جغارە (جیگەرە)، جغز (خەت کێشان)، جغزێن(ناوی یاریییێکە).

## چ

چراغ، چغە یا چەغە یا چغەچغ (بۆ سەگ)، چۆغە.

## د

داغ، دامغە (تەمغە)، درێغ، دەباغ، دەغەز، دەغەزدار، دەغلَ, دەغەڵ، دەغیل، دەغیلە، دەماغ، دۆغرەمە.

## س

ساغ، سەغڵەت، سەغی (سەخی)، سیغ sîgh (skewer)، سواغ (سواق)، سیمرغ.

## غ

غار(غاردان)، غارا، غاراو، غاز (گاز)، غازی (ناو ، پـاره)، غالیـب، غایـەتی (هـەر چۆنیّ بیّ)، غایەن (خائن)، غەدر، غەددار، غەرغەرە، غـەرەز، غـەریب، غـەزا، غـەزال، غەزالـە، غـەزەل (شـیعری دلّـداری، جـۆرە قوماشـێکی ئاویـشمینە)، غەزەنفـەر (شـێر)، غەزنـە، غەش، غەشیم، غەفوور، غەڵبەغەڵب، غەڵەبە، غەڵەت، غەم، غـەمگین، غـەوارە، غـەوغا، غەیبەت، غوربەت، غوسلّ، غونچە، غوول(غوولی بیابان)، غیرەت.

## ف

فوغان (فیغان).

## ق

قاچاغ(قەچاغ)، قاووغ، قایەغ، قەپاغ، قەتماغ، قەدەغە، قەرەداغ، قەڵـەباڵغ(قـەرەباڵغ)، قەڵغان، قۆناغ.

## ك

کاغەز.

## گ

گەردەنباغی.

## ل

لغاو.

## م

مغازە، مەغروور، مەغلووب، مێرغوزار.

## و

واغێن (ناوی یاریییێکە)، ووڵاغ

## ی

یاغی (تۆران)، یەغدان.

لـەم ووشـانەدا ئـەوە دەردەكـەوێ بەشـی زۆری لـە نووسـین و قـسەكردن دا دەسـكاری دەنگی «غ»یان تێدا نەكراوە، بەشێكی كەمیش لە هەندێ لە ناوچەكانی كوردستان وەكو سلێمانی و هەورامان و ئەردەلان لە قسە كردن دا دەنگی «غ» بووە بە «خ»، ڕاستی‌یەكە ئەوەیە لە نووسین دا «غ»ەكە نەبێ بە «خ» و هەروەكو خۆی بمێنێتەوە.

شیعری كلاسیكی كوردی بەگشتی و شیعری بـەحری عـەڕووزی بەتایبـەتی فەرهـەنگی ووشـەی خـۆی هەیـە. گـەلێ ووشـەی بێگانـەی عـەرەبی و فارسـی و تـوركی عوسمـانی كەوتوونەتە ناو ئەو شیعرانەوە. ووشەكان لە دوو بابەت پێـك هـاتوون، بەشـێكی زۆریـان لـە قـسە كـردن و نووسـینی كوردی‌ـدا بـەكاردەهێنرێن و بەشـێكی كـەمیان تـەنیا لـەو شیعرانەدا دەكەونە بەرچاو.

لەم ماوەیەدا دەكرێ فەرهەنگی شیعری دیوانی نـالی بكـرێ بـە بەڵگـە بـۆ هـەموو ئـەو ووشە بێگانانەی لە شـیعری كلاسـیكی كوردی‌دا بـەكارهێنراون و دەنگـی «غ»یـان تێـدا هەیە.

ووشەكانی فەرهەنگی شیعری نالی ئەمانەن:

## ئـ

ئاغاز (سەرەتا)، ئاغووش (باوەش)، ئەغیار (بێگانە)

## ب

باغ، باغات، باغەوان، باغی سێوان، باغچەسەرا، باغی (لە خوانـەترس، زۆردار)، بەغـدا، بوغز (كین)، پەیغامبەر (پێغەمبەر).

## ت

تاغی (طاغي، زۆردار)، تەغنیە (گۆرانی ووتن)، تیغ (شیر، خەنجەر)، توغرا (توڕڕە)

## د

داغ (زۆر گەرم)، داغات (داغ كراو)، دەماغ (مێشك)، درێغ (مخابن، ئەفسووس).

## ر

ڕاغ (مێرغوزار)، ڕاغیب، ڕەوغەن (ڕۆن).

## س

ساغ، سەبغ (صًبغ)، سەبغەتوڵڵا (ئایینی خودا، ئایینی ئیسلام).

## ش

شۆر و غەرغەرە (سەرەمەرگ).

## غ

غار (ئەشكەوت)، غارات (كۆی غار)، غارەت (تالأن كردن)، غاراتگەر (تالأنكەر)، غاری (نیسبەتە بۆ غار)، غافیل، غالیب، غالیە (دەرمانێكی بۆن خۆشە)، غایب، غەبرا (خاك، خۆل)، غەرامەت، غەرەق، غەریب، غەریق (خنكاو)، غەررا (جوان، باش)، غەرغەرە، غەرق، غەرقە، غەزالە، غەزالە چاو، غەزالەی بەڕ، غەزەل (لیریك، دڵداری، مێبازی، قوماشی نەرمی ئاوریشمی)، غەزەنفەر، غەز (قەڵەو)، غەڵەت، غەڵەتان، غەڵتان (گلۆربوونەوە) غەم، غەمخوار، غەمزە، غەمگین، غەنی، غەوس(غوث)، غەوغا، غەوواس، غەیب، غەیبەت، غەیوور، غەیر، غەیری، غیبتە (غبطة) (شادمانی)، غیرەت، غیلمان، غینا(غِناء) (گۆرانی)، غوبار، غوروور، غوربەت، غوربەت كەش، غوررە (ڕۆژی یەكەمی هەموو مانگێكی قەمەری)، غوفران، غولام، غونچە، غونچەدەم، غونچەگوشا، غونچەی نەشكوفتە.

## ف

فاریغ، فەراغ، فیراغ (قاپ و قاچاغ)، فیغان، فورووغ.

## ق

قەرەداغ.

## م

مەشـغوول، مـەغاك (قـوولْ، چـالْ)، مـەغروور، میغفـەر (كـلاّوی ئاسـنی جـەنگاوەران)، مەغفەرەت (لێبووردن)، مورغ (باڵندە)، موغیلان (نـاوی درەختـە)، موغبـەر (تـۆزاوی)، موغلەق (داخراو، دژوار)، مولغا (دەست لێ هەڵگیراو، زاراوەی زانستیی نەحوە)، نەغمـە (ئاواز).

لـەم پیـشاندان و لێكۆڵینەوەیـە ئـەو ڕاسـتییە دەردەكـەوێ بـەهیچ جـۆرێ نـاتوانرێ دەنگی ((غ)) لە ئەلفوبێی كوردی دوور بخرێتەوە چـونكە ((بەغـدا)) نـابێ بـە ((بەخـدا)) و هەروەها بابایێكی بە ناو خوێندەواری كوردیش كە دەبیستێ لە ئەلفوبێی كوردیدا ((غ)) نییە ((سوڵتان مەحموودی غەزنەوی)) ناكا بە ( سوڵتان مەحموودی خەزنەوی)، ئەمە لـە مامۆستایێكی زمانی كوردی ڕووی داوە.

-٢-

### ((چەهرە)) كوردییە، ((چـِهْرە = چیهرە)) فارسییە

جێگەی سەرسوڕمانە لە سەرجەمی دیوانی عەبدوڵلاّ گۆران ووشـەی ((چـەهرە)) بكـرێ بـە ((چـیهرە)). شـیعری ئـەم شـاعیرە لـە سـەردەمی ژیـانی خۆیـدا چـاپ كـراوە. لـە دەسنووسەكانیدا بە خەتی خۆی ((چەهرە))ی نووسیوە. لەبەرچی ئەم سـیغە كوردییـە بكرێ بە سیغەی فارسی!

ووشەیێكی لاتینی كۆن ((revocation)) لە ئینگلیزیدا بووە بـە ((ریڤۆلیوشـن)) لـە فرەنسیدا ((ریڤۆلیتسیۆن)) لە رووسیدا ((ریڤۆلیوتسیا)).

ئەوە ڕاستە هەموو فەرهەنگە فارسییەكان، كـۆن و تـازە، ئـەم ووشـەیان بـە وێنـەی ((چـِهْرە = چیهرە)) تۆمار كردووە، لە بەكارهێنانیش دا هەر بەم شێوەیە دەری دەبـڕن، كەچـی هـەموو فەرهەنگـە كوردییـەكانی كـۆن و تـازە بەتایبـەتی فەرهـەنگی كـوردی - ئینگلیزی تۆفیق وەهبـیش ووشـەكەی بـە وێنـەی ((چـەهرە)) تۆمـار كـردووە، دیـارە لـە بەكارهێنانیش دا لە كورد نەبیستراوە بلێ ((چیهرە))، تەنیا بە ((چەهرە)) بەكاری هێناوە،

لەمـەوە گـۆڕانی بەسـەردا هـاتووە و لـە دوایی‌دا بـووە بـە "چـارە". خـۆ ئەگـەر کـورد «چیهرە»ی بەکاربهێنایە لەکاتی گۆڕانەکەدا ووشەی «چیرە»ی لی پەیدا دەبوو.

ووشەی «چەهرە» کە هاتۆتە ناو زمانی کوردی‌یـەوە لـەژێر کاریگـەری زمـانی تـورکی عوسمانی‌یـەوە بـووە. لـە فەرهـەنگی تـورکی «مکمـل عثمـانلی لغتـی» (ئەسـتەمووڵ ۱۹۰۱/۱۳۱۹) لە بابەت ووشەی «چەهرە»وە ئەمە هاتووە:

(«چـَــهْرَه» (فارسـی‌یە) ڕووی ئـادەمزاد، وێنـە، لـە بنجـدا (چ)ەکـە ژێـردارە، واتـە کەسرەی عەرەبی «چـِــهْرَه»یـە). هـەروەها لـەو فەرهەنگـەدا لـە ووشـەی «چـەهرە»وە ووشە دروستکراوەکانی «چەهرە پەردان» و «چەهرەگوشـا» و «چـەهرە نومـوود» تۆمـار کراون.

بەم جۆرە دیارە کورد ووشەکەی لە سـیغە تورکی‌یـە عوسمانی‌یەکـە وەرگرتـووە کـە «چەهرە»یە، نەك لە سیغە فارسی‌یەکەی کە «چیهرە»یە. لە پاشانا پێویـستە بـیر لـەوە بکرێتەوە شاعیرانی بزووتنەوەی «شیعری نوێ»ی کوردی لە کوردستانی باشوور لـەدوای جەنگی یەکەمی گێتی‌ی سەدەی بیستەم نووری شێخ ساڵح و عەبـدوڵلا گـۆران و ڕەشـید نەجیب (فەرامەرز) لە شیعرە کلاسیکی‌یەکان و لاسایی شیعری عوسمانی و بزووتنـەوەی «شیعری نوێ»ی کوردی ووشەکەیان بە سیغەی «چەهرە» نووسیوە، نەوەکو «چیهرە».

کولتووری کورد تووشی گـەلێ کارەسـات هـاتووە لـە ئـەنجامی ئیدیۆلۆجی‌یـەتی «پـان ئیرانیزم»، با زانا و ڕۆشنبیر و خوێندەوارانمان بە هوشیاری ئاگاداری ئەم دیاردە دژوارە بن، لە چوار سـەد سـاڵ بـەر لـە ئێـستا لـە دەسـەڵاتی، سـەفەوی‌یەکانەوە دەسـتی پـێ کردووە تا ئێستا بەردەوامە، بەتایبەتی لە ئێران دا.

-٣-

## «هەزار» کوردی‌یە، «هوزار» هەڵەیە

یەکێ لە ماناکـانی ووشـەی «هـەزار» بـۆ باڵنـدەی «بلبـل» بـەکارهێنراوە. بـەم مانایـە ووشـەکە لـە فەرهەنگـەکانی زمـانی کـوردی نـەهاتووە. هـەروەها لـە زمـانی نووسـین و قـسەکردنیش دا بـۆ ئـەم مانایـە بـەکار نـەهێنراوە. ئـەوە هەیـە لـە شـیعری کلاسـیکی کوردی‌دا «هەزار» بە مانای «بلبل» هاتووە. من وا زان دەکـەم دیـوان و بـەیازی شـیعری

کلاسیکی کە بە ئیملای کۆن نووسراونەتەوە ووشەکە تیایان دا بە وێنەی ((هـزار)) نووسراوە، کە تائێستاش بە فارسی بەم جۆرە دەنووسرێ. لە پاشانا ئەم دیوانانە کە بە ئیملای نوێ نووسراونەتەوە ووشەی ((هَزار))یان بە هەڵە کەوتۆتە بەر زار و بە وێنەی ((هوزار))یان نووسیوە بۆ ئەوەی لە ووشەی ((هەزار))ی ژمارە جیا بێتەوە.
بەم پێیە لام وایە لەبەر ئەوەی ئەم ووشەیە بە مانای ((بلبل)) لە نووسین و قسەکردنی کوردیدا جێگەی نییە، تەنیا لە شیعردا هاتووە ڕاستتر ئەوەیە وەکو خۆی بە شێوەی ((هەزار)) بەکار بهێنرێ، بۆیە لە ((مێژووی ئەدەبی کوردی))دا هەموو ((هوزار))ەکانم کرد بە ((هەزار)).

لەلایێکی دیکەوە ئەم ووشەیە بە شێوەی ((هەزار)) چۆتە ناو دیالێکتی عامیانەی زمانی عەرەبی شاری بەغدا. قسەیێکیان هەیە بە ڕووی کەسانی زۆربڵێ و چەنەبازدا دەدەنەوە و دەڵێن((صایرْ عَلینا بُلْبُلْ هَزار)) واتە (لێمان بووە بە بلبل هەزار).

ئەمەو ووشەی ((هەزار)) و ((بلبل هەزار)) ئەو جۆرە بلبلە دەگەیێنێ بە هەزار ئاواز دەخوێنی. لەوانەیە باڵندەیێکی ئەفسانەیی بێ. جگە لەمە وەك داهێنانێکی ئەدەبی لە نووسینی هونەری ڕۆمانتیکییانە دەکرێ ووشەی ((هەزارستان)) دابهێنرێ بە مانای ((وولاتی بلبلان)) یا ((نیشتمانی بلبلان)) لەم لایەنەوە لەم گەشتەی دواییەم دا لە نامەخانەی گشتی شاری سەقز چاوم بە کتێبێکی فارسی کەوت بە ناوی ((هەزارستان))ەوە، بەرهەمێکی داهێنراوی ئەدەبی بوو لە بابەت وولاتی بلبلانەوە.

-٤-

**((مۆزە)) ڕاستە، ((مۆزەخانە)) هەڵەیە**

ووشەی ((مۆزە)) زۆر کۆنە، لە زمانی لاتینی بە شێوەی ((museum)) و لە زمانی گریکی کۆن دا بە شێوەی ((museion)) هاتووە، مانای پەرستگا دەگەیێنێ. ئەمە لەوەوە هاتووە گۆیا لە وولاتی گریکی کۆن دا ناوی جێگەیێك بووە گفتوگۆی زانستی و پیشەسازی تێدا کراوە، هەروەها ناوی گردێك بووە بارەگای چەند خوداوەندێکی لێ بووە.

لە پاشانا ئەم ووشە کۆنە وەك زاراوەیەك لە زۆربەی زمانانی نەتەوەکانی گێتی بۆ ئەو دەسگایە دانراوە کە ئەو کەلوپەل و شتومەکانەی لێ دەپارێزرێ ئەوەی پێویستە خەڵکی چاویان پێی بکەوێ و ئاشنایان بێ.

ووشەکە وەکو دیارە ناوی جێگەیە، لەبەر ئەوە وەکو خۆی لە هەموو ئەو زمانانە وەرگیراوە کە پەسەند کراوە وەك زاراوەیێك بۆ ئەو دەسگایە بەکاربهێنرێ.

هاوسێیانی ئێمە عەرەب نەبێ بۆ ئەو دەسگایە ((المتحف)) بەکاردێنێ، کەچی لە زمانی فارسیدا شێوەی ((مُوزە، مووزە، mûze)) بەرچاو دەکەوێ، هەروەها لە زمانی تورکیش دا ((müze، موزە))یە.

بەم جۆرە زاراوەی ((مۆزەخانە)) بە هەڵە دروست کراوە. جا لەبەر ئەوەی ((مۆزە)) خۆی ناوی جێگەیە نابێ بخرێتە پاڵ ((خانە)) چونکە ئەویش ناوی جێگەیە، بۆیە پێویستە بە قسە و بە نووسین ((مۆزە)) لە زمانی کوردیدا بو ((المتحف)) بەکاربهێنرێ، چونکە لە زمانانی دیکەی گێتی ووشەکە وەکو خۆی بەکاردێ.

-٥-

**بە کوردی ((فرەنسە یا فرانسا)) ڕاستە، ((فەرەنسە)) هەڵەیە**

فرەنسییەکان ناوی ووڵاتەکەیان بەم جۆرە دەنووسن ((Français)) واتە بزوێنی تیپی (F)ی بێ دەنگ بزوێنی (i) دەنگدارە، ئەوەی لە زمانی کوردیدا هەیە و لە زمانی عەرەبیدا نییە. ئیتر عەرەب ناتوانێ هەر ووشەیێك ئەگەر بزوێنی تیپی یەکەمی دەنگداری (i) بێ لە دەمی بێتە دەرەوە. واتە تیپی یەکەمی هەر ووشەیێك بە سکوون ( ـــْـــ ) دەست پێ بکا بە یەکێ لە سەرو بۆرەکان دەیگۆڕێتەوە ( ـَـ ـُـ ـِـ ). ئەگەر ئەم سەرو بۆرانە بکرێن بە تیپ بەرامبەر بە (ـە، و، ی) دەوەستن.

ئیتر بزوێنی تیپی (F) پێویستە یەکێ لەو سێ بزوێنە یا سەر و ژێر و بۆرانەی خۆیان بێ. لەبەر ئەوە لە ووڵاتانی ژۆرهەڵاتی خاکی عەرەب بزوێنی ووشەی ((ف)) دەکەن بەسەر، لە نووسین و قسەکردن دا بە شێوەی ((فَرَنْسا)) (فەرەنسا) دەریدەبڕن، بەڵام

لە وولاّتانی ڕۆژئاوای خاکی عەرەب، لە باکووری ئەفەریقا بەتایبەتی لە جەزائیر بە شێوەی «فرَنْسا» (فیرەنسا) دەریدەبڕن. بەم جۆرە لەژێر کاریگەری زمانی عەرەبی لە کوردستانی عێراق کورد ووشەکە بە سیغە عەرەبیەکەی لە نووسین و قسەکردن دا بەکاری دێنن. ئەمە هەڵەیێکە پێویستە وازی لێ بهێنرێ و ووشەکە بە شێوەی «فرەنسە» یا «فرەنسا» بنووسرێ.

-٦-

**«ڕووح» و «ڕۆح»**

لە بنجدا ووشەکە «ڕووح»ە، لە هەندێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی بووە بە «ڕۆح». ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەم ووشەیە بەزۆری لە شیعری کلاسیکی بەکارهێنراوە. بێگومان شاعیران بە شێوەی «ڕووح» بیریان لێ کردۆتەوە و بەکاریان هێناوە. ئەوەی تازە کە ئەم شیعرە کلاسیکیانە دەخوێننەوە ئەگەر هەموو «ڕووح»ەکان بکەن بە «ڕۆح» لەوانەیە لە ڕووی کێشی شیعریەوە هیچ تەنگوچەڵەمەیێك دروست نەبێ، بەلاّم لە گەلێ حاڵەت دا هەست بەوە دەکەن خوێندنەوەی ووشەکە بە شێوەی «ڕووح» تۆن و ڕیتمی شیعرەکە ڕەوانتر و سووکتر دەکەوێتە بەر گوێ.

-٧-

**ڕاستیەکەی «ئاڤێستا» یە و «ئاوێستا» نیە**

واوی بێ دەنگ لە زمانی فارسیدا بە تیپی «و» دەنووسرێ، کەچی لە پراکتیك دا «و»ەکە دەبێ بە «ڤ»، بەم جۆرە ووشەکە بە شێوەی «آوستا» دەنووسرێ، بەلاّم بە شێوەی «آڤستا» لەدەم دێتە دەرەوە. لە زمانی کوردیدا لەبەر ئەوەی «و»ی بێ دەنگ هەیە، هەروەها دەنگی «ڤ»ش هەیە و لە تیپە بێ دەنگەکانە، لەبەر ئەوە ڕاستیەکە ئەوەیە بە کوردی «ئاڤێستا» بنووسرێ نەك «ئاوێستا».

-٨-

**لەبەر چی دەنگداری «و u» بووە بە «وو û»؟**

لەو ساڵانەی دوایی‌دا دیاردەیێکی سەیر لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و کۆوارە کوردی‌یەکان دا پەیدا بوو، لە پاشانا پەڕی‌یە سەر لاپەڕەی کتێب و نامیلکەی چاپکراو. گەلێك لەو ووشانەی دەنگداری «و = u »ی کورتیان تێدایە کردوویانە بە دەنگداری «وو = û »ی درێژ. ئەمە گێرەشێوێنی‌یێکە لە ئیملا و ڕاست نووسینی زمانی کوردی‌دا. ئەم هەڵانە گەلێ زۆرن لە نووسینی بلاّوکراوەدا.

لەم ماوەیەدا هەندێ نموونە لەم هەڵانە دەخەینە ڕوو:

| ڕاست | هەڵە |
| --- | --- |
| دوکان dukan | دووکان dûkan |
| نوستن nustin | نووستن nûstin |
| ئەنجومەن encumen | ئەنجوومەن encûmen |
| چونکە çunke | چوونکە çûnke |
| بەڵکو belku | بەڵکوو belkû |
| کوڕ kur | کووڕ kûr |

بە ئاشکرا دیارە ئەم جۆرە ووشانە لە قسەکردن و نووسین دا جیاوازن لەگەڵ ووشەکانی «نووسین nûsin»، «ژوور jûr»، «کووڕ kûr (پشت چەماوە)»، «ئارەزوو arezû» هتد.(۱)

---

۱) سوپاس بۆ د. محەمەد نووری عارف، پێش بلاّوکردنەوە بەسەر ئەم باسەدا چووەوە و هەندێ تێبینی‌ی بەکەڵکی دەربڕی. هەروەها لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە ئەم ووتارە بە ئیملای ڕاست نووسینی زانستی نووسراوە، تێگەیشتنی ناوەرۆکی لە ڕووی دەنگ و فۆنێتیك و فۆنێمەوە ئەوە دەخوازێ.

# ملخص البحث

## الحفاظ على الاشكال القومية من مفردات اللغة الكردية

**د. معروف خزنه‌دار**

يتناول البحث مجموعة من حروف الالفباء الكردي والالفاظ المستعملة من لغة العامة والكتابة من النوع الشائع الذي يلجأ اليه الصحفيون وبعض الكتّاب بصورة خاطئة.

وهناك نداء بألغاء حرف «غ» وإبدالها بالحرف «خ» في كل كلمة وردت فيها، وكذلك كتابة بعض المفردات بصيغة اللغة التي انتقلت منها الى اللغة الكردية، والأصح هو استعمال الصيغة الشائعة في لغة الخطاب اليومي أو المستعملة في الكتابة الكردية.

والبحث بصورة عامة يُفيد الوسط الثقافي الذي يجمع الصحافة والمؤلفين وطلبة جميع مراحل الدراسة واوسع فئات المجتمع الكردي.

**'Abstract'**

**Observance of National mode**
**of Kurdish vocabulary**

**Prof. Marouf Khazndar**

The study deals with a variety of Kurdish Alphabet, expressions used incorrectly by people and through some prevalent writings of journalists and writers.

Some people proclaim to abrogate the letter (غ) and replace it by letter (خ), or try to write some words in their original form, however the authenticity is using the common form spoken daily or used in Kurdish writings.

I hope the study will be benificial for journalists, writers, students and many others.

# چەند وشەیەك

## (لێكدانەوە و شیكردنەوە و بەراورد)

د. محەمەد نوری عارف

**پێشەكی**:

ئەمە كۆمەڵە وشەیەكە وەكو نموونە كردوومن بە كەرەسەی ئەم لێكۆڵینەوەیە و، بەشی هەرە زۆریان پێكهاتوون لە وشەی لێكدراو و داڕێژراو، دوای لێكدانەوەیان شیمكردوونەتەوە و بەشەكانم لە یەكتری جیاكردۆتەوە و بە كورتی یەكە یەكە ڕوونم كردوونەتەوە، چ لەبارەی ڕێزمانییەوە، چ لەبارەی واتاكانیانەوە، هەندێ لەو وشانە ڕەگ و ڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ زمانە هیندۆئەوروپییەكانی پێش ئیسلام و پێش زایین و بگرە جاری وایش هەیە پتر لە سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر، یان بەراوردم كردوون لەگەڵ ئەو زمانانەی، كە لەگەڵ زمانی كوردیدا لەیەك خێزانە زمانن و خزمایەتییان بە یەكەوە هەیە، بە جۆرێ كە هەندێ جار لە واتا و دەنگدا، یەكتری دەگرنەوە و، هەندێ جاریش دەگەنەوە بە زمانە ئەوروپییەكان و ئەوانیش لە كۆمەڵی خێزانی زمانە هیندۆئەوروپییەكانن، هەر یەكێ لەو زمانانە لەكاتی بەروارد كردندا كلیلن بۆ كردنەوەی لایەنی لێڵ و تاریك و نەزانراوی وشەكان. ئێمە ناتوانین تەنیا بەو كوردییەی كە ئەمڕۆ پێی دەنووسین و وتووێژی پێ دەكەین، بەشەكانی ئەو وشانە لێكبدەینەوە و بە وردی بزانین چین و چی نین...، هەندێ جار وا ڕێكدەكەوێت، وشەیەك یان بەشێ لە وشەیەك، هەزاران ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، بێ ئەوەی واتا و دەنگی گۆڕا بێت، جاری وایش هەیە، قۆناغ بە قۆناغ و دوای ڕۆژگارێكی دوور و درێژ، چەندەها گۆڕانی بەسەردا هاتووە، چ لە ڕووی واتا، چ لە ڕووی دەنگەوە، هەموو ئەمانە یارمەتیدەرن بۆ ڕەواندنەوەی تەم و مژ و، دەرخستن و ڕوونكردنەوەی لایەنی لێڵ و نەزانراوی ئەو وشانەی كە لێكۆڵینەوەیان تێدا دەكرێت. زمانە هیندۆئەوروپییەكان، كە زمانی كوردی یەكێكە لەو زمانانە، هەموویان لە یەك سەرچاوەوە هاتوون و بەراورد كردنیان لەگەڵ

یەکتریدا، لەم سەردەمەوە بگرە تـا دەگاتـە هـەزاران سـاڵ لەمەوبـەر، ئـەو خزمایەتییـە دەسەلمێنێت و ئەو وشانەی کە وەکو یەکترن، یان نزیکن لە واتا و دەنگەوە و هاوبەشن و لە هەر زمانێکی ئەو خێزانە زمانەدا کە بەکاربێن، ئەوا هینی ئەو زمانەن. وشەی وایش هەیە بە شێوەیەکی ئاسایی بەکارنایەت لـە یـەکێ لـەو زمانانـەدا و نامۆیـە، یـان نوێیـە، بەڵام لە زمانێکی تری ئەو خێزانە زمانانەدا بە شێوەیەکی ئاسایی بەکاردێت، ئـەوا بـە هینی ئەو زمانە دادەنرێت، بۆ نموونە زۆر وشـە هەیـە کـە لـە هـەر دوو زمـانی کـوردی و فارسیدا وەکو یەکن، چ لـەڕووی واتـا و تاڕادەیـەکی زۆریـش لـەڕووی دەنگـەوە، ئەمانـە وشەی هاوبەشـن و لـە هـەر زمانـەدا هینـی خۆیـەتی، بـۆ ئـەو وشـانەیش کـە ئـەمڕۆ لـە زمانەکەماندا نییە و یان نامۆیە، بەڵام لە زمانی فارسیدا ئاساییە، بـە ڕێنووسـی کـوردی نووسـیومە و ئینجـا لـەناو کەوانـەدا بـە ڕێنووسـی فارسـی نووسـیومە ئینجـا لـەجیاتی (فارسی) تیپی (ف)یم لە تەنیشتییەوە داناوە.

ئەو وشانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەرچاو دەکەون بەشێوەیەکی گشتی ئەمانـەن: ئەو وشانەی کە بەشێوەیەکی ئاسایی بەکاردێن و چەند بەشێکن، بەڵام تـەنیا بـە زمـانی کوردی لێکنادرێنەوە و شیناکرێنەوە، ئەو وشـانەی کـە لـە عەرەبییـەوە هاتوونەتـە نـاو زمانی کوردی و گۆڕانیان بەسەدا هاتووە، هەندێ وشەیش هەن کە ماوەی چەند ساڵێکە لە زمانی فارسییەوە هاتوونەتە ناو زمانی کوردی و هەندێکیان لەڕووی واتـا و دەنگـەوە شـێوێندراون، چـەند وشـەیەکیش بـە شـێوەیەکی نابـەجێ داتاشـراون کـە نـاڕەوان و نەگونجاون.

**ئابلاخ** : شوێنی ئاو، ئەو شوێنەی کە ئاوی زۆری تێدا بێت.

ئەمڕۆ گەڕەکێکە لە سلێمانی.

ئاب: ئاو.

لاخ: پاشگرە و دەچێتە کۆتایی هەندێ ناوەوە، بە مەبەستی شوێن، یان واتای زۆری ئەو ناوە پیشان دەدات کە چۆتە سەری.

**ئارایش** : جوان کردن و ڕازاندنەوە.

ئەم وشە دوو بەشە: ئارای + ش.

ئارای: ڕەگی چاوگی، ئاراستەن (= آراستن)ی. ف. یە، واتە جوان کـردن، ڕازاندنەوە.

ش: پاشگرە، کە دەچێتە کۆتایی ڕەگی چاوگەوە، نـاو دروسـت دەکـات، لەبەر ئەوەی کە لە چاوگەوە وەرگیراوە پێی دەڵێن، ناوی چاوگ.

**ئاسیاو** : ئاشی ئاو، ئاش. ئاسیاو: کورتکراوەی (ئاسی ئاو)ە، هەر دوو تیپـی (س، ش) زۆرجار جێگـای یـەکتری دەگرنـەوە، وشـەی (ئـاش) فـۆرمی نـوێ تـری وشەی (ئاس)ە. بابزانین ڕابوردووی کۆنی ئەم (ئاس)ە، چییە؟

ئـاس: بـەردێکی خـڕ وپانـە، بـە دەسـت، یـان بـە هـۆی هێـزی ئـاوەوە دەسووڕێتەوە و دانەوێڵەی وەکو گەنم و جۆی پێ دەهاڕدرێت.

لە زمانی سانسکریتدا، ئاسـەن ásan، لـە ئەڤێـستادا ئەسـەن، ئەسمـەن asman، assan، بە واتای بەرد هاتووە، و وایان دەزانی سەقفی ئاسمـان وەکـو بـەردێ وایـە، لـە فارسـی کۆنیـشدا (asman)ە و لـە پەهلـەڤی و فارسیشدا (ئاسمان)ە.[1]

**ئاش** : کوردی کەرکووك و ناوچەی گـەرمیان وشـەی (ئـاش) بـەکاردێنن بـە واتـای چێشت و خواردن، ئەمە وشەیەکی زۆر کۆن و ڕەسەنە لە زمـانی کوردیـدا و، ڕەگ و ریشەی لە زمانە هیندۆ ئەوروپییەکاندا ماوەتەوە. بـەڵام لـە فارسـیدا تایبەتە بە شۆربا و جۆرەکانی، بە هەمان واتـا کۆنەکـەی وشـەی (ئـاش) لـە هەردوو وشەی لێکدراوی: ئاشپەز، ئاشپەزخانە (= آشـپز، آشـپزخانە)دا، بـە واتای: چێشتکەر، چێشتخانە هاتووە، ئەمـە وشـە ڕەسـەنەکەمان دێنێتـەوە یاد.

(وشـەی ئـاش، لـە سانـسکریتدا (as)، کـە هاوڕیـشەی (ad)ە، واتـای خواردن و لەگەڵ (edo)ی لاتینـی و زمـانی نەتـەوە هینـدۆ ئەوروپاییـەکانی تـردا، وەکـو (essen)ی ئـەڵمانی و (to eat)ی ئینگلیزیـدا پەیوەنـدی هەیە).[2]

**ئافرەت** : ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا عەرەبییە و هەر لە کۆنەوە چۆتە ناو زمانی کوردی و فارسییەوە، هەر وشەیەك لە زمانێکەوە بچێتە زمانێکی ترەوە، بەپێی هەندێ تایبەتمەندی ئەو زمانە هەندێ گۆڕانی بەسەردا دێت، چ لە ڕووی دەنگ، چ لەڕووی واتاوە، لەوە دەچێ دوای ئەوەی کە ئەم وشەیە چۆتە زمانی فارسییەوە، ئێمە لە فارسییەوە وەرمانگرتبێ، یان ڕاستەوخۆ هەر لە کۆنەوە هاتبێتە ناو زمانەکەمان، بەڵام بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستە، بەڵگەی نووسراوی کۆنی کوردیمان بە دەستەوە نییە، لە زمانی فارسیدا، ڕابووردووی ئەم وشەیە لە تێکست و فەرهەنگەکانیاندا زۆرە و ڕێنووسەکەشیان بەشێوەیەکی گشتی، وەکو ڕێنووسی عەرەبییەو، وشەیەکی زۆری عەرەبیش دوای ئیسلام هاتۆتە ناو زمانەکەیانەوە، بەڵام لە خوێندنەوەدا بەشی هەرە زۆریان جیاوازن لە دەنگدا، بەپێی تایبەتمەندی زمانەکەیان، ئێمە لێرەدا کارمان تەنها بە وشەی مەبەستمانەوە هەیە لە کوردیدا، کە بووە بە (ئافرەت)، وشەکە لە عەرەبیدا (عورة)ە، واتا ئامرازی زاووزێ، یان ئەوەی کە ببێتە هۆی شەرم و شەرمەزاری، بە واتای (ژن) بەکارهاتووە، لە زمانی فارسیدا (عورت) دەنووسرێت، چونکە لە ڕێنووسەکەیاندا (Ö) دەبێت بە (ت)، لەبەر ئەوەی کە لە فارسیدا دەنگی (ع) نییە بە (ء) دەخوێندرێتەوە و، زۆرجاریش (و) بە (ڤ) دەخوێندرێتەوە، خۆ ئەگەر وشەکە بە ڕێنووسی کوردی بنووسین بەو جۆرەی کە فارسەکان دەیخوێننەوە، ئەوا دەنووسین (ئەڤرەت). ئێمە تیپی (ع)مان نییە و هەندێ جار لەژێر کارتێکردنی عەرەبییەوە بەکاریدەهێنین، بۆ نموونە ئێستایش لە هەندێ شوێنی کوردەواریدا بە: عەلی ، عوسمان، مەعرووف ... هتد، دەڵێن: ئەلی، وەسمان = وەتمان، مارف ... هتد، بەم پێیەیش (عورەت)ی عەرەبی دەبێت بە (ئەورەت)، دوای ئەوە دەبێ گۆڕانی بەسەردا هاتبێت و بۆۆبێت بە (ئەفرەت)، دوای ئەوە (ئافرەت). بابێینەوە سەر ڕابوردووی ئەم وشەیە لە زمانی فارسیدا، من زۆرجار ئەم وشەیەم لە تێکستە کۆن و نوێیەکانی

فارسـیدا بەرچـاو کـەوتووە، بـەڵام لێـرەدا دوو نموونـەی پەخـشانی کـۆنی فارسی دەخەینە ڕوو کە وشەی (عورت = ئەڤرەت) بە واتـای (ئـافرەت)یـان بـەکارهێناوە، یـەکێکیان کتێبـی (قابوسـنامە)یـە، کـە لـە کۆتـایی سـاڵانی سـەدەی پێنجـەمی کۆچـی نووسـراوە و ئـەوی تریـان (فرائـد الأدب)ە، بـەم جۆرە:

(( در قابوسنامه از ابن هشام نقل کرده اسـت، کـەیك بـاری در ولایـت یمـن بسبب ورود سیل قبری ظاهرشد، در آنجا (عورت)ی بود، در گـردن وی هفـت گردن بند از درّ .... و لوحی بر بالین او بـودو بـر آن سـطری چـند مـسطور، خلاصەء سطور آنکەمنم ماجد بنت شعیر ...)) [٣]

واتە: لە قابووسنامەدا، لە (ابن هشام)ەوە، دەگێڕنەوە، کە جارێ لـە ولاتـی یەمەن، بەهۆی هاتنی لافاوەوە، گۆڕێ دەرکەوت، لەوێدا (ئافرەت)ێ هەبوو، کە ملوانکەی دوڕی لە ملدا بوو .... و تابلۆیەك لای سـەری و چـەند دێرێکـی لەسەر نووسرابوو، کورتەکەی ئەمەیە: منم ماجد کـچی شـعیر .... هـەروەها لە (فرائد الأدب)دا هاتووە کە .... (عورت)ی ریّانە نام براهی پیش او آمـدە، عرضە داشتی، بدو داد، چون بخواند نوشتە بود، کـە از خـدای تعـالی بـترس یتیمان دارم ... [٤]

واتە: (عورت = ئافرەت)ێ ناوی ڕەییانە بوو، لە ڕێگایەکدا هاتە لای و سکاڵا نامەیەکی پێبوو، و پێیدا، کاتێ کە خوێندییەوە، نووسرابوو: لە خوا بترسە هەتیوبارم ....

**ئامادەباش** : ئەمـە وشـەیەکی لێکـدراوی نوێیـە، لـە زمـانی کوردیـدا، ئـەمڕۆ زۆر بەکاردەهێنرێت لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و لە ئیستگە و تەلەفزیۆنەکانمانـدا، ئێمـە بەرامبـەر بـەم وشـە لێکـدراوە لـە کوردیـدا (ئامـادەبوون)مـان هەیـە، (ئامادەبـاش)یـش فارسـییە و، لـە زمانەکەیانـدا بـە مەبەسـتی ئامـادەبوون بەرامبــەر بــە کــارێکی ترســناك، وەك ئامــادەبوون بەرامبــەر بــە ڕووداوی کارەسات، وەك بوومەلەرزە، یان دەردێکی ترسناك، یان هێرشی دوژمن ....

هتـد، وشـەكە دوو بەشـە بەشـی یەكـەمیان ناسـراوە و، بەشـی دووەمیـان (باش)ە، كە ڕەگی چاوگی بودەن (= بودن)ی. ف.یە. واتە: بوون.

**ئامشۆ** : واتە هاتوچۆ كردن و سەر لەم و لـەو دان، چـوون بـۆ لای ئـەم و ئـەو. لـە زمانی فارسیدا بەرامبەر بەمە (آمد و شـد) هەیـە. كـە بـە ڕێنووسـی كـوردی وادەنووسرێت: (ئامەد و شود) بە هەمان واتای ئامشۆی كوردی دێت كە دوو بەشە: ئام + شۆ.

ئـام : گـۆڕدراوی، ئامـەد (= آمـد)ە، كـە چـاوگی كرتـاوی ئامـەدەن (= آمدن)ی. ف.یە، واتە هاتن.

شۆ : گۆڕدراوی، شود (= شد)ە، كە چاوگی كرتاوی شودەن (= شدن)ی. ف.یە، لێرەدا بە واتای چوون بەكاردێت. لە كوردیدا زۆرجار تیپی (د) كە لە كۆتایی وشەوە بێت دەكەوێت و بەكارناهێنرێت.

**ئامۆزا** ، **ئامۆژن** :

ئامۆ : لە هەردوو وشـەی ئـامۆزا و ئامۆژنـدا، گـۆڕدراوی وشـەی (عمـو)ی عەرەبییـە، هـەروەها بەهـەمان واتـا لـە وشـەی مامۆژنـدا، وشـەی (مـامۆ) بەكاردێت.

**ئایندە** : واتە داهاتوو، پاشەڕۆژ، ئەو كاتەی كە دێت.

وشەكە دوو بەشە: ئای + ندە.

ئای: ڕەگی چاوگی ئامەدەن (= آمدن)ی. ف. یە، واتە گەیشتن، هاتن.

ندە: پاشگرە، كـاتێ كـە دەچێتە سـەر ڕەگـی چـاوگ، ئاوەڵكـاری بكـەر دروست دەكات.

**ئیفتادە** : بە واتای پەك كەوتە، پەك كەوتوو، داهێزراو دێـت بـە زۆری لـە ئـەنجامی پیریدا، وەكو دەڵێن: پـیری ئیفتـادە. بـابزانین ئـەم ئیفتادەیـە لـە چـییەوە هـاتووە؟ وشـەی ئیفتـادە، لـە (ئوفتـادە)وە هـاتووە، ئوفتـادەیش واتـە كەوتوو، بە ڕێنووسی فارسی (افتادە) دەنووسرێت، وشەكە دوو بەشە:

ئوفتاد + ە

ئوفتاد: چاوگی کرتاوی ئوفتادەن (= افتادن)ی. ف.یە، واتە کەوتن.

ە: پاشگرە، کاتێ کە دێتە کۆتایی چاوگی کرتاوەوە ئاوەڵکاری بەرکار دروست دەکات.

**بست** : ماوەی نێوان سەری پەنجە گەورە و پەنجە تووتەی دەستە لەکاتی کردنەوەدا، ئەمە ئەندازەیەکە هەر لە کۆنەوە، بۆ پیچوانەی ماوە بەکارهاتووە.

وشەی بست، سوواوی وشەی (بەدەست)ە، ئەم وشەیە لە تێکستە کۆنە فارسیەکاندا هەندێ جار بەرچاو دەکەوێت و بەم جۆرە نووسراوە: (بدست)، بلام ئێستا لە فارسییدا بەکارنایەت و لەجیاتی ئەمە، ڤەجەب (=وجب) بەکاردێت، کە ئەمڕۆ لە کوردیدا (بست)ە، لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە، کە لە سالانی (٤٥٧ك ـ ٤٦٢ك)دا نووسراوە بەم جۆرە: (اندر همە مملکت بگردیدندیك ((بدست)) زمین جز آبادان نیافتند کە بوی دهند...)(٥)

واتە: بەناو هەموو مەملەکەتدا گەڕان، بێجگە لە ئاوادانییەك (بە دست = بست) زەوییان نەدۆزییەوە کە پێی بدەن).

**بووم** : ئەمە وشەیەکی زۆر کۆنە و ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەو پێش و ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا بەشێوەیەکی ئاسایی لە هەردوو وشەی لێکدراوی (بوومەلەرزە) و (بەروبووم)دا، بەکاردێت، بە واتای زەوی، خاك، زەمین، نیشتمان، کە لە زمانی ئەڤێستادا بوومی (bûme)ە و، (هەندێ لە زاناکانی زمان ئەڤێستا بە دایکی زمانی کوردی دادەنێن)، هەروەها لە زمانی سانسکریتدا بهوومی (bhûmi)یە و، لە زمانی پارسی کۆندا، بوم (bum)ە و لە زمانی پەهلەڤیدا بووم (bûm)ە.(٦) وشەی بووم لە شێوەی هەورامیدا بەکاردێت بە واتای زەوی ڕەق کە بە کەڵکی کێڵان نەیەت. لە فەرهەنگی خاڵدا بە واتای خاك و زەوی و زار هاتووە و لە

فەرهەنگی مەردۆخدا بە واتای نیشتمان، خاك، زەمین بەكاردێت، ئەم وشەیە لای شاعیرەكانمان هەر لە كۆنەوە بەكارهاتووە، بابا تاهیر دەڵێ:

بە دل چون یادم ئەز (بووم و بەر) ئایو

سریشكەم بیخود ئەز چەشمی تەڕ ئایو[٧]

واتە: كاتێ كە یادی خاك و نیشتمان دەكەمەوە، ئیتر هەروا لە خۆمەوە فرمێسك بە چاوەكانمدا دێتە خوارەوە.

دیسان بابا دەڵێ:

موئان میحنەت كەشی حەسرەت نەسیبەم

كە دەر هەر مولك و هەر (بووم)ی غەریبەم.[٨]

واتە: من ئەو غەمبارەم كە بەشم هەر خەفەت و مەینەتە و لە هەموو شوێن و سەر زەمینێكدا هەر غەریبم.

خانای قوبادیش لەم دێڕە شیعرەی خوارەوەدا وشەی (بووم)ی بە واتای تەخت و زەمینەی پارچەی چنراو بەكارهێناوە و دەڵێ:

دەستماڵێ زەڕ بەفت تافتەی ئەرمەنی

گوڵ قرمز (بووم) زەرد سەرگوڵ سۆسەنی[٩]

واتە: دەستماڵێك بە تاڵی ئاڵتوون چنراو، كە پارچەكەی تافتەی ئەرمەنی بوو، گوڵەكانی سوور بوو، و تەختەكەی یان زەمینەكەی زەرد بووە و جۆری سەرگوڵەكەیشی سۆسەنی بووە.

ئەمڕۆ كە دەوترێت (بوومەلەرزە) واتە زەمین لەرزە و وشەیەكی زۆربلاوە و، وشەی (بووم) لەم وشە لێكدراوەدا، بە واتای زەوی و خاك بەكاردێت، دیسان لە وشەی لێكدراوی (بەروبووم)دا، وشەی (بووم) بەهەمان واتای: زەوی، زەمین، خاك، بەكاردێت، بەڵام ئەو (و)ەی كە دەكەوێتە نێوان هەردوو وشەی (بەر - بووم)، واوی خستنەسەرە، ئەمە ئەمڕۆ لە كرمانجی

خواروودا دەگمەنە، ئەوەی کە من ئاگام لێبێت لە وشەی (قەتڵ و عام)یشدا بەکاردێت، کە ئێستا (ی) خستنەسەرە، کە دەڵێن: بەروبووم، قەتڵ و عام، واتە بەری بووم، قەتڵی عام.

**بەرواری** : ئەمڕۆ بە واتای، ڕێکەوت، ڕۆژ (= تاریخ)ی عەرەبی، بۆ دیاری کردنی ڕۆژ و مانگ و ساڵ بەکاردێت، بەلاَم تا ئەو سنوورەی کە من بیستوومە و ئاگام لێیە، سەرەتای بەکارهێنانی ئەم (بەرواری)یە، دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵانی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان، ئەوەی کە لەو سەردەمەدا بیستبێتم ئەمەیە: گوایا یەکێ لە دەڤەری (بەرواری)یەوە نامەیەکی بۆ ڕادیۆی بەشی کوردی ـ بەغدا نووسیبوو، و داوای گۆرانییەکی کردبوو، لە کۆتایی نامەکەیدا نووسیبووی: بەرواری و لەژێریدا ڕێکەوت یان ڕۆژی نووسینی نامەکەی نووسیبوو، ئیتر ئەوانیش ئەم وشەیان قۆزتەوە و بە دەستکەوتێکیان دانابوو، وایان دەزانی کە ئەمە وشەیەکی کوردی ڕەسەنە بە واتای: ڕێکەوت، رۆژ (= تاریخ)ی عەرەبی، بەلاَم لە ڕاستیدا بەرواری ناوی ناوچەیەکە و، دوو (بەرواری)یش هەیە، بەرواری ژوورو، بەرواری ژێروو، بەرواری ژوورو دەکەوێتە باکووری قەزای ئامێدی، لەنێوان شاری ئامێدی تا سنووری تورکیا، و بەرواری ژێروویش دەکەوێتە باشووری قەزای ئامێدی، هەروەها وشەی (بەرواری)ش بە واتای ئەو شوێنە دێت کە پڕ بێت لە ئاو و کێڵگە و باغ و بوستان.

**بێگانە** : ئەمە وشەیەکی کۆنی کوردییە و ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام و بە درێژی ئەو ماوەیە تائێستا بەکاردێت، بەلاَم بەشێوەیەکی گشتی ئەمڕۆ بۆ نووسین و وتووێژ بەکاری ناهێنن و دووره پەرێزی لێدەکەن، ئەویش لەبەر بەشی دووەمی وشەکەیە و هەندێ لە ڕۆشنبیرەکانمان لەڕووی نەشارەزایی، لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی بەشەکانی وشە و ڕابوردووی دوور و بەراورد کردنییەوە، تەنها بە واتای ئەمڕۆی زمانەکەمان لێکیانداوەتەوە و لایان نەنگ و شەرمە کە بەشی دووەمی وشەکە، کە

(گانـه)یـه بـەکاربهێنن، ئـەم جـۆره وشـانه بەشـێوەیەکی گشتی لـه هـەموو زمانـەکانی جیهانـدا هەیـه و کەسـیش بـیر لـەوه ناکاتـەوه وەکـو لای ئێمـه فەتوای بەکارنەهێنانی بدات، بەتایبـەتی زمانەوانـەکان و شـارەزایانی زمـان. وشەی (گانه) له وشەی ناوبراودا واتای تایبەتی خۆی هەیـه و ئـەو نییـه کـه هەندێ کەس بەو جۆره لێیی تێگەیشتوون، یان بەو جۆره تێیان گەیاندوون.

گانه: واته، لا، تا.

دووگانه: واته، دوولا، دووتا، جووت.

بێگانه: واته، کەسێك کە لایەك، کەسێك، یان هیچ شتێکی نەبێ لە شوێنێك و خەڵکی ئەوی نەبێت، یان نەناسراو بێت لەوێ، واته غەریبه.

هەروەها (گانـه) پاشگریـشه بـۆ مەبەسـتی ژمـاره بـەکاردێت، کـه دەڵـێن: دووگانه، یان سێگانه، واته: دوانی و سیانی.

وشەی بێگانه لە ئەدەبی کۆنیشماندا ڕابوردوویەکی دوور و درێـژی هەیـه و زۆر بـــەکارهاتووه و وشـــەیەکی هاوبەشـــه لـــەنێوان زمانـــه هینـــد و ئەوروپییەکاندا، وەکو هەزاران وشەی تر.

وشەی تریشمان هەیه کە ئەویـشیان دەسـتکاری کـردووه بـۆ نموونـه وشـەی (یاریکەر)یان کردووه بە (یاریزان) کە لە شوێنی خۆیدا باسی لێوەکراوه.

**بینەقاقا** : ئەم وشەیە باو و زانراوه. سێ بەشە:

بین + ه + قاقا

بین : لەوەدەچێ کە (بن) یان (بەین) بێت.

ه : ناوگره.

قاقا : له (قهقهه)ی عەرەبییەوه هـاتووه و چـۆته زمـانی فارسیـشەوه بـه هەمان شێوەی خۆی و هەروەها بەشێوەی (قاەقاە)یش بەکاردێت، بەڵام لـه کوردیدا سوواوتر و نەرمتره و بـووه بـه (قاقـا). وەکـو دەڵـێن: دایـه قاقـای پێکەنین. ئێمه له زمانەکەماندا دەنگی (ق)مان نەبووه. بەڵام ئێـستا هەیـه و بەزۆری له عەرەبی و تورکییەوه هاتووه، بۆ نموونه: قەڵەم، قـەت، قوربـان،

هەڵقە، ... هتد، لە عەرەبییەوە هەروەها لە تورکیشەوە: قاڵدرمە، قەزاتمە، قابلەمە، قاچاخ، ... هتد. یان وشەکە لە بنەڕەتدا هەر کوردییە و لەژێر کارتێکردنی عەرەبی و تورکییەوە ئەو تیپی (ق)ە هاتۆتە ناو زمانەکەمانەوە، وەکو: ڕق، قین، قەڵەو، قرتاو، تاق و تەنیا، ... هتد، کە لەبنەڕەتدا بەم جۆرەن: رك، کین، کەڵە، کرتاو، تاکوتەنیا، .. هتد.

**پاپووج** : ئەم وشەیە دوو بەشە: پا + پووج

پا : واتە پێ، بە زۆری لە زمانی فارسیدا بەکاردێت و هەندێ جاریش لە کوردیدا بەکاردێت.

پووج : گۆڕ دراوی وشەی (پووش) یان (پۆش)ە کە، پووش ڕەگی چاوگی پووشیدەن (= پوشیدن)ی. ف. یە و (پۆش) ڕەگی چاوگی (پۆشین)ی کوردییە.

پاپووج = پاپووش = پاپۆش: واتە ئەوەی کە پێ دەپۆشێت یان لەپێ دەکرێت.

**پۆشتە و پەرداخ** : بە یەکێ دەوترێ کە جل و بەرگی تەواو ڕێك وپێك و ڕازاوەی لەبەردابێت.

پۆشتە : واتە ئەوەی کە جل و بەرگی باشی لەبەردابێت و ئەم وشەیە لە چاوگی (پۆشین)ەوە وەرگیراوە.

پەرداخ : سوواوی وشەی پەرداخت (= پرداخت)ی. ف. یە. واتە ڕازاندنەوە و ئارایش کردن و جوان کردن.

لێرەدا بۆ نموونە دێڕە شیعرێ پیشان دەدەین کە وشەی (پەرداخ)ی بە واتای مەبەستمان بەکارهێناوە:

دارێ شەنگ و شۆخ شاخ و بەرگ پەرداخ

لەق و پۆ ئاوێز ناوکانی سەر زاخ(١٠)

پەرداخ : جوان ڕازاوە و ڕێك و پێك.

ئاوێز : شۆڕ بووەوە.

زاخ : تیشی بەرد.

بەلآم وشـەی پەرداختـەن (= پـرداختن) کـە چـاوگی وشـەی نـاوبراوە، گـەلێ واتای تریشی هەیە، کە هەنـدێکیان دەسـازێن لەگـەڵ وشـەی مەبەسـتماندا، وەکـو: پـارەدان بـە کەسـێ بەشـێوەی دراو، یـان نووسـراوی تـری نرخـدار، دانــەوەی قــەرز و شــتی تــری لــەو بابەتــە، دروســتکردن و ڕێکــردن و هێنانەکایەوە، ژەنگ لابردن لە فلزات، ساف کردن و بریقە لێهەڵسان، بـەتاڵ کردن، لێکدانەوە، لێدانی ئامرازی موسیقا و ئاواز خوێندن.

**پەڕتووک، پەڕتووکخانە**:

ئەم دوو وشەیە ئەمڕۆ تا ڕادەیەك بەکاردێت، بـەلآم بەشـی زۆری کـوردی زانان تائێستا دانیان بەمـەدا نـەناوە و بـەکاری نـاهێنن، وشـەی (پـەڕتووك) گۆڕدراوە و تێکـچووی وشـەی (فـەرتووت)ە کـە لـە شـیعری کـۆنی کوردیـدا زۆرجار بەرچاو دەکرێت بە واتای: پیر و بەساڵاچوو، بێهێـز و ناتوانـا و پـەك کەوتە، شڕ و پڕ و ڕزیوو پوواو، لە کۆندا خوێندن لـە مزگەوتەکانـدا بـووە و، کتێبیش بەزۆری دەستنووس یان چـاپی بـەردی (حجـری) و یـان چـاپی زۆر کـۆن بـە شـێوەیەکی گـشتیش کـۆن بـوون و هەندێکیـشیان لـە کۆنیـدا پەڕەکانیان پووا و ڕزیو بووە، کـە واتـای وشـەی(فـەرفووت) هـەمان ڕزیـو و پــوواویش دەگرێتــەوە، دوای تێپــەربوونی ڕۆژگــار و زەمانــە، بــووە بــە (پەڕپووت)، کە ئەمڕۆ زۆرباوە بە واتا کۆنەکەی وەکو باسکرا، ئینجا گۆڕانی تری بەسەرداهاتووە و بووە بـە پـەڕتووك و پەڕتووکخانەیـشی لێداتاشـراوە، بەلآم لێکدانەوەی بـەگوێرەی زمـانی کـوردی ئـەمڕۆ، و شـیکردنەوەیان بـەم جۆرەیە:

پەڕ + تووك ، پەڕ + تووك + خانە

دیارە و ئاشکرایە هەموو کوردی زانێکی ئاسایی دەزانێ (پەڕ، تووك، خانـە) واتایان چییە، لە ڕاستیدا بەکارهێنانیان بـەو جـۆرە لەگـەڵ سـەلیقەی کـوردی زان یان زمانەوانێکدا ناگونجێ، هەر دوو وشەی (پەڕ + تووك)، کەی لە بارەکە بە واتای (کتێب) بەکاربێت؟ یان وشەی (پەڕ + تـووك + خانـە) چ سـەلیقەیەك

ئەم وشە لێکدراوە بە گونجاو دەزانی بە واتای (کتێبخانە)، ماوەی ساڵەها لەمەوبەر تا ڕادەیەك (نامەخانە)یان بەکاردەهێنا لەجیاتی (کتێبخانە) ئەمەیان بەجێ بوو، چونکە وشەی (نامە) یان (نامەك) بە واتای (کتێب) بەکارهاتووە لەپێش ئیسلام و لەدوای ئیسلامیشدا.

لەڕاستیدا ئەگەر وشەی (پەڕتووکخانە) بەکاربهێنرێت بەواتای (دووکانی هەللاجی) گونجاوترە لەوەی کە بۆ (کتێبخانە) بەکاربێت، چونکە (پەڕ ، تووك) کەرەسەی سەرەکین بۆ ئەم پیشەیە.

**پەشمەك** : جۆرە شیرینییەکە، لەشێوەی کۆمەڵە خوری یان کۆمەڵە لۆکە و دەکرێت بەسەر دارەوە، یان بە کۆمەڵ کۆمەڵ دەفرۆشرێت و بەزۆری منداڵ دەیخوات و ئەم وشەیە دوو بەشە: پەشم + ك

پەشم : واتە خوری، بە زۆری لە فارسیدا بەکاردێت.

ك : پاشگرە و بۆ لێکچوون بەکاردێت.

**پەمەیی** = **پەمبەیی** : ناوی جۆرە ڕەنگێکە و زانراوە، وشەی (پەمە، پەمبە، پەنبە) واتە پەموو، لۆکە. بابزانین وشەی (پەمە) یان (پەنبە) چۆن لەگەڵ پاشگری (یی)دا واتایەکی تری دروست کردووە و ئەمڕۆ جۆرە ڕەنگێکە لە زمانی کوردیدا. جاران لە کوردەواریدا ژنان شت ومەکی تایبەتیان هەبوو بۆ ئارایش و خۆ جوان کردن، یەکێ لەوانە جۆرە دەرمانێك بوو، ڕەنگێکی مەیلەو سوور یان سوورێکی کاڵی هەبوو، تۆپەڵێ لۆکەی تێدابوو، ئەو لۆکەیە ڕەنگی دەرمانەکەی گرتبووە خۆی، لەکاتی بەکارهێنان هەڵیان دەسوی لە دەمووچاویان، ئیتر وا ڕێك کەوتووە کە بۆ ئەم مەبەستە وشەی (پەمە، پەمبە) بەکاربێت لەگەڵ پاشگری (یی)دا، لە ڕاستیدا کە وترا پەمەیی، یان پەمبەیی، دەبێ بۆ ڕەنگی سپی یان ڕەنگی وەکو لۆکە بەکاربێت، وەکو چۆن دەڵێن: شیری، واتە سپی، وەکو ڕەنگی شیر، یان قاوەیی، واتە وەکو ڕەنگی قاوە، زەیتوونی واتە وەکو ڕەنگی زەیتوون.

بـەڵام ئـیتر وا ڕێـك کـەوتووە کـە پەمـەیی، یـان پەمبـەیی بـۆ ئـەو ڕەنگـە بەکاربێت کە ئەمڕۆ باو و زانراوە.

**پێشنیار** : ئەمڕۆ بەشێوەیەکی گشتی بەم جۆرە بەکاردێت و لەڕاستیدا هەڵەیـە و، وشەکە لە کۆندا (پێـشنیاز) بـووە و ئەمـەیان ڕاسـتەو، ماوەیـەکی زۆرە کـە خاڵی (ز)یەکە، کەوتووە و بووە بە (ر) وشەکە لە بنەڕەتدا دوو بەشە:

پێش + نیاز

پێش : ئاوەڵکاری شوێنە.

نیاز : واتا ئارەزوو، مەبەست، هیوا.

بەڵام ئەمڕۆ لەجیاتی نیاز وشەی (نیار) بەکاردێت کە هیچ واتایـەکی نییـە و بە هەڵە بەکاردێت.

**پێشکەش، پێشکێش**:

وشەی پێشکەش دوو بەشە: پێش + کەش.

پێش : ئاوەڵکاری شوێنە.

کەش : ڕەگی چاوگی کەشـیدەن (= کـشیدن)ی. ف. یـە، واتـە کێـشان و ڕاکێشان.

هەروەها پێشکێش دوو بەشە: پێش + کێش.

بەشـی یەکـەم بـاس کـراو، بەشـی دووەم کـە (کـێش)ە، ڕەگـی چـاوگێکی کوردییە کە (کێشان)ە.

**پینەدۆز** : واتای ئەم وشەیە زانراوە و باوە لە کوردەواریدا و دوو بەشە:

پینە + دۆز.

بەشی یەکەم کە پینەیە دیـار و ناسـراوە، بـەڵام بەشـی دووەمـی (دۆز)ە، یان (دووز) کە ڕەگی چاوگی دووختەن (= دوختن)ی. ف.یـە. واتـە دووریـن، پینەدۆز. واتە پینەدوور، ئەوەی کە پینە دەدوورێت.

**تاریکە سەلات** : بە شەوێکی تاریك و نووتك دەوترێت، کە چاو چاو نـەبینێت، ئـەم وشەیە بە جۆرێکی سەیر واتاکەی لە کوردیـدا گـۆڕاوە و لـە بنەڕەتـدا (تـارك

الصلوة)ەکە بە تارك الصلاة، دەخوێندرێتەوە، واتە، ئەو کەسەی کە نوێژی تەرك کردبێت و وازی لە نوێژ کردن هێنابێت.

**توپین** : چاوگە لە زمانی کوردیدا، بۆ مردنی گیان لەبەران بەکاردێت، بەتایبەتی ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و ... هتد ئەگەر بۆ ئادەمیزاد بەکاربێت تەنها بۆ سووکایەتییە، ئەم وشەیە دوو بەشە: تۆپی + ن.

تۆپی : گۆڕدراوی وشەی (توفی)ەی عەرەبییە و لە کوردیدا تیپی (ف)کەی بوو بە (پ) و هەندێ گۆڕانی تری دەنگی بەسەردا هاتووە، ئاساییە هەندێ جار لە زمانی کوردی و زمانە هیندۆئەوروپییەکاندا تیپی (ف) دەبێ بە (پ). بۆ نموونە (وصف)ی عەرەبی بووە بە (وەسپ) لە کوردیدا و وشەی (فتیلە)ی عەرەبی کە لە بنەڕەتدا ئارامییە و چۆتە زمانی عەرەبییەوە، بەڵام لە زمانی کوردیدا بووە بە (پڵێتە)، دوای ئەوەی هەندێ لە پیتەکانیشی پاش و پێش کەوتووە، و (پیل)ی هیندی لە کوردی و زمانەکانی دراوسێماندا بووە بە (فیل) و .... هتد.

ن : نوونی کۆتایی چاوگە لە زمانی کوردیدا.

**تەڕەتیزە** : جۆرە سەوزەیەکە و تەڕەتوولەیشی پێ دەڵێن ئەم وشەیە دوو بەشە: تەڕە + تیزە.

تەڕە : واتە سەوزە، کە ئەمیش وشەیەکی داڕێژراوە و دووبەشە: تەڕ + ە. کە هەر دوو بەشەکە زانراوە.

تیزە : واتە تیژە، کە ئەمیش داڕێژراوە و دوو بەشە و زانراوە.

وشەی (تیز) گەلێ واتای هەیە، بەڵام لێرەدا بۆ تامی توند و تیژ بەکاردێت.

**تێزاب** : زاراوەیەکی کیمیاوییە، و واتە ئەسیدی نیتریك، ئەم وشەیە دوو بەشە: تێز + اب.

تێز : گۆڕدراوی وشەی (تیز)ە و، لە وشەی (تەڕەتیزە)دا باسکرا.

اب : ئاب، ئاو.

**چاپەز، چاپەست** :

چاپەز : چادان، چایدان، قۆری، چایچی.

((فرهنگ کوردستان ـ گیو موکریانی))

چاپەز : شتێکی دەسك و لوولەدارە لە مس یا لە فافۆن، چای تیا لێ ئەنرێ، چایچی. ((فەرهەنگی خاڵ))

چاپەز : کەسێ کە چا لێدەنێ، قۆری، چایچی، سەماوەر.

((هەنبانە بۆرینە))

بەشی دووەمی چاپەز، چاپەست (پەز، پەست) و (پەست)یش گۆڕدراوی (پەز)ە و بابزانین لە چییەوە هاتووە.

پەز : ڕەگی چاوگی پوختەن (=پختن)ی. ف.یە واتە کوڵان.

**چەقەنە** : ئەمە وشەیەکی زۆر باو و کۆنە لە زمانی کوردیدا و زانراوە و هەروەها ئامرازێکیش هەیە لە کوردەواریدا پێی دەڵێن (چەقەنەی ئاش)، ئەمە لە ئاشی ئاودا بەکاردێت و دارێکە بە شێوەی ستوونی کەمێ بە خواری لەسەر بەردی ئاشەکە جێگیر کراوە، کاتێ کە ئاشەکە ئیش دەکات و بەرداشەکە دەسوورێتەوە، ئەم دارە یەك لەدوای یەك لەسەری بەرداشەکە دەدات و تەقەی لێوەدێت. بەڵام ڕابوردووی ئەم وشەیە زۆر کۆنە و لەبنەڕەتدا ناوی جۆرە ئامرازێکی موسیقای ئێرانییە و پێی دەڵێن (چەغەنە) یان (چەغانە)، وەکو کەوچك وایە و چەند زەنگۆڵەیەکی پێوە شۆڕبۆتەوە و پێیشی دەڵێن (قاشوق). واتە کەوچك و لەگەڵ ئامرازەکانی تری موسیقای وەکو چەنگ و زەرب و تاردا لێدەدرێت، هەروەها ناوی پەردەیەکی موسیقا و ناوی ئاوازێکیشە.[11] ئەمە ئەوەم دێنێتەوە یاد، جارێکیان گۆرانی بێژی ناسراو خوالێخۆش بوو حەسەن جەزراوی، لەکاتێکدا کە گۆرانی دەوت دوو کەوچکی بە دەستێکییەوە گرتبوو، دەیکێشا بە دەستەکەی تریدا و، دەنگی تەقەی کەوچکەکانی لەگەڵ دەنگی ئامرازی مۆسیقاکانی تردا سازدەکرد.

هەروەها دکتۆر هەرەوی بەم جۆرە باسی (چەغانە) دەکات و دەڵێ:
جۆرە سازێکە لە خێزانی ئامرازی زەربیی (ئالاتی ئیقاعی)، کە جۆرە سەرەتاییەکەی پێکهاتبوو لە کوولەکەیەکی بچووکی وشك، کەوردە بەردیان دەخستە ناوی و دەسکێکی تایبەتیشی هەبوو، لەکاتی هەڵپەڕکی و سەمادا، لەگەڵ دەنگی ترپەی هەڵپەڕکێکەدا ڕایان دەوەشاند.[١٢]

لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە:

حافزی شیرازی دەڵێ:

به وقت سرخوشی ازآه و ناله ٔ عاشق

به صوت نغمه ٔ چنگ و چغانه یاد آرید [١٣]

واتە: لەکاتی شادی و سەرخۆشیدا، لەسەر ئاوازی چەنگ و چەغانە، ئاه و ناڵەی دڵداران بهێنەرەوە یادت.

دیسان حافز دەڵێ:

سحرگاهان که مخمور شبانه گرفتم باده با چنگ و چغانه[١٤]

واتە: دەمەو بەیانیان، لەکاتێکدا کە بەهۆی شەرابی شەوی ڕابوردووەوە هێشتا هەر مەست بووم، لەگەڵ ئاوازی چەنگ و چەغانەدا بادەم دەنۆشی.

**خاکەناز** : وشەیەکی لێکدراوی باو و زانراوە لە زمانی کوردیدا، لێرەدا ئەو بەشەی کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە (ناز)ە، ئەمیش کورتکراوەی (ئەنداز)ە و ئەندازیش ڕەگی چاوگی ئەنداختەن (= انداختن)ی. ف.یە، واتە هەڵدان، توورِدان، فڕێدان، تێگرتن، ... هتد.

**خوارزا** : واتە خوشکەزا، ئەم وشەیە دوو بەشە: خوار + زا

خوار : سوواوی وشەی خواهەر (= خواهر)ی. ف. یە، واتە خوشك.

زا : ڕەگی چاوگی زادەن، زاییدەن (= زادن، زاییدن)ی. ف. یە، واتە: زایین، لە دایك بوون.

ئەم ڕەگە لەکۆتایی زۆر وشەی کوردییەوە هاتووە، وەکو:

خوشکەزا، ئامۆزا، خالۆزا، برازا، پوورزا، .... هتد.

**خەواڵوو** : ئەو کەسەی کە خەو بیباتەوە و خەوی بێت، یان وەنەوز بیباتەوە.

وشەکە دوو بەشە: خەو + اڵوو.

اڵوو = ئالۆو، کورتکراوەی (ئالوودە)یە، واتە تێکەڵاو، گیرۆدە، کە دەڵێن: خەواڵوو، واتە تێکەڵاو بوون و گیرۆدە بوون بە خەو، ئەو کەسەی کە خەو خەریکە بەسەریدا زاڵ بێت، ئەو ماوە کەمەی پێش نوستن، ئێمە دەتوانین وشەی لێکدراوی ناوبراو بەراورد بکەین لەگەڵ وشەی (خواب آلود)ی فارسیدا، کە هەمان واتا دەبەخشێت. وشەکە لە فارسیدا دوو بەشە: خواب + آلود.

خواب : واتە خەو.

آلود : ڕەگی چاوگی ئالوودەن (=آلودن)ی. ف. یە، واتە تێکەڵ بوون، شتێ تێکەڵی شتێکی تر ببێت و کاری تێبکات.

**دار** : لە هەر دوو زمانی کوردی و فارسیدا، لە کۆتایی وشەوە بەکاردێت، بە مەبەستی خاوەن، بۆ نموونە:

خەزنەدار، ئاودار، ماڵدار، شاخدار، دەسکدار، کلکدار، .... هتد.

دار: ڕەگی چاوگی داشتەن (= داشتن)ی. ف. یە، واتە هەبوون ، خاوەن.

**داشت** : لە وشەی لێکدراوی (یاداشت) و (نیوداشت)دا.

داشت : چاوگی کرتاوی داشتەن (= داشتن)ی. ف. یە، واتە: هەبوون، خاوەنی شتێ بوون، خاوەن بوون، وشەی (یاداشت) دوو بەشە:

یا + داشت.

یا : کورتکراوە یان سوواوی (یاد)ە، واتە: بیر، هۆش. ئەم وشەیە هاوبەشە لەنێوان کوردی و فارسیدا. لە فارسیدا دەوترێت (یاد داشت)، واتە ئەو بەسەرهاتانەی کە لە بیر و هۆشی کەسێکدا ماوەتەوە و کۆبۆتەوە و دوای تێپەڕبوونی ڕۆژگارێکی درێژ، لە سەرەتاوە تاکۆتایی دەیاننوسێتەوە.

نیوداشت: واته کۆن و بەکاهێنراو، بەگویرەی واتای وشە لێکدراوەکە، هەر شتێ کە ماوەی ئەوەندە بەکارهاتبێ کە بتوانرێت ئەوەندەی تر بەکاربهێچنرێت، کەواتە (نیوداشت) واتە: نیوەماوە، ئەو شتەی نیوەی ماوەکەی ماوەتەوە بۆ بەکارهێنان.

**دژوار** = **دشوار** : واتە سەخت، گیر و نالەبار.

بەشی یەکەمی هەردوو وشەکە (دژ، دش)ە، کە هەردوو بەمەبەستێ بەکاردێن و یەك سەرچاوەیان هەیە. لە پەهلەویدا (دوش)ە، واتە: بەد، ناشرین. (معین)

بەشی دووەمی وشەکە (وار)ە، کە پاشگرە و بە مەبەستی وەسف، یان خاوەن بەکاردێت.

**دڵسۆز** : وشەیەکی باوە لە زمانی کوردیدا، بەرامبەرەکەی لە فارسیدا، دلسووز (=دلسوز)ە، لە کوردیدا:

دڵ + سۆز.

دڵ : وشەیەکی کوردییە.

سۆز : گۆڕدراوی (سووز)ە کە ڕەگی چاوگیسووختەن (= سوختن)ی.

ف. یە. واتە سووتان، سووتن لە فارسیدا:

دل + سووز.

دل : واتە دڵ، هەروەها کوردیشە.

سووز : (= سوز) باسکرا.

**درامەت** = **درامەد** : واتە دەسکەوت، سەرەتا.

دەرامەد : کورتکراوەی دەرئامەد (= درآمد)ە کە چاوگی کرتاوی دەرئامەدەن (= درآمدن)ی. ف. یە. واتە: هاتنە ناو، چوونەناو، گەیشتن، دەرکەوتن، ڕووان و سەوز بوون.

وشەی (دەرئامەد)یش دوو بەشە: دەر + ئامەد.

دەر : پێشگرە.

ئامەد : چاوگی کرتاوی ئامەدەن (=آمدن)ی. ف. یە. واتە هاتن، گەیشتن، گەڕانەوە.

هەروەها وشەی دەرامەد لە فارسیدا، واتە دەسکەوت، ئەو بڕە پارەیەی کە لە ئەنجامی کار و کاسبیدا دەست بکەوێت.

**دەرئەنجام** : ئەمڕۆ بە هەڵە لەجیاتی (ئەنجام) بەکاردێت، ئەم وشەیە هاوبەشە لەنێوان کوردی و فارسیدا، ئێستا کردوویانە بە دوو بەش: دەر + ئەنجام.

دەر : واتە لە، وەکو چۆن لە وشەی (دەربارەی)یشدا هەیە و واتە (لەبارەی).

کەواتە (دەرئەنجام) واتە (لەئەنجام)، زۆر کەس لەباتی ئەوەی کەبڵێ: ئەنجامی ئەم کارە ئەمەیە، کەچی دەڵێ: دەرئەنجامی ئەم کارە ئەمەیە ! ! سەیر ئەوەیە قوتابی بەشی زمانی کوردی، دوای ئەوەی کە چەند ساڵێ زمانی فارسی دەخوێنێت، ئەگەر بگاتە خوێندنی باڵا و نامەی ماجستێر یان دکتۆراکەی تەواو بکات، لەکۆتایی نامەکەیدا کە ناونیشانی ئەنجامی کارەکەی دەنوسێت، یان دەنووسی (دەرئەنجام) وەیان دەنووسی (دەرئەنجامەکان) لەجیاتی ئەوەی کە بنووسی (ئەنجام) یان (ئەنجامەکان).

**دەست بەرداربوون**: واتە دەست لێهەڵگرتن، وازلێهێنان، کە دەڵێن: دەست بەرداری نابێ، واتە: دەستی لێهەڵناگرێ یان وازیلێناهێنێ، وشەی ناوبراو سێ بەشە:

دەست + بەردار + بوون.

ئەوەی کە مەبەستمانە بەشی دووەمی وشەکەیە (بەردار)ە و ئەمیش ڕەگی چاوگی بەرداشتەن (= برداشتن)ی. ف. یە، واتە هەڵگرتن، بەرزکردنەوە.

**دەعبا** : لە زمانی کوردیدا، بەشێوەیەکی گشتی بە گیانلەبەران و چوار پێیانی کێوی دەوترێت، هەندێجار بۆ ئادەمیزادی ناشیرین و ناقۆڵا و بەد خوو، یان بۆ شەرمگای ژن و پیاو بەکاردێت.

وشەی ناوبراو گۆڕدراوی (دابّة)ی عەرەبییە، واتە: چوار پێی و ولاخ و هەر گیانلەبەرێکی لەو بابەتە.

**دەماخ هەڵپێکان = دەماخ کردن = دەمامك = دەماخ هەڵدان = دەماخە هەڵدان** : واتە هەڵبەستنی دەم و لووت بە جامانە، یان لەچك، یان بە هەر شتێکی لەو جۆرە.

دەماخ = دەماغ : کە بەشێکە لە وشەی لێکدراوی ناوبراو، واتە: لووت، کەپوو، بەلاّم ئەمڕۆ وشەکە بە تەنهایی بەکارنایەت بۆ ئەم مەبەستە.

**دەوڵەمەند** : وشەیەکی باو و زانراوە و دوو بەشە:

دەوڵە + مەند.

دەوڵە : سوواوی وشەی (دەوڵەت)ە، بە واتای سامان و ماڵی دنیا.

مەند : پاشگرە، واتای خاوەن دگەیەنێت.

**دێو و درنج** : ئەم دوو وشەیەی کە بەم جۆرە بە یەکەوە هاتوون، بەشێوەیەکی گشتی باو وبیستراوە لەناو کوردەواریدا، لە چیرۆك و داستانە فۆلکلۆرییە کوردییەکاندا هەندێ جار دەبیسترێت، لە قسەی سەرزارەکی خەڵکیشدا بەرگوێ دەکەوێت، ڕابوردووی هەر دوو وشەکە زۆر زۆر کۆن و دوور و درێژە، لە زمانە هیندو ئەوروپییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە سێ هەزار ساڵ، بەلاّم لێرەدا بە کورتی لێوەی دەدوێین. بەشی دووەمی وشەکە (درنج)ە لە کوردیدا، بە کەمێ گۆڕانەوە ڕەسەنایەتی خۆی پاراستووە و ماوەتەوە، بەلاّم زۆر دەگمەنە لە زمانە هیندۆ ئەوروپییەکانی ئەم سەردەمەدا.

لێرەدا بە کورتی دێینە سەر باسی هەر دوو وشەکە:

دێو : لە ئەڤیستادا ((دەئیو)) ناوی گشتی کارگوزران و یارمەتیدەرانی ئەهریمەنە، کە بەرامبەر بە کارە داهێنەرەکانی ئەهورایی ڕاوەستاون و بەجنێودان و بێ ئابڕوویی لەگەڵیدا دەجەنگن و ئەهریمەن بە ((دیوان دیو)) واتە گەورە و فەرمان ڕەوای دێوانی دادەنێن.

دێو له ئایینی مەزدا پەرستیدا بە واتای ((دورووج)) واتە درۆ، هاتووه، بەو شێوەیه ((دەئیویەسنەی)) واته ((دێو پەرست)، لەگەڵ ((درۆ پەرست)) یان ((دوروەند)) به یەك مەبەست بەکاردێن، لەبارەی دێوان و جادووان و پەریان و کەویان (= لەگاهاندا، کەوی: ناو، یان ناونیشانی یەکێ لە فەرمان ڕەوایان و دوژمنی ئایینی زەردەشته، که هەمیشه به خراپی ناوی دەبرێت.) کەرەپان (= کەرەپ: لەگاهاندا ناونیشانی پێشوایان و دێو پەرستان و دوژمنانی ئاینی مەزداپەرستیه.) ئەمانه بەزۆری به یەکەوه ناو دەبرێن و هەموویان وەکو یەك بێزراو و ڕیسوا کراون.

دێو لای هیندییەکان و ئێرانییه کۆنەکان، کۆمەڵێ بوون، له پەروەردگاره ستایش کراوەکان، بەم شێوەیه (دیو) یان (دیوا) تائێستا لە سەنسکریتدا بەواتای ((خوداوەند))ه، کە واتا ڕەسەنەکەی تیشك و ڕووناکییە، وەکو خۆی ماوەتەوه و بەهەمان گەورەیی و مەزنی دێرینەی خۆی بەرخوردارە، هەروەها به خەتی سەنسکریتیش دەڵێن ((دیوانیگاری)) واتە: خەت، یان نووسینی دێوان، هەروەها له زمانه هیندۆ ئەوروپییەکانی تردا، هاوڕیشەی ئەم وشەیه، بە هەمان واتای کۆن بەرچاو دەکەوێت، وەکو (زئوس) لە یۆنانی و (دیوس) له لاتینی و (دییو) له فەرەنسی و (دیوتس) واته خودایان لە ئەرمەنیدا. بەلام لە گۆڕانکاری ئاینی و بیریی ئێرانییەکاندا (گومان دەکرێ که ماوەیەکی زۆر لەپێش زەردەشت.)، سروشت و بیر و ڕەوشتی دێوەکان گۆڕا بێت به کارگوزاران و یارمەتیدەرانی ئەهریمەن و گومڕاکەرانی خەڵك و تێکدەرانی سروشتی باشی ئەهورایی، بەم شێوەیه کە ((ئەسوەره))کان (= ئەهوره) لای هیندییەکان سروشتی ئەهریمەنیی و گومڕاکەرن.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ، هیندییەکانی ئەمڕۆ، واتای (دێو) بەهەمان مەبەستی کۆن کە (خوداوەند)ه، بەکاردەهێنن و وشەی (دێوانە) کە لە هەمان ڕیشەیه، به واتای شێت بەکاردێنن. [١٥]

دورووج : لـه ئەڤیـستادا ((دورووج)) یـان ((درووگ))ە و، لـە پەهلەویـدا ((درووز)) بـە واتـای ((درۆ)) دێـت و نـاوی دەڵـەدێوی درۆ و نادروسـتیی و پەیمان شکێنە.

هەندێ جار مەبەست لەم وشەیە، نـەریتی درۆ، یـان ئـاینی دێوپەرسـتی، بەرامبـەر بـە ئـاینی مەزداپەرسـتی و پـەیڕەوی ((ئەشـە)) واتـە ڕاسـتی و دادگەری، و هەندێ جار فریو، یان پەیڕەوی نەریتی درۆ.

هەندێ لە لێکۆڵەران، دوای پـشت بەسـتن بـەو کـار و لێکۆڵینەوانـەی کـە لەبارەی (دورووج)ەوە کراون، لە ئەڤیستا و تێکستە پەهلەوییەکاندا، وای بۆ دەچـن کـە واتـای (دێـو) دەگەیـەنێت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە دەتـوانین ئـەم نووسینەی کە لە کتێبی ((روایت پهلوی))ی داهاتووە، بخەینە ڕوو کە دەڵێ: (ئینجا دوو دورووجی وەك یەك، ئەهریمەن و چاوچنۆکی) بەو شـێوەیەی کـە لـەم نووسـراوەدا دەبینرێـت، ئەهریمـەن سـەرکردە و ڕابـەر و دروسـتکەری هـەموو دێـوان و دێوخـووان بـووە کـە بـەناوبانگترین دێوانـە، هـەردووکیان (دورووج)یان پێ دەڵێن.

بەڵام لە شوێنێکی تری هەمان تێکستدا هاتووە کە ((دیارە کە هەر شەو ئەهریمـەن و دێـوان و دورووجـان بـۆ مرانـدنی ئافەریـدگار هورمـەزد، لـە دۆزەخەوە هێرش دەبەن.)) کە لێرەدا لـەبارەی ئەهریمەنـەوە لـە ڕابـەری و فـەرمان ڕەوایـی و، لـە دێـوان و دورووجانـەوە، لـەبارەی کـارگوزاری و لەشکرەکانیانەوە، بەجیا ناوبراوە.

لە میهر یەشت بە لێکدراوی ((میثـر و دروج)) بـە واتـای درۆزنـی لەگـەڵ میهر (= پەیمان شکێن بەرچـاو دەکـەوێت، کـە لـە هـەموو شـوێنێکدا واتـای ((پەیمان شکێن)) هەیە.(١٦)

میهر و دورووج : لە ئەڤیستادا ((میثر و دورووج)) واتە: درۆزنـی لەگـەڵ میهـردا، پـەیمان شـکێن، پـەیمان ناتـەواو، کەسـێ کـە لـە ڕێگـای ڕاسـتی و پەیمان ناسی بچێتە دەرەوە.(١٧)

میهر : له ئەڤیستادا ((میثره))یه و له پەهلەویدا ((میتر)) یان ((میهـر))، له ئەڤیستای نوێدا خوداوەندی تیشك و ڕووناکی و پـەیمان ناسـی و یەکێکـە له گەورەترین خوداوەند له ئەفسانه کۆنەکانی هیندو ئێرانیدا.[18]

بۆ نموونه گۆرانی شاعیریش وشەی (درنج)ی بەکارهێناوە:

ئـــازادی خـوازگـری گــری

کەوته ژێر پێی درنج پەری[19]

**ڕۆبیتان** : ئەمه ناوه بـۆ کـوڕ لـه کوردەواریـدا، هەنـدێ جـار لـه دیـوانی شـاعیرانی کلاسـیکیماندا بەشـێوەی (ڕووبـین تـەن) بەرچـاو دەکـەوێت، بەتایبـەتی لـه دیوانی سالمدا.

وشەی ناوبراو گۆڕدراو و سوواوی وشـه (ڕوویـین تـەن)ه و وشـەکه سـێ بەشه:

ڕووی + ین + تەن.

ڕووی : جۆره فلزێکه، کـه ڕەنگەکـەی خۆڵەمێـشی مەیلـەو شـینه، قـاپ و قاچاغی لێدروست دەکرێ، کـاتێ کـه لەگـەڵ مـسدا تێکـەڵ دەکرێـت، فلـزی (برنج)ی لێپەیدا دەبێت، که ڕەنگی زەرده و، سەماوەر و هەندێ شـتی تـری لێدروست دەکرێت.[20]

ین : پاشگره لێرەدا هاتۆته نێوان هەردوو وشەکەوه و واتای چوونه پـاڵ و لێکـچوون بـوون دەگەیـەنێت، وەك : زیـوـــ◄ زیـوین. ئاسـن ◄ ئاسـنین ... هتد.

تەن : لەش، جەسته.

ڕوویین تەن : واته ئەو کەسەی که لەشێکی بـەهێز و داڕێـژراوی هـەبێت و زۆر بەرگەی لێدانی سەخت بگرێت.

**ڕۆچ** = **ڕۆچ** : به واتای ڕۆژ، خۆر، هەتاو، ئـەم وشـەیه بەشـێوەیەکی بـەرفراوان لـه زمانی کوردیدا بەکاردێت و زۆر کۆنه و ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوه بۆ پـێش ئیسلام و پێش زایین و بگره پتر له سـێ هـەزار سـاڵ لەمەوبـەر و ئـەمڕۆ لـه

گەلێ لە زمانە هیندۆ ئەورۆوپییەکاندا بەکاردێت، هەروەها لە زمانەکەماندا چۆتە قالب و واتای جیاجیاوە بەشێوەی وشەی لێکدراو و داڕێژراو، وەکو:

ڕۆجیار، ڕۆچیار = ڕۆژگار، زەمانە.

ڕۆجیارپەرست = گوڵەبەڕۆژە.

ڕۆچن = کلاو ڕۆشنە، کونی دیوار یان سەربان کە تیشکی ڕۆژی پێدا دێتە ژوورەوە.

ڕۆچنایی = ڕۆشنایی، ڕووناکی.

ڕۆجەوان = بەڕۆژوو، ڕۆژووەوان.

ڕۆچی = ڕۆچە، ڕۆژوو.

بەر بەڕۆچك = بەربەڕۆچکە = جێگەی خۆ هەڵخستن لەبەر هەتاو.[٢١]

گۆران لەم دێڕە شیعرەدا وشەی (بەربەڕۆچکە)ی بەکارهێناوە:

کام بەر بەڕۆچکەی زۆر با سەفایە

چەشنی دڵی شاد دێیە ئاوایە[٢٢]

لێرەدا کۆمەڵە نموونەیەك پیشان دەدەین، کە چۆن وشەی ناوبراو لە زمانە کۆنەکانی پێش ئیسلام و پێش زایین و گەلێ دوورتریش و هەروەها لە زمانەکانی تردا بەکارهاتووە، کە هەموو لە یەك خێزان و سەرچاوەن:

پەهلەڤی ـ roc، پارسی باستان (کۆن) ـ raucah (ڕۆژ)، ئەڤێستا ـ raocah (ڕووناکی)، هیندی باستان (کۆن) rôcish (= ڕەونەق و ورشە، ڕووناکی)، ئەرمەنی ـ Lois (= ڕووناکی)، کوردی ruzh، ئەفغانی ـ vraj، بلووچی ـ rôc (= ڕۆژ، هەتاو)، وخنی ـ ráuj (مەشخەڵ)، گێلەکی ـ rūz، فریزندی ویرنی و نطنزی ـ rû، سمنانی ـ rûsh, rû، سنگسری ـ rûzh، سرخەیی ـ ruz، لاسگردی ـ ru – rûz، شەهمیر زادی ـ ru , ruz، ئەورامانی = هەورامانی ـ rô.[٢٣]

**ڕۆغان** : ئەو پێڵاو و جانتا و پشتێن و .. هتد، انەی، کە لە جۆرە چەرمێکی بریقەدار دروست کراون، و لەوە دەچن کە چەور کرابن، یان ڕۆنیان

لێدرابێت. ئـەم وشـەیە چـۆتە زمـانی عەرەبیـشەوە بەهـەمان واتـا، وشـەی (ڕۆغان) گۆڕدراوی وشەی ڕەوغەن (=روغن)ی. ف.یە. واتە: ڕۆن.

**ڕۆڵە** : ئەمڕۆ وشەیەکی باوە لە کوردەواریـدا و، دەچـێتەوە سـەر وشـەی (ڕوود) و، لە کۆندا بـە واتـای هـەمان وشـەی ڕۆڵـە بـەکارهاتووە و پاشـگری (ڵـە) یـان (ۆڵە)ی چۆتە سەر، کە بۆ بچووك کردنەوە و خۆشەویستییە و واتە بووە بـە (ڕوودڵە، ڕوودۆڵە) بە درێژایی ڕۆژگـار پیتـی (د)ەکـەی کـەوتووە، کـە ئەمـە یەکێکە لە تایبەتمەندێتی زمانی کـوردی و، ئینجـا بـووە بـە (ڕووڵـە، ڕۆڵـە). لێرەدا دێڕە شیعرێکی باباتاهیر بە نموونە دەخەینە ڕوو، کە وشەی (ڕوود)ی بەهەمان مەبەست بەکارهێناوە:

بـەر ئـون پیری همینالـەم دەرئین دەشت

کە (روود)انی جەوونەش مووردە باشەند[٢٤]

واتە: بۆ ئەو پیرە دەناڵێنم لەم دەشتەدا، کە ڕۆڵە گەنجەکانی مردبن.

**ڕەوش** : ئەمە وشـەیەکی نوێیـە لـە زمـانی کوردیـدا و لـە فارسـییەوە وەرگـیراوە و بەمەبەستێکی تر بەکاردێت.

ڕەوش (= روش) لە فارسیدا ناوی چـاوگە و، واتـە: شـێوە، جـۆر، تـەرز، چۆنیەتی، جۆری ڕۆیشتن، ئەم وشەیە دوو بەشە: ڕەو + ش.

ڕەو : ڕەگی چاوگی ڕەفتەن (= رفتن)ی. ف. یە، واتە ڕۆیشتن.

ش : پاشگرە و کە دەچێتە سەر ڕەگی چاوگ ناو دروست دەکات.

**ڕیسمان** : ئەم وشەیە لە پەنـدێکی پێـشینانی کوردیـدا، بـەم جـۆرە بـەکارهاتووە: (ئاسمان و ڕیسمانە) واتە: بە دوو شتی وا ئەوترێ، کە زۆر لـە یەکـەوە دوور بن.[٢٥]

هـەروەها لـە زمـانی فارسیـشدا بـە هـەمان جـۆر و هـەمان مەبەسـت بەکارهاتووە و دەڵێن: ئاسمان و ریسمان (= آسمان و ریسمان.)[٢٦]

بابزانین وشەی ڕیسمان واتـای چـییە و چـۆن داڕێـژراوە. وشـەی (ڕێسمان) واتـە: گـوریس. وشـەکە دوو بەشـە لـە فارسـی و لـە کوردیـدا بـەم جـۆرە داڕێژراوە:

لە کوردیدا: ڕێس + مان.

ڕێس : ڕەگی چاوگی (ڕێسان)ە.

مان : پاشگرە و ناوی دروست کردووە لەگەڵ ڕەگدا.

لە فارسیدا : ریس + مان.

ریس : ڕەگی چاوگی ریسیدەن (= ریسیدن)ە واتە: ڕیسان.

مان : پاشگرە و ناوی دروست کردووە لەگەڵ ڕەگدا.

**زا** : لە کۆتایی هەندێ وشـەی کوردییـەوە دێـت وەکـو: شـارەزا، مـیرزا، ئـامۆزا، خالۆزا، خوشکەزا، خوارزا، برازا، .... **هتد**.

زا : ڕەگی چـاوگی زادەن، زاییـدەن (= زادن، زاییـدن)ی. ف. یـە، واتـە: لـە دایك بوون، هاتنە دنیاوە.

**زاد** : ئەمە بەشی دووەمی هەنـدێ وشـەی لێکـدراوە لـە زمـانی کوردیـدا، وەکـو: شێرزاد، نەوزاد، پـاکزاد، بێهـزاد، بێهنـام: کـە ئـەم دوو وشـەی دوایییـە بـە زۆری لە کوردیدا بە (بەهزاد، بەهنام) بەکاردێت، کە بەشی یەکەمیان (بیـه)، (بەه)ە، واتە باش، چاك.

بابزانین (زاد)ەکە چییە؟

زاد : چاوگی کرتاوی زادەن (= زادن)ی. ف. یە، واتە لە دایك بوون.

**زەردەخەنە** : واتاکەی باو و زانراوە و دوو بەشە: زەردە + خەنە.

زەردە : لـەم وشـە لێکـدراوەدا، واتـای ئـارامی و لەسـەرخۆیی و نـەرمی دەگەیەنێت.

خەنە : کورتکراوەی وشەی (خەندە)یە، واتە پێکەنینی ئارام و لەسەرخۆ، یان لە چاوگی (خـەنین)ی کوردییـەوە وەرگـیراوە، واتـە: پێکـەنین، کـە دوو بەشە بەم جۆرە: خەن + ە.

خەن : ڕەگی چاوگی (خەنین)ە.

ە : پاشگرە و چۆتە سەر ڕەگ، ناوی چاوگی دروست کردووە.

**زەندەق چوون** : لە زمانی کوردیدا زۆر باو و زانراوە و مەبەست ترسی زۆر لە وزە بەدەرە، بەشی یەکەمی وشەکە (زەندەق)ە، لەگەڵ وشەی (زەندیق) و (زەندەقة) کراو بە عەرەبین و ڕەگ و ڕیشەی پێش ئیسلام و پێش زایینیان هەیە.

زەندیق (زندیق)، کراو بە عەرەبییە، (لە پەهلەڤیدا zandīk و لە ئەڤیستادا sanda، واتە گوناه.) بە واتای پەیڕەوی مانی و بێدینی و دەهری هاتووە، ئەم وشەیە لە عەرەبیدا کۆیش کراوەتەوە و بوو بە: (زنادقە) و زەندەقە (زندقە). ع. زەندیق بوون، بێ ئاین، لە دەرووندا بێ ئاین بوون بەڵام خۆپیشاندان بە ئاییندار.[٢٧]

با لێرەدا فۆرمە کۆنەکانی بخەینە ڕوو:

زەند : (لە ئەڤیستادا azanti = لێکدانەوە و ڕوون کردنەوە.)، لێکدانەوەی ئەڤیستا بە زمانی پەهلەڤی لە سەردەمی ساسانییەکاندا.[٢٨]

زەند و ئەڤیستا : ئەڤیستا، کتێبی ئاینی زەردەشتە و، زەند : واتە لێکدانەوە و ڕوون کردنەوەی بە زمانی پەهلەڤی، لە ئەدەبیاتی فارسیدا هەر دوو بەشەکە بەسەر یەکەوە بە واتای (ئەڤیستا) بەکارهاتووە.[٢٩]

زەندیك : لە ئەڤیستادا ((زەندە))، واتە کەسێ کە پەیڕەوی ئاینی مەزدایی نەبێت و یان لێی هەڵگڕابێتەوە. ئەم وشەیە بەزۆری لەگەڵ (جادوو)دا دێت، بە واتای (جادووگەر). مانی زانای گەورەی سەردەمی ساسانییەکان بووە، لەلایەن مووبەدانی زەردەشتیەوە بە هەمین وشەی (زەندیك) تاوان بار کرا، ئەمە کراو بە عەرەبییەکەی (زندیق)ە، لەسەرچاوەکانی دوای ئیسلامدا زۆر بەرچاو دەکەوێت، (دکتۆر تفضلی) نووسیوێتی کە (زەندیك) بەو کەسە دەوترێت کە تێکستە ئایینییەکان بە

پێچەوانەی شەرع بەشێوەی ڕێگا نەدراو لێکبداتەوە. ( مینو، ص١٣٥)، (وند. فر، ١٨، بند، ٥٥ـ زیر)[٣٠]

لێرەدا زۆر بە کورتی باسی مانی دەکەین:

مانی ناوی وێنەساز و نەقاشێکی کۆنە و، داوای پێغەمبەری خودای دەکرد، ناوی باوکی ((پتك)) یان ((فاتك)) بوو، کە لە شازادەکانی ئەشکانی بووە، دایکی ناوی مریەم بوو، مانی لەساڵی ٢١٦ز، لە دێی ((ماردنیر))ی نزیك بابل لەدایك بووە، کتێبەکەی ناوی ((ئەرژەنگ)) یا ((ئەرتەنگ))ە، کە بیروباوەڕی ئەوی تێدایە، ئەم کتێبە بە وێنە و نەقشی جوان جوان، ڕازاوەتەوە، مانی لەساڵی ٢٧٧ز لە (جوندی شاپوور) کۆچی دوایی کردووە.[٣١]

وەکو باس کرا، بەشی یەکەمی وشەکە (زەندەق)ە و، گەلێ واتای مەترسیدار دەبەخشێ، وەکو: بیدینی و ڕەفتار و کردەوە بە پێچەوانەی ئاین، ئەمە لەپێش ئیسلام و لەدوای ئیسلامیش، تاوانێکی گەورە و مەترسیدار بووە و ئەو کەسەی کە ئەمەی بەسەردا ساغ بووبێتەوە سزاکەی کوشتن بووە و، ڕوو بەڕوو بوونەوەیش بەرامبەر بەم تاوانە گەورەیە لەپاش ڕۆژگارێکی دوور و درێژ بووە بە (زەندەق چوون) لە زمانی کوردیدا، کە بە واتای ئەو پەڕی ترس دێت.

**زێراب** : وشەکە زانراوە.

دوو بەشە: زێر + اب.

زێر = زیر : ژێر.

اب = ئاب : ئاو.

لە زمانی فارسیشدا (زیراب)ە، بەهەمان واتا.

**سواڵکەر** : زانراوە.

ئەم وشەیە دوو بەشە: سواڵ + کەر.

سواڵ : سوواوی وشەی (سؤال)ی عەرەبییە.

کەر : بڕوانە وشەی: یاریکەر.

**سەراب** : ئەم وشەیە چۆتە زمانی عەرەبیشەوە. کاتێ کە تیشکی خۆر دەدات لە بیابانێکی پان و بەرفراوان، دووبارە تیشکەکە دەداتەوە و، لە دوورەوە لە گۆماوێك دەچێت. سەراب واتا سەری ئاو، ڕووی ئاو، وشەکە دوو بەشە:

سەر + اب.

سەر : ڕوو.

اب = ئاب : ئاو.

**سەرداب** : وشەیەکی باو و زانراوە و دوو بەشە:

سەرد + اب.

سەرد : سارد.

اب = ئاب : ئاو.

**سەرسیر** : ناوی دێیکە لە ناوچەی سلێمانی سەر بە قەزای چوارتا. ئەم وشەیە دوو بەشە: سەر + سیر.

سەر : کورتکراوە، یان سوواوی وشەی (سەرد)ە واتە سارد.

سیر : پاشگرە و بەمەبەستی شوێن بەکاردێت.

سەرسیر : واتە شوێنی سارد، ناوچەی سارد، بەشی دووەمی ئەم وشەیە (سیر)ە، لە وشەی (گەرمەسێر)ی کوردیدا (سێر)ە و پاشگرە و بە هەمان مەبەست بەکاردێت.

**سەقامگیر** : ماوەیەکە بووە بە وشەیەکی باوی ئەم سەردەمە لە زمانی کوردیدا، وشەکە دوو بەشە:

سەقام + گیر.

سەقام : گۆڕدراوی وشەی سیقام (=سیقام)ی عەرەبییە و کۆیە. واتە: نەخۆشییەکان، تاکی ئەم وشەیە سەقیم (= سقیم)ە، واتە نەخۆش.

گیر : ڕەگی چاوگی گرفتەن (= گرفتن)ی. ف. یە، واتە (گرتن) کە ڕەگی ئەمەیان (گر)ە.

ئەگەر وشەی لێکدراوی سەقامگیر ڕاستەوخۆ هەڵبگێڕینەوە سەر کوردی دەبێ بڵێین: نەخۆشییەکان گر! !

**سیخوڕ** : لە بیرم دێ کە خوالێخۆش بوو کامەرانی شاعیر دەیوت: بۆ یەکەم جار من وشەی (سیخوڕ)م بەکارهێناوە بە واتای جاسووس، دەیشی زانی، کە ناوی جۆرە گیانلەبەرێکە، لە کوردستاندا ناسراوە و بە فارسیش (سیخور، سیخول)ی پێدەوترێت، کە جۆرە گیانلەبەرێکە لە خێزانی ژیشك = ژووژوو، بەڵام لە ژیشك گەورەتر و، لە کوردەواریدا ڕاو دەکرێت و گۆشتی دەخورێت و لەشی داپۆشراوە بە دڕکی درێژی وەکو سیخ و ڕەنگی ڕەش و سپییە و دەڵێن گوایە ئەو دڕکانە دەوەشێنێت بۆ بەرگری کردن لە خۆی.

وشەکە دوو بەشە: سیخ + وڕ.

سیخ : هەر شتێکی درێژ و نووك تیژ کە لە فلز یان دار دروست کرابێت، ئەم وشەیە ڕەگ و ریشەی زۆر کۆنە:

لە زمانی سانسکریتدا ـ Cikha واتە (نووك، چزوو، دەنووك)، لە کوردیدا ـ Sîxû, Sîxî (فتیلە)، لە بلووچیدا ـ Sî , Sîh ( = سیخ)، لە ئەفغانیدا ـ Sîx، لە گێلەکیدا ـ Sêx، کراو بە عەرەبییەکەی (سیخ)ە، لە تورکیدا ـ شیش، کە لە ئاسنی باریك و درێژ دروست دەکرێت و گۆشتی پێدەبرژێنن.(٣٢)

وڕ : پاشگرە بە واتای خاوەن.

**شەوە زەنگ** : واتە شەوی تاریك، بەشی دووەمی وشەکە (زەنگ)ە و گەلێ واتای جۆراوجۆری هەیە، بەڵام لێرەدا واتە تاریك، بە واتای ڕەشیش زۆر بەکارهاتووە، وشەی (زەنگی)ش هەر لەمەوە وەرگیراوە و بە یەکێ دەوترێت کە خەڵکی (زەنگبار) بێت و ئەمیش دوورگەیەکە لە ئوقیانووسی هیند، نزیکی کەنارەکانی ئەفەریقا، کە دانیشتوانی قولەڕەشن، هەروەها بە

قولـەڕەش و پێـست ڕەشـیش دەوتـرێ، وشـەی زەنگـی چـۆتە زمـانی عەرەبییەوە و بووە بە (زنجی) واتە قولـەڕەش، وشـەی زەنـگ و زەنگـی لـە شیعری کۆنی کوردیدا بەو واتایانەی کە باس کراون، بەکارهاتووە.

**عەرز و حاڵ**، **قەتڵ و عام** : ئەم دوو وشە لێکدراوەیـە، هـەر یەکـەیان دوو وشـەی عەرەبییە و تیپی (و) وا لە ناوەراستیاندا، کـە ئـامرازی خـستنە سـەرە و لـە شـێوە زاری هەورامییـەوە هـاتووە و، ئـەمڕۆ لـەجیاتی ئـەوە، لـە کرمـانجی خواروودا تیپی (ی)ی خستنە سەر بەکاردێت. ئەگەر هەر دوو وشەی نـاوبراو بەپێی رێزمانی ئەمڕۆ بەکاربهێنین دەبێ بڵێین:

عەرزی حاڵ، قەتڵی عام.

**فەراهەم کردن** : وشـەیەکی نوێیـە لـە کوردیـدا ئـەمڕۆ بـەکاردێت. بەشـی یەکـەمی فەراهەم (= فراهم)ی. ف. یە، گەلێ واتای هەیە وەك: ئامادە، کۆبـووەوە لـە شوێنێکدا، لەگەڵ یەکتریدا ... هتد.

**قوبـووڵی** = **قـوبڵی** = **بـرنج** : هەنـدێ جـار بـیرم لـەم وشـەیە دەکـردەوە و نەمدەزانی لە چییەوە هاتووە و بۆچی ئەم وشـەیە بـە واتـای چێـشتی بـرنج بەکاردێت. دیارە کە تیپی (ق) لە کوردیدا نەبووە و هاتۆتە زمانەکەمانـەوە. نزیکەی (٣٠) سی ساڵێ لەمەوبەر، چەند دۆستێ لە شوێنێکدا دانیشتبووین، باس باسی زمان و ڕابوردووی هەندێ وشە بوو، پرسـیم و وتم: نـازانم وشـەی قوبووڵی و قوبڵی لە چییەوە هاتووە؟

یەکێ لە دانیشتوان وتـی: لـە بـاوکم بیـستووە، دەیـوت: لـەکاتی خۆیـدا چەند بنەماڵەیـەکی ئـەفغانی لـە سـلێمانیدا نیـشتەجێ بـوو بـوون و جارەهـا لێیانم بیستووە، لەجیاتی برنج وشەی (کابولی)یان بەکاردەهێنا و دەیـان وت با (کابوولی)یەك لێبنێین،هەر ئەم کابولییە بوو، کە بوو بە قوبووڵی و قوبڵی.

**قەد** : وشەیەکی نوێیە لە ڕێزمانی کوردیدا و لەجیاتی (چـاوگی کرتـاو) بـەکاردێت، وشەی (قەد) عەرەبییە و بە واتای بەژن وبالاً بەکاردێت و، ئەم وشەیە چۆتە

بەشـــی زۆری زمـــانی نەتـــەوە ئیـــسلامییەکانەوە و هـــەر بـــە هـــەمان واتـــا عەرەبییەکەی بەکاردێت.

**قەڵا دووشکان** : واتە سەرشانەکان، ئـەوەی کـە لـەم وشـەیەدا سـەرنج ڕادەکێـشێ وشەی (دووش)ە و واتا (شـان) قـەڵا دووشـکان واتـە سەرشـانەکان. وشـەی (دووش) ئـەمڕۆ لـە کوردیـدا بـە تـەنهایی بەکارنایـەت و لـە زمـانی فارسـیدا وشەیەکی باوە بە واتای شانی کوردی.

**قەیران** : وشەیەکی نوێی ئەم سەردەمەیە لە کوردیدا، لـەوە دەچـێ کـە لـە (قـیران kiran.)ی تورکییەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە، لە تورکیدا واتە: پەتا و ئەو نەخۆشییانەی کە لە یەکێکەوە تووشی یەکێکی تر دەبێت، بەتایبـەتی لەناو ئاژەڵدا.(٣٣)

**کازییوە** : سەرەتای دەمە و بەیان، یان بـەرە بـەیان، وشـەی کـازییوە، گـۆڕدراو و سوواوی وشەی (کاذبة)ی عەرەبییە، واتە درۆیین، و (کاذبة)ش کـورتکراوەی (الصبح الکاذب)ە، و لەگەڵ ئەمەشدا (الصبح الصادق)هەیە.

الصبح الکاذب : بەو دەمە و بەیانییە دەڵێن، کە لەپێش (الصبح الصادق)دا، دەمێکی کورت دەردەکەوێت و دوای ئەوە نامێنێت، واتە بەیانی درۆیین.

الصبح الصادق : ئەو کاتەیە کە ڕووناکی ڕۆژ لەناو تاریکی شەودا بەباشی دەردەکەوێت.

**کلۆج** : لـە وشـەی لێکـدراوی (بـە هـیچ کلـۆجی)دا، واتـە: بـەهیچ جـۆری، بـە هـیچ ڕەنگێ، وشەی (کلۆج)، گۆڕدراوی (کل وجە)ی عەرەبییە و سوواوە و چـۆتە قاڵبێکی سادە و ئاسانەوە، کە ئەمەیان پتر دەگونجێ لە زمـانی کوردیـدا و، کە وترا بەهیچ کلۆجێ، گەلێ لە بارتر و ئاسانترە لـەوەی کـە بـوترێ: بـەهیچ کولو وەجهێ.

**گارەگار، گاڵەگاڵ** : وشەی گارەگار لە هەولێردا و، وشەی گاڵەگاڵ لە سلێمانیدا، بە واتای دەنگە دەنگ و هەرا و هوریا بەکاردێن، بەڵام (گارەگار) لـە سـلێمانیدا

تایبەتە بە دەنگی مریشك. هەر دوو وشـەی نـاوبراو لـە بنەڕەتـدا گـۆڕدراوی (قال قال)ی عەرەبین.

**گفتوگۆ** : وشەیەکی لێکدراوە و لەم بەشانە پێکهاتووە:

گفت + و + گۆ.

گفت : گۆڕدراوی وشەی گوفت (= گفت)ە کە چاوگی کرتاوی، گوفتەن (= گفتن)ی. ف. یە، واتە وتن، گوتن.

گـۆ : گـۆڕدراوی، گـوو (= گـو)ی. ف. یـە، کـە ڕەگـی هـەمان چـاوگی (گفتن)ە، کە باسکرا لە فارسیشدا دەڵێن: گوفـت و گـوو (= گفـت و گـو) بـە هەمان مەبەست.

**گوێ بیست بوون** : چاوگێکی داتاشراوی نوێی نابەجێیە و ئەمڕۆ زۆر بەکاردێت لـە نووسـیندا و، لـە ڕادیـۆ و تەلـەفزیۆن و وتووێـژدا دەبیـسترێت لـەجیاتی (بیستن)، کە چاوگێکی سادە و ڕەسەن و زۆر باوی کوردییە، لەباتی ئـەوەی کە بڵێن: (بیستی)، کەچی دەڵێن: (گـوێ بیـستی بـوو)، خـۆ ئەگـەر لەسـەر هەمان دەستوور، ئەم چاوگە سادانە: (گرتن، دیتن، چەشـتن، گەسـتن، .... هتد)، دابتاشین، دەبێ بڵێین: (دەست گـرت بـوون، چـاو دیـت بـوون، زمـان چەشت بوون، دان گەست بوون، .... هتد)، ئینجا بەگوێرەی ئەم داتاشینە، ئەگەر بمانەوێت بڵـێن: (گرتـی، دیتـی، چەشـتی، گەسـتی، .. هتـد)، دەبـێ بڵێین: ( دەست گرتی بوو، چاو دیتی بوو، زمان چەشـتی بـوو، دان گەسـتی بوو، ... هتد).

ئایا ئەمە چەندی بە چەندە؟!!

**گیروگرفت** : وشەیەکی لێکدراوی پێکهاتووە لە:

گیر + و + گرفت.

گیر : ڕەگی چاوگی گرفتەن (= گرفتن)ی. ف. یە. واتە: گرتن.

گرفت : چاوگی کرتاوی گرفتەن (= گرفتن)ە.

**لێــدوان دان** :   كـوا چـاوگی وا لـە زمـانی كوردیـدا هەیـە؟ ئەمـە چـاوگێكی نـوێی داتاشراوە، لەجیاتی: لێدوان، وتن، قسەكردن بەكاردەهێنرێت. هەنـدێ جـار دەبیسترێت، یان لە نووسـیندا بەرچـاو دەكـەوێت و دەڵـێن یـان دەنووسـن: لێدوانێكی دا، لەجیاتی ئەوەی كە بڵێن: دوا، وتی، قسەی كرد.

**ماسوولكە** :   سوواوی وشەی (ماسیولكە)یـە، واتـە ماسـی بـچووك، كـە دوو بەشـە: ماسی + ولكە.

بەشی یەكەم زانراوە و، بەشی دووەمیش پاشگرە و بە مەبەسـتی بـچووك كردنەوە بەكاردێت. بەرامبەر بە وشەی ماسولكە، وشەی (ماینچە)مان هەیە، كـە ئەمــەیان بــۆ ماسـولكەی ئـاژەڵ و مــەڕ و مـاڵات بـەكاردێت و ئەمــەیان گــۆڕدراو و ســوواوی وشــەی (ماهیــچە)ی. ف. یــە، ئــەمیش دوو بەشــە:

ماهی + چە.

ماهی : ماسی.

چە : پاشگری بچووك كردنەوەیە.

وشەی ماسی كوردییە و، مـاهی فارسـییە. وشـەی ماسـی ڕەگ و ریـشەی زۆر كۆنی هەیە لە زمانە هیندۆ ئەوروپییەكاندا و دەگەڕێتەوە بـۆ ئەڤیـستا و هیندی كـۆن، كـە ڕابـوردووی نووسـراوی پـتر لـە سـێ هـەزار سـاڵی هەیـە و هــەروەها لــە شــێوە زمانــەكانی تــری كــوردیش دا هــەمان ڕەســەنی بەرچــاو دەكەوێت، لێرەدا بۆ نموونە بەراوردێك دەخەینە ڕوو:

ئەڤیـستا ـ maya، پەهلـەڤی ـ māhîk، هینـدی كـۆن ـ mátsya، كـوردی ـ mâsî، بلووچـی ـ mâhîgh, mâhîg, mâhî، ئـەفغانی ـ mâhai، لوڕی ـ mûsî، زازا ـ mâsi، گێلـەكی ـ môhî، مازنـدەرانی و تالشی ـ môï، گەبری ـ mûsû، هەورامانی ـ mâs (ãwi).[٣٤]

**ماڵ و مناڵ** :  لە زمانی كوردیدا زۆر بـاوە و واتاكەیـشی زانـراوە لێـرەدا نموونەیـەك دەهێنینەوە:

كۆڵێ ماڵ و مناڵت            تەزاندوویەتی باڵت[٣٥]

لە زمانی فارسیدا (مال و منال) بە واتای، سامان و دارایی هاتووە، لێرەدا چەند نموونەیەك دەهێنینەوە:

گرتو می خواهی کە معلومت شود رمزی ازآن
در خرابـات من آی و تــرك كـن مـال و منـال

* * *

تـرك كـن مال و منال و دل و جـان را در بـاز
پشت بــر خلـق كـن و روی بـە درویشان كـن

(علاء الدولەء سمنانی، دیوان، ١٧، ٢٠٦)[٣٦]

واتە: ئەگەر تۆ دەتەوێت كە هێمایەكت لەمە بـۆ ئاشـكرا ببێـت، وەرە بـۆ وێرانەكەی من، یان مەیخانەكەی من و واز لە ماڵ و سامان بهێنە.

واز لە ماڵ و سامان بهێنە و دڵ و گیان دەربازكە و پشت بكـەرە خـەڵك و ڕوو بكەرە دەروێشان.

* * *

هەروەها (سیف القضات) دەڵێ:

میـل بـە مـال و منـال بهرتـو واز تـو بـود
بعد تو بر من حرام گلشن و باغ و عقار[٣٧]

واتە: ئارەزوو بۆ ماڵ و سامان، لەبەر تۆ و، بۆ تۆیـە، لـەپاش تـۆ گـوڵزار و باغ و سامان و دارایی لە من حەرام بێت.

هەروەها لە مێژووی ئەدەبیاتی ئێران ـ دانانی ریپكا و ... هاتووە:

..... وی نەدر پی جاه و مقام بود، نەخواهان مال و منال .... [٣٨]

واتە: .... ئەو نە بەدوای پلـە و پایـەوە بـوو، نـەئارەزووی سـامان و دارایـی دەكرد ....

(مال و منال) عەرەبییە و چۆتە زمانی هەندێ لە نەتەوە ئیسلامییەكانەوە بە هەمان واتا عەرەبییەكەی و، هەنـدێ نموونـەمان بـۆ هێنایـەوە، بـەڵام لـە زمانی كوردیـدا دەنـگ و واتاكـەی گۆڕاوە و بـووە بـە (مـاڵ و منـاڵ، مـاڵ و

منـدالّ) و بەشـی دووەمەکـەی، کـە (منـال)ە بـووە بـە (منـالّ، منـدالّ) و ئەمڕۆیش وشەیەکی زۆر باوە لە زمانەکەماندا.

**ماندوونەناس** : وشەیەکی داتاشراوی نوێیە لە زمانی کوردیدا، بەمەبەستی ئـەوە بـەکاردێت: کەسـێ کـە مانـدوێتی نـەزانی و مانـدوو نـەبێت و زۆر بەرگـەی ماندوێتی بگرێت، وشەکە دوو بەشە و هەردووکیان کوردین و زانـراون، بـەڵام لە ڕاستیدا ئەو واتایە ناگەیەنێت کە مەبەستە، ئەگەر وشەی (ماندوونـەناس) لێکبدەینەوە، واتە: ئەو کەسەی کە ماندوو ناناسێت.

ماندوو : ئـەو کەسـەیە کـە مانـدوو بـووە و ماندوونـەناس، ئـەو کەسـەیە، ئەوەی کە ماندوو بێت نایناسێت، دیارە ئەمە واتایەکی ئـەوتۆ نابەخـشێت و دوورە لـە مەبەسـتەوە. وشـەی (ماندوونـەناس) گوایـا وەرگێڕانـی وشـەی خەستە ناپەزیر (= خستە ناپـذیر)ی. ف. یە، وسێ بەشە:

خەستە + نا + پەزیر

خەستە : ماندوو.

نا : ئامرازی نەفییە.

پەزیر = پـەذیر : ڕەگـی چـاوگی پـەزیر و فتـەن (= پزیـرفتن)ی. ف. یـە، واتە: دان پێدانان، قوبووڵ کردن.

کەواتـە، خەسـتە ناپــەزیر (=خـستە ناپــذیـر) ئـەو کەسـەیە کـە دان بـە ماندوێتیدا نانێت و ماندوێتی قوبووڵ ناکات. نا بەو جـۆرەی کـە لـە کوردیـدا داتاشراوە، وەکو باس کرا.

**مڵاك** = **مراك** : واتا کەوچك، ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا (ملعقە)ی عەرەبییە و، چۆتە زمـانی فارسیـشەوە بەشـێوەی مەلاقـە (= ملاقـە) و لـە فارسـیدا بـە واتـای کەوچکی گەورە بەکاردێت، ئێمە لە کوردیدا پێی دەڵێین (ئەسـکوێ) کـە لـە کەوچك گەورەتر و قووڵترە و بۆ تێکردنی شۆربا و شتی شلە بەکاردێت.

**مەحموودی بێزەواد** = **مەحمووی بێزەواد** : ئەمە لە زمانی کوردیـدا بـاوە و دیارە بە چ مەبەستێ بەکاردێت و لە پەندی پێشینانـدا بەکاردێت و دەڵێین:

ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نییە

ئەمە بە یەکێك ئەوترێ کە لە شتێك بێ ئاگا بێ.[٣٩]

لەم وشە لێکدراوەدا، هەردوو وشەکە لە بنەڕەتدا عەرەبین و لە کوردیدا ئەو گۆڕانەی بەسەرداهاتووە، بابزانین (مەحموود) چییە و (بێزەواد) چییە؟

مەحموود : گۆڕدراوی وشەی : مەعبوود (= معبود)ی. ع.ە، واتە: پەرستراو، کە مەبەست خوایە.

زەواد : گۆڕدراوی وشەی: زەوال (= زوال)ی. عەرەبییە، واتە لەناوچوون، نەمان. بێزەواد (= بێ زوال): ئەوەی کە لەناوناچێ و نەمر و هەمیشەییە، کە مەبەست خودایە.

کەواتە، مەحموودی بێزەواد: گۆڕدراو و سوواوی مەعبوودی بێ زەوالە، واتە: ئەو خوایەی کە هەر هەبووە و هەر هەیە.

**مێخەك** : زانراوە و دوو بەشە:

مێخ + ك.

مێخ : بزمار، بەلام ئەمڕۆ بەو شیشە ئاسنە، یان دارە نووك تیژە دەوترێت کە نزیکەی ٣٠سم درێژە و دادەکوترێ بە دیواردا بۆ هەڵواسینی شت، یان دادەکوترێت بە زەویدا، بۆ بەستنەوەی ئەسپ و کەر و گا و .... هتد.

ك : پاشگرە بۆ مەبەستی بچووك کردنەوە بەکاردێت.

وشەی مێخەکیش لە بزمارێکی بچووك یان لە مێخێکی بچووك دەچێت، بۆیە پێی دەڵێن: مێخەك.

**ناڵبەند** : زانراوە، دوو بەشە:

ناڵ + بەند.

ناڵ : سوواوی وشەی (نعل)ی عەرەبییە.

بەند : ڕەگی چاوگی، بەستەن (= بستن)ی. ف. یە. واتە: بەستن. بەڵام ڕەگی چاوگی (بەستن)ی کوردی (بەست)ە.

**ناوزەد** = **ناوزەند** : وشەیەکی داتاشراوی نوێیە، لە زمانی کوردیدا، گوایا هەڵگەڕاوەی وشەی نامزەد (=نامزد)ی. ف. یە، و بەم واتایانە هاتووە: ناوبراو، کەسێکی دیاری کراو بۆ کارێ، دامەزراو، دەزگیران.

وشەی ناوبراو لە هەر دوو زمانەکەدا دوو بەشە:

ناو + زەد ، نام + زەد.

ناو : (نام)ە لە فارسیدا.

زەد : چاوگی کرتاوی، زەدەن (= زدن)ی. ف. یە، واتە: لێدان.

ئەمە ماوەی چەندساڵێکە وشەی (نام زد)ی فارسییان کردووە بە (ناوزەد)، لە ماوەیەکی زۆر کەمیشدا بووە بە (ناوزەند)، ئینجا خوا دەزانێ لەپاش ماوەیەکی تر (ناوزەند) دەبێ بە چی؟!

**نایاب** : وشەیەکی باوە و زانراوە لە زمانی کوردیدا، و دوو بەشە:

نا + یاب.

نا : ئامرازی نەفییە.

یاب : ڕەگی چاوگی یافتەن (= یافتن)ی. ف. یە، واتە دۆزینەوە، پەیداکردن، بە دەست هێنان.

کەواتە هەر شتێ کە دەگمەن بێت و بە ئاسانی دەست نەکەوێت نایابە.

**نشین** : لە وشەی: (جێ نشین، خانەنشین، .... هتد)ی کوردیدا بەکاردێت و نشین: ڕەگی چاوگی نیشستەن (= نشستن)ی. ف. یە، واتە دانیشتن.

**نمایش** : وشەیەکی نوێی ئەم سەردەمەیە لە زمانی کوردیدا، واتە: پیشان دان، دەرخستن. وشەی نمایش دوو بەشە:

نمای + ش.

نمای = نەمای + ش.

نەمای : ڕەگی چاوگی نـەموودەن (= نمـودن)ی. ف. یـە، واتـە: پیـشان دان، دەرخستن، ئاشکرا کردن، هەروەها بە واتای کـردنیش دێـت لـە کۆتـای کاری لێکدراوی فارسیدا.

ش : پاشگرە و کاتێ کە دەچێتە سەر ڕەگ ناوی چاوگ دروست دەکات.

**نوشتە** : دوعا، چەند ئایەت و خواستێکە، کە لەسەر پارچە کاغـەزێ دەنوسـرێت و دەپێچرێتەوە و بەرگی موشەممای تێدەگیرێت، بۆ پیرۆزی و خۆپاراسـتن لـە بەلاّ و ... هتد، بەکاردێت. دیارە ئەم وشەیە لە نەویشتە (= نوشـتە)ی. ف. وە، وەرگیراوە، کە بە واتای (نووسراو) دێت، لە زمانی فارسیدا، (نوشـتە)ی کوردیش هەر جۆرە نووسراوێکە وەکو باس کرا. (نوشتە) پێکهاتووە لـە دوو بەش: نوشت + ە.

نوشت : چاوگی کرتاوی نەویشتەن (= نوشتن)ی. ف. یە، واتە: نووسین.

ە : پاشگرە.

**نەوسن** : چـلێس، ئـەو کەسـەی کـە زۆر ئـارەزووی خـواردنی هـەبێت، وشـەکە دوو بەشە: نەوس + ن.

نەوس : سوواوی وشەی (نفس)ی. عەرەبییە.

ن : پاشگرە، و واتای زۆریی ئەو وشەیە دەبەخشێت کە دەچێتە سەری.

**وەرزش** : وشەیەکی باو و زانراوە لە زمانی کوردیدا و دوو بەشە:

وەرز + ش.

وەرز : ڕەگـی چـاوگی وەرزیـدەن (= ورزیـدن)ی. ف. یـە، واتـە وەرزش کردن، کارکردن، تێکۆشان، هەوڵدان.

ش : پاشگرە و لەگەڵ ڕەگدا ناوی چاوگ دروست دەکات.

**هەسـت و نەسـت** : گـۆڕدراو و سـوواوی وشـەی هەسـت و نیـست (= هـست و نیست)ی. ف. یە، هەست و نیست: بریتییە لە هەموو دراراییی مەردوم

((هەست و نیست)) فیسارم بە دەستە. (خاڵ)

لـه زمـانی فارسـیدا هەسـت و نیـست (= هـست و نیـست) واتـه: بـوون و نەبوون، دارایی و دەست کورتی، سامان و هەژاری.

سەیر ئەوەیە، وشەی (نەست) کە گۆڕدراوی (نیست)ە و، نیـستیش واتـه: نییە، کەچی ئەمە چەند ساڵێکە بەکاریدەهێنن بە واتای ناخ و دەروون.

**یاریکەر** = **یـاریزان** : مـاوەی چـەندەها سـاڵە ئـەم (یاریکـەر)ەیـان کـردووە بـە (یـاریزان)، تـەنها لەبـەر ئـەوەی کـە کۆتـایی دێـت بـە (کـەر)، بـەکارهێنانی ئەمەیان بە عەیب و شوورەیی داناوە، چونکە وایان زانیوە کە ئـەم (کـەر)ە، بە واتای (گوێدرێژ) هاتووە و گۆڕیویانە بە (زان)، کە ڕەگی چاوگی (زانین)ە و، بەم جۆرە وشەی داتاشراوی (یاریزان)یان دروست کردووە. ئەم (کـەر)ە، لە کۆتایی زۆر وشەی تری کوردییەوە هاتووە، چ لە ئەدەبی کۆنماندا، چ لـە شێوە جیاجیاکانی زمانەکەماندا، بەشێوەیەکی ئاسایی هـەر لـە زۆر کۆنـەوە بەکارهاتووە و، ئێـستاش هـەر بـەکاردێت، بـۆ نموونـە: ڕاوکـەر، چێـشتکەر، نانکەر، سواڵکەر، کارەکەر، ئیشکەر، ... هتد.

بابزانین ئەم (کـەر)ە چییە و لـە چـییەوە هـاتووە؟ ئـەم (کـەر)ە ڕەگـی کـۆنی چـاوگی (کـردن)ە و، تـا ئـەمڕۆ لـە زمانەکەمانـدا ماوەتـەوە و بەکارهێنانیشی زۆر ئاساییە لەگەڵ وشەدا، لەبەر ئـەوەی کـە ڕابوردوویـەکی پتر لە سێ هەزار ساڵی هەیە، ئەمە بۆتە هۆی ئـەوەی کـە ڕەسـەنایەتییەکی زۆر گرنگـی هـەبێت، لـەم بارەیـەوە بـیروڕای (م. کلێمـان هـوار M.Clement Huart) دەخەینـە ڕوو، کـە لـە ئـەنجامی کـار و لێکۆڵینەوەیەکی زۆردا، باوەڕی وایە، کە زمانی ئەڤیـستا، زمـانی مادەکانـە. (هـوار) شـیوە زمـانی چـوارینەکانی بابـا تـاهیری لـوڕ، دەباتـەوە بـۆ سـەر ئەڤیستا و هەوڵ دەدات، ئەوە بسەلمێنێ کە چەند شێوەیەك لە شێوە زمانە جۆراوجۆرەکـان، لـە شـوێنە دوور و شـاخاوییەکانی ئێـران، بەتایبـەتی لـە ڕۆژئـاوای ئێرانـدا، واتـە مـاد، (کـە کوردسـتانی ئێـران دەگرێتـەوە) بـەکاردەهێنرێت، لـە ئەڤیـستاوە هـاتوون و دەچـنەوە سـەر ئەڤیـستا، بـەم

شێوه زمانانه دەوترێت (مادی نویٚ) ـ ئینجا هوار دەڵێ: لەم شێوه زمانانەدا (کەر) ڕەگی چاوگی (کردن) و لە ئەڤیستایشدا هەروایە و، وەکو خۆی ماوەتەوە. پرۆفیسۆر ئیدوارد براون لەم بارەیەوە دەڵێ: بەگوێرەی ئەم بۆچوونە زانستییە، توانا و داهێنان و بۆچوونی وردی (هوار)مان بۆ دەردەکەوێت، کە هێشتا لە ئێراندا، چەندەها شێوه زمان هەیە، کە زمانی ئەڤیستامان پێدەناسێنێت و لەوانەیش شێوه زمانی چوارینەکانی بابا تاهیره کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی یانزەهەمی زایین.(٤٠)

لێرەدا چەند نموونەیەکی شیعری شاعیرانمان دەخەینە ڕوو، کە (کەر)ی ڕەگی کۆنیچاوگی (کردن)یان بەکارهێناوە.

بابا تاهیر دەڵێ:

تەکە زوونی بە موو چارە بیا موز

کە ئین تیرە شەوان واکی (کەر)ەم روز(٤١)

واتە: تۆ کە دەزانی چارەیەکم فێر بکە، کە ئەم شەوە تاریکانە لەگەڵ کێ ڕۆژ بکەمەوە.

بشوم ئالا لە زاران دل (کەر)ەم شاد

دیم ئالالە هەم داغی تە دیرە(٤٢)

واتە: بچم بۆ ناو گوڵاڵە زاران دڵ شاد بکەم، بینیم گوڵاڵەیش داغی تۆی پێوەیە.

ز دووشەم باری ئەرباری نەگیری

(کەر)ی سەر باری باروم تاکەی و چەند(٤٣)

واتە: ئەگەر جاریٚ باریٚ لەسەر شانم هەڵنەگریت، تاکەی و چەند باری تر دەخەیتە سەر شانم.

صەیدی هەورامی دەڵێ:

شەماڵ وێت (کەر)ە بە زوانوومن

واچە بە شیرین سۆی چە مانوومن(٤٤)

واتە: ئەی بای شەماڵ بە زمانی منەوە بڵێ بە شیرین: ڕووناکی چاوم.

مەولەوی دەڵێ:

جە دووریت دەروون مەوج دەریای هوون

مدۆ وە چەمدا بـەڵام چێش (کەر)وون[٤٥]

واتە: لە دووریت دەروونم پڕە لە شـەپۆلی دەریـای خـوێن، ئـەو شـەپۆلانە دەدات بە چاوەکانمدا، بەڵام من چی بکەم.

خانای قوبادی دەڵێ:

وێنــەی نیــزامی ســەیقــەل دەر زەینـــم

بە سورمەی دانش ڕەوشەن (کەر) عەینم[٤٦]

واتە: وەکو نیزامی بیر و هۆشم زاخا و بدەرەوە، یان بیر و هۆشم سـاف و بێگەرد بکە، بە کلی زانست چاوم ڕووناك بکەرەوە.

دەبـێ ئـەوە بـزانین کـە جیـاوازیش هەیـە لـە واتـای وشـەی (یاریکـەر) و (یـاریزان)دا، یاریکـەر، ئـەو کەسـەیە کـە یـاری دەکـات، یـان پیـشەی یـاری کردنە، بەڵام یاریزان، ئەو کەسەیە کە یـاری دەزانێـت و مـەرجیش نییـە کـە یــاری بکــات، خــۆ ئەگــەر وشــەی (یــاریزان) بــەکاربهێنرێت بــە مەبەســتی (مـدرّب)ی عـەرەبی، تـا ئەندازەیـەك باشـترە لـەو واتایـەی کـە ئێـستا بـۆی بەکاردەهێنرێت.

ئــەوەی کــە لێــرەدا ســەرنج ڕادەکێـشێ، ئەوەیــە، دەســتکاری کردنــی وشەیەکی کوردی کە مۆرك و ڕەسـەنایەتی پـتر لـە سـێ هـەزار سـاڵ لەمـەو پێشی پێوەیە، گۆڕین و گوم کردنی ئەو تایبەتمەندییە گرنگەی کە هەیـەتی، کارێکی زۆر نابەجێیە و ستەمێکە لە زمانەکەمان دەکرێت.

## پەراوێزەکان

١ـ برهان قاطع ـ باهتمام دکتر محمد معین ـ چاپ دوم ـ ١٣٤٢ به سرمایه کتابفروشی ابن سینا ـ تهران.

٢ـ سەرچاوەی پێشوو.

٣ـ منتخب قابوسنامه ـ باهتمام آقای سعید نفیسی ـ ١٣٢٠ سر آغاز، ص٣٢.

٤ـ فرائد الادب در نظم و نثر منتخب ـ تالیف عبدالعظیم قریب ـ چاپ ششم، تهران، ١٣١٧ ـ ص٨٧ـ ص٨٨.

٥ـ قابوسنامه ـ عنصر المعالی کیکاووس بن اسکندر بن قابوس بن وشمگیر بن زیار ـ باهتمام غلا محسین یوسفی، انتشارات علمی و فرهنگی ـ چاپ نهم، تهران ١٣٧٧، ص١٧ـ ص٢١٧.

٦ـ برهان قاطع.

٧ـ شرح احوال و آثار دو بیتی های بابا طاهر عریان ـ سلسله انتشارات انجمن آثار ملی ـ ١١٣، چاپ دوم، به کوشش دکتر جواد مقصود، ١٣٥٤ خورشیدی، ص١١١.

٨ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل١١٩.

٩ـ شیرین و خوسرەو ـ خانای قوبادی ـ محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانە کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا، ١٩٧٥، ل١٧٧.

١٠ـ گـڕی دەروون ـ د. عابد سیراجەددین نەقشبەندی ـ بەرگی سێیەم، ئامادەکردنی: ئەسعەد نەقشبەندی، کوردستان ـ ٢٠٠٥، ل٨٩.

١١ـ فرهنگ ده هزار واژه از دیوان حافظ ـ باهتمام دکتر ابو الفضل مصفی، شرکت انتشارات پازنگ ـ چاپ اول، تهران ١٣٦٩.

١٢ـ شرح غزلهای حافظ ـ نوشته دکتر حسینعلی هروی، مجلد دوم، نشر تنویر، چاپ پنجم ـ تهران ١٣٧٨، ص١٠٠٠.

١٣ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٠٠٠.

١٤ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ١٧٤٠.

١٥ـ اوستاكهن ترين سرود هاى ايرانيان ـ گزارش و پژوهش: جليل دوستخواه ـ انتشارات مرواريد، چاپ هفتم، ١٣٨٢ تهران، ص٩٨٨ـ ص٩٨٩.

١٦ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٩٨٣.

١٧ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل ١٠٥٨.

١٨ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل ١٠٥٧.

١٩ـ ديوانی گۆران ـ بەرگی يەكەم ـ محەمەدی مەلا كەريم. چاپخانەی كۆڕی زانياری عێراق، بەغدا، ١٩٨٠، ل٢٣٦.

٢٠ـ فرهنگ فارسى ـ دكتر محمد معين ـ شش جلدى ـ موسسه انتشارات امير كبير ـ تهران، ١٣٧٥، چاپ نهم.

فرهنگ بزرگ سخن ـ دكتر حسن انورى ـ تهران ١٣٨٢، چاپ دوم انتشارات سخن.

٢١ـ هەنبانە بۆرينە، فرهنگ كردى ـ فارسى ـ هەژار، چاپ اول: ١٣٦٩ ـ تهران، سروش.

٢٢ـ ديوان گۆران ـ ل١٢٩.

٢٣ـ برهان قاطع.

٢٤ـ شرح و احوال و آثار دو بيتى بابا طاهر عريان ـ ل١١١.

٢٥ـ پەندی پێشينان ـ شێخ محەمەدی خاڵ، چاپی سێيەم، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ـ ٢٠٠٠، ل١٨.

٢٦ـ امثال و حكم ـ على اكبر دهخدا، موسسه انتشارات امير كبير، چاپ سوم، ١٣٥٢، تهران ـ ص٣٤.

٢٧ـ فرهنگ معين.

٢٨ـ سەرچاوەی پێشوو.

٢٩ـ سەرچاوەی پێشوو.

٣٠ـ اوستا ـ جليل دوستخواه، ص٩٨٨.

٣١ـ فرهنگ دانشگر "اعلام" تاليف احمد دانشگر، انتشارات حافظ نوين ـ١٣٧٠.

٣٢ـ برهان قاطع.
٣٣ـ المعجم التركی ـ العربی، تالیف عبداللطیف بندر و د. ابراهیم داقوقی، وزارة الثقافة و الاعلام ـ ١٩٨٢.
٣٤ـ برهان قاطع.
٣٥ـ فەرهەنگی وشە دوانەکانی زمانی کوردی ـ تاهای فەیزی زادە، انتشارات صلاح الدین ایوبی، چاپی یەکەم ـ ١٣٦٧.
٣٦ـ فرهنگنامە شعری ـ تالیف دکتر رحیم عفیفی ـ چاپ دوم سروش ـتهران١٣٦٧.
٣٧ـ پارسی گویان کرد ـ تالیف صدیق صفی زادە (بۆرەکەیی) چاپ اول، ١٣٦٦ـ ص٤٤.
٣٨ـ تاریخ ادبیات ایران ـ یان ریپکاو دیگران ـ از دوران باستان تاقاجاریە، ترجمە: دکتر عیسی شهابی، ص٤٠٤، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ دوم، ١٣١٨ ـ تهران.
٣٩ـ پەندی پێشینان ـ خاڵ، ل٢٣.
٤٠ـ تاریخ ادبی ایران، جلد اول، تالیف پروفیسور ادوارد بروان ـ ترجمە و تحشیە و تعلیق: علی پاشا صالح، چاپ دوم ـ انتشارات کتابخانە ابن سینا ـ تهران ١٣٣٥، ص٤٣ـ ٤٤.
٤١ـ شرح احوال و آثار دو بیتی بابا تاهیر ـ ص١١٥.
٤٢ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٤٦.
٤٣ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل١١١.
٤٤ـ دیوانی صەیدی: ١١١٩ـ١٢٦٥ کۆچی ـ محمد ئەمین کاردۆخی، بە یارمەتی وەزارەتی کاروباری ژووروو ـ ١٩٧١، ل١٤٠.
٤٥ـ دیوانی مەولەوی: حەسەن گۆران، موحەمەدحیجازی، دەزگای ڕۆشنبیری گۆران ـ چاپی یەکەم ـ ٢٧٠٤ کوردی، ل١٩٧.
٤٦ـ شیرین و خوسرەو ـ خانای قوبادی ـ محەمەدی مەلا کریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا، ١٩٧٥ ـ ل١٤.

# سەرچاوەکان

**کوردییەکان:**

١ـ پەندی پێشینان ـ شێخ محەمەدی خاڵ ـ چاپی سێیەم، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ـ ٢٠٠٠.

٢ـ دیوانی صەیدی: ١١١٩ـ١٢٦٥ کۆچی، محەمەد ئەمین کاردۆخی، بە یارمەتی وەزارەتی کاروباری ژووروو، ١٩٧١.

٣ـ دیوانی گۆران ـ بەرگی یەکەم ـ محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠.

٤ـ دیوانی مەولەوی ـ حەسەن گۆران ـ موحەمەد حیجازی، دەزگای ڕۆشنبیری گۆران ـ چاپی یەکەم ـ ٢٧٠٤ کوردی.

٥ـ شیرین و خوسرەو ـ خانای قوبادی ـ محەمەدی مەلا کریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.

٦ـ فەرهەنگی خاڵ ـ نووسراوی شێخ محمدی خاڵ، سلێمانی چاپخانەی کامەران ـ ١٣٩٤ك ـ ١٩٧٤ز.

٧ـ فرهنگ مردوخ ـ مصور ـ کردی، فارسی، عربی ـ تالیف: فاضل شهیر حضرت آیت الله آقای شیخ محمد مردوخ کردستانی ـ ناشر: غریقی سنندجی. چاپخانه حیدری ـ بهار ١٣٦٢.

٨ـ فەرهەنگی کوردستان ـ گیو موکریانی ـ ١٩٩٩ ـ دەزگای ئاراس.

٩ـ فەرهەنگی وشە دوانەکانی زمانی کوردی ـ تاهای فەیزی زادە ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ چاپی یەکەم، ١٣٦٧.

١٠ـ گڕی دەروون ـ د. عابد سیراجەددین نەقشبەندی ـ بەرگی سێیەم، ئامادەکردنی ئەسعەد نەقشبەندی، کوردستان، ٢٠٠٥.

١١ـ هەنبانە بۆرینە، فرهنگ کردی ـ فارسی، هەژار، چاپ اول، ١٣٦٩تهران ـ سروش.

**فارسییەکان:**

١٢ـ امثال و حکم ـ علی اکبر دهخدا ـ موسسه انتشارات امیر کبیر، چاپ سوم، ١٣٥٢، تهران.

١٣ـ اوستا کهن ترین سرودهای ایرانیان، گزارش و پژوهش جلیل دوستخواه، انتشارات مروارید، چاپ هفتم، ١٣٨٠ تهران.

١٤ـ برهان قاطع ـ باهتمام دکتر محمد معین ـ چاپ دوم ـ ١٣٤٢ به سرمایه کتابفروشی ابن سینا ـ تهران.

١٥ـ پارسی گویان کرد ـ تالیف صدیق صفی زاده (بۆرەکەیی) چاپ اول.

١٦ـ تاریخ ادبیات ایران ـ یان ریپکاو دیگران ـ از دوران باستان تاقاجاریه، ترجمه: دکتر عیسی شهابی، ص٤٠٤، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، چاپ دوم، ١٣١٨ ـ تهران.

١٧ـ تاریخ ادبی ایران، جلد اول، تالیف پروفیسور ادوارد بروان ـ ترجمه و تحشیه و تعلیق: علی پاشا صالح، چاپ دوم ـ انتشارات کتابخانه ابن سینا ـ تهران ١٣٣٥.

١٨ـ شرح احوال و آثار دو بیتی های بابا طاهر عریان ـ سلسله انتشارات انجمن آثار ملی ـ ١١٣، چاپ دوم، به کوشش دکتر جواد مقصود، ١٣٥٤ خورشیدی.

١٩ـ شرح غزلهای حافظ ـ نوشته دکتر حسینعلی هروی، مجلد دوم، نشر تنویر، چاپ پنجم ـ تهران ١٣٧٨.

٢٠ـ فرائد الادب در نظم و نثر منتخب ـ تالیف عبدالعظیم قریب ـ چاپ ششم، تهران، ١٣١٧.

٢١ـ فرهنگ بزرگ سخن ـ هشت جلدی ـ دکتر حسن انوری، تهران ١٣٨٢، چاپ دوم، انتشارات سخن.

٢٢ـ فرهنگ دانشگر "اعلام" تالیف احمد دانشگر، انتشارات حافظ نوین ـ١٣٧٠.

۲۳ـ فـرهنگ ده هـزار واژه از دیـوان حـافظ  ـ باهتمـام دکـتر ابـو الفـضل مـصفی، شرکت انتشارات پـازنگ ـ چاپ اول، تهران ۱۳٦۹.
۲٤ـ فـرهنگ فارسـی ـ دکـتر محمـد معـین ـ شـش جلـدی ـ موسـسه انتـشارات امـیر کبیر ـ تهران، ۱۳۷۵، چاپ نهم.
۲۵ـ فرهنگنامه شعری ـ تالیف دکتر رحیم عفیفی ـ چاپ دوم سروش ـ تهران۱۳٦۷.
۲٦ـ قابوسنامه  ـ عنصر المعالی کیکاووس بن اسکندر بـن قـابوس بـن وشمگـیر بـن زیار ـ باهتمام غـلا محـسین یوسـفی، انتـشارات علمـی و فرهنگـی ـ چـاپ نهـم، تهران ۱۳۷۷.
۲۷ـ منتخب قابوسنامه ـ باهتمام آقای سعید نفیسی ـ ۱۳۲۰ سر آغاز، ص۳۲.

**توركییه‌كان:**

۲۸ـ المعجم الترکی ـ العربـی، تـالیف عبـداللطیف بنـدر و د. ابـراهیم داقـوقی، وزارة الثقافة و الاعلام ـ ۱۹۸۲.

# ملخص البحث

## شرح وتجزئة ومقايسة لمجموعة من المفردات

د. محمد نوري عارف

البحث دراسة لمجموعة من المفردات والمصطلحات اوردتها كنماذج مختارة ضمن هذه الدراسة المختصرة، علماً بأن الكثير منها مفردات مركبة او مشتقة ترجع الى اصول عربية او فارسية او اشتقت مشوهة من اللغة الكردية او كردية اصيلة.

إنّ الباحث قارن شارحاً بعض هذه المفردات مع اللغات الهندو- اوربيه موضحاً التغييرات التي طرأت عليها علماً ان بعض هذه المفردات يرجع تاريخها الى ماقبل الاسلام والميلاد مما يثبت لنا قِدَم واصالة اللغة الكردية.

Abstract

**A comparative study of a group of words**

**Dr. M. N. Arif**

The study is about a list of words and terms, mentioned as pattern, though most of them are derivational or compound words of Arabic or Persian origin, even some of them are originally Kurdish or derived distortedly from Kurdish.

The researcher compares these words with Indo-European group of languages shedding light upon changes and modifications came about.

Some of these words have been used before Islam which proves the authenticity and antiquity of our language.

## کورد له بەڵگەنامەی قاجاریدا
## "شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری: ۱۸۸۰"
## إفتتاح ناصری


نووسینی: عەلی ئەکبەر سەرهەنگ

۱۳۹۸ کۆچی — ۱۸۸۰ ز

و: له فارسییەوە

**محەمەد حەمە باقی**


بەرایی- ۱ - ئەگەر مەڵبەندە زۆر و جیاجیاکانی کۆکردنەوە و پاراستنی بەڵگەنامەی مێژوویی له ئێراندا، ئامارێکی زۆری بەڵگەنامەی هەمەبابەتەی ژیانی کوردیان تێدا پارێزراو بێ، بەڵام له ناو ئەو بابەتانەدا، هیچ بابەتێکیان ئەوەندەی بابەتی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (۱۸۸۰ز) زۆر نین، چونکه هێشتا هیچ یەکێك لەو چەندین ڕاپەڕین و شۆڕش و بزووتنەوە ئازادیخوازانەی گەلی کورد (که له سەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویانداوە)، بەئەندازەی شۆڕشی ساڵی (۱۸۸۰ز)، له لایەن شا و سوڵتانی دەوڵەتانی دراوسێ و سیاسەتمەدارانی دنیاوە، جێی گرنگیی پێدان و هەڵوێست وەرگرتن و سەرنج لێدان نەبوون و له هەمان کاتیشدا هیچیان ئەوەندەی ئەم شۆڕشە، ڕاپۆرت و نووسین و لێکۆڵینەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییان له لایەن نووسەرانی بیانی و کوردەوە له بارەوە نەنووسراوە و هیچیشیان ئەوەندەی ئەم شۆڕشە و ڕابەرەکەی، بەڵگەنامەی له ئەرشیفەکانی دنیادا له دوا بەجێ نەماوە، که بێگومان هۆی سەرەکی ئەم گرنگیی پێدان و نووسینە زۆرە؛ هەر دەگەڕێتەوە بۆ جۆری بەرنامە و سیستەم و هەڵبژاردنی جوگرافیای ڕاپەڕینەکه و جۆری هەڵکەوتن و بیرکردنەوەی تازە و هاوچەرخانەی ڕابەرە هۆشیارەکەی، که شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە.شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، که له دوا چارەکی سەدەی نۆزدەهەمدا، وەك ڕابەرێکی ئایینی و سیاسەتمەدارێکی سەردەمی تازە، دەدرەوشێتەوە؛ کۆمەڵگەی کوردی، لەوپەڕی ژێردەستیی و پەرتەوازەیی و لێکدابڕان و هەژاریی و ژێر باری

زوڵم و زۆرداریی و باج و سەرانە و بێ کاریی هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانیـدا دەینالاند. هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانیش، کە نزیکەی چوار سەدە، لە ململانێ و شـــەڕێکی پـــچڕ پـــچڕی بەردەوامـــدا دەژیـــان، لـــە لایەکـــەوە زۆربـــەی شـــەڕ و بەیەکدادانــەکانیان لەســەر خــاکی کوردســتان و لەســەر ئەســتۆی مــەزنان و ئێــڵ و جەماوەری کوردستان بووە؛ کە جەماوەری کوردیش بەئارەزووی خۆیان بووبێت، یان بەزۆرەملێ، لەم شەڕانەدا تێوەگلاون و بوونەتە سووتەمەنی و پاشکۆی یـەکێك لـەم دوو دەوڵەتــە و چـونکە کوردســتانیش کـەوتبووە نێـوان هـەردوو دەوڵەتــەوە، بـوو بەیـەکێك لـە ڕێگـە سـەرەکییەکانی لەشکرکێشییە گـەورەکانی هـەردوو دەوڵـەت، بـۆ پەلاماردانی شار و مەڵبەندە ستراتیژی و گرنگەکانی یەکتری. لە ئـەنجامی ئەمەشـدا، ئاوایییـەکانی کوردسـتان وێـران بـوون، سـامانی بـەتالانی لەشـکری داگیرکـار دەبـرا. بەروبوومی کشتوکاڵ و ئـاژەڵی دەفـەوتا، زەرەری گیـانیی زۆری لـێ دەکـەوت.(١) ئـەم داروبارەش هەمیشە کوردستانی کردبووە مەیدانێکی وێرانە و کاولی زۆرانبازیی ئـەم دوو دەوڵەتــە زلهێــزە و ئەمــەش هەمیــشە دەبــووە مایــەی زیــاتر دواکــەوتنی بــاری ئـابووری، کۆمەڵایـەتی، فەرهـەنگی و سیاسـی" کۆمەڵگـەی کـوردەواری؛ کـە سـەرەڕای ئەمانەش، هەر ئەم دوو دەوڵەتە، لە دوای هـەموو شـەڕ و بەیەکـدا هەڵپژانێکدا؛ کـە بەرێگەی ڕێکەوتننامە و پەیماننامـە، دوایـی هـاتووە، ئاکامـەکانی مـەرج و داخـوازیی هەریەکەیان لەوی تر؛ بەبارێکی گرانتر، بۆ سەر کوردستان گەڕاوەتـەوە.لـە سـەرەتای سەدەی پازدەهەم و دروستبوونی دەوڵەتی ئێران؛ واتـە: دەوڵـەتی سـەفەوی (١٥٠١ز) و هەوڵدانی شا ئیسماعیلی یەکەم (١٤٨٧ز — ١٥٢٤ز)، بۆ فراوانبوونی سنووری دەسەلاتی، بەهـەر چـوار دەوری دەوڵەتەکەیـدا و بـۆ پەرەپێـدان و بـەزۆر سـەپاندنی مەزهـەبی شـیعە (کـە لـە یەکـەمین ڕۆژی شـاهێتی خۆیـەوە، شـیعەی کـردە مەزهـەبی ڕەسمیـی دەوڵــەت)، لــە زســتانی ١٥٠٦ بــەدواوە، لــەو هێــرش و لەشکرکێــشییەدا، کــە بــەناو کوردستاندا بۆ سەر دیاربەکر و مووسڵ و بەغـدا (١٥٠٨) و لوڕسـتانی کـرد و داگیر و کـاولی کـردن؛ دەسـتی لـە هـیچ نەپاراسـت و قـەتڵوعامێکی ڕەشـۆکییانە و بـەربلاوی موسـڵمانانی سـوننی مەزهـەبی کـرد.(٢)ئـەم کارانـەی شـا ئیـسماعیل، هەڕەشـە و

مەترسییەکی ڕاستەوخۆی بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست کرد و سوڵتان سەلیم (١٥١٢ — ١٥٢٠ز)ی عوسمانیش لە ساڵی ١٥١٤ز- دا، بەلەشکرێکی گەورەوە، کە بەشێکی کوردی سونی مەزهەب بوون؛ ئەویش هەر بەناو کوردستاندا هێرشی بردە سەر تەورێز، (ناوەندی دەسەڵاتی سەفەوی) و سەرانی لەشکری سەفەویش، بۆ بەرگری لە هێرشەکە، بەهێزەکانیانەوە کشانەوە دواوە و لە دوای خۆیشیانەوە، هەموو ئەو ناوچانە، واتە: (کوردستان)یان سووتاند و کاول کرد، تا لەشکری عوسمانی نەتوانێ خۆراکی لەشکر و تفاقی بارەبەرەکانی لێ دابین بکات.(٣)ئەم دوو لەشکرە، لە دەشتی (چاڵدیران)ی باکووری خۆرئاوای زەریاچەی (ورمێ) بەیەکدا هەڵپژان و دوای شەڕ و کوشتارێکی زۆر، لەشکری سەفەوی شکا و لە ئەنجامی ئەم شەڕەشدا بەشێکی زۆری خاکی کوردستان، کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی"سەرەڕای ئەمەش؛ لە سۆنگەی پشتیوانیکردنی کوردانی سونی، لە دەوڵەتی عوسمانی، لە دژی دەوڵەتی شیعەی ئێرانی؛ شاکانی بەرودوای ئێران، ڕقێکی ئەستوور و مێژینەیان لە کورد هەڵگرت و بەڕێوەبردنی هەندێ لە میرنشینە میرایەتییەکانی کوردیان لە مەزنەکانی کورد سەندەوە. بەڵام بەپێچەوانەوە سوڵتان سەلیم، لە بەرامبەر ئەم پشتیوانییەی کورد، بەڕاوێژی زانای ناوداری کورد؛ ئیدریس بدلیسی (١٤٥٢ — ١٥٢٠ز)، بەڕێوەبردنی میرنشینە میرایەتییەکانی کوردی بەمیرەکانی کورد سپاردەوە.نموونەی ئەمجۆرە زنجیرە جەنگ و کاولکارییە، کە نزیکەی بیست ساڵێك لە نێوان سەفەوی و عوسمانیدا خایاندی؛ لە ئاکامدا بەڕێکەوتننامەی: ئەماسیە (١٥٥٥ز)ی نێوان شا تەهماسب (١٥٣١ — ١٥٧٦ز) و سلێمان قانوونی (١٥٢٠ — ١٥٦٦ز) دوایی پێ هێنرا، کە بەگوێرەی بەندەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە، کوردستان بەسەر هەردوو دەوڵەتدا ،دابەش کرا و بەمەش چەندان میرنشینی خۆجێیی نیمچە سەربەخۆی کورد (کە پێشتر هەبوون)؛ ئەوانەی بەری خۆرئاوا و باشووری کوردستان، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و ئەوانەی بەری خۆرهەڵاتیش، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سەفەوی.خاڵە سەرەکییەکانی ڕێکەوتننامەی (ئەماسیە) لە سەردەمەکانی داهاتوودا و پاش دروستبوونەوەی هەموو زنجیرە شەڕێکی تازەی نێوان ئێران و عوسمانی و

دەستپێکردنەوەی هەموو دانووساندنێکی ئاشتی؛ دەکرانە بنچینەی گفتوگۆ، بۆ ڕێکخستنی ڕێکەوتننامەی تازە.بەڵام ڕێکەوتننامەی لەمە ترسناکتر و دوای نزیکەی ٤٨ ساڵ شەڕ و بەیەکدادانی ناوبەناوی لەشکری عوسمانی و ئێران، ڕێکەوتننامەی ساڵی (١٦٣٩ز) بوو، کە بەڕێکەوتننامەی (زەهاو) بەناوبانگە و بەسەرەتای یەکەمین دابەشکردنی کوردستان دەژمێردرێ. چونکە لەم ڕێکەوتننامەیەدا ئەو سنوورەی هەردوو دەوڵەت لەسەری پێکهاتبوون، لە ئاخسقەوە، لە قەفقاس بەناو مەڵبەندەکانی؛ کارس، وان، شارەزوور، بەغدا، بەسرا، تا سەر ئاوی کەنداو، بەناوجەرگەی خاکی کوردستاندا ڕادەبوورد و کوردستانی بەدوو بەشەوە دەکرد(٤).دوای زنجیرە شەڕێکی تریش، ڕێکەوتننامەی (١٧٤٦)ی نادر شا (١٦٨٨ — ١٧٧٤ز) و ڕێکەوتننامەی یەکەمی ئەرزەڕۆم (١٨٢٣ز) و ڕێکەوتننامەی دووەمی ئەرزەڕۆم (١٨٤٧ز) بەهەمان شێوە لە نێوان ئێران و عوسمانیدا دووپاتە دەبێتەوە.بەڵام لە نێوان ئەم دوو ڕێکەوتننامەیەی دوایی و ڕوونتر، لە چارەکی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە، کە ئەم ڕێکەوتنانە بوونە هۆی خاوبوونەوەی گرژیی نێوان عوسمانی و قاجاری و کەمتر کاریان بەکورد ما؛ ئیتر لە لایەکەوە: سولتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨ — ١٨٣٨ز) و سولتان عەبدولمەجید خان (١٨٣٩ - ١٨٦١)؛ هەموو میرایەتییە ئۆتۆنۆمییەکانی کوردستانی عوسمانی: سۆران (١٨٣٧)، بابان (١٨٥١)، بادینان (١٨٣٤)، هەکاری (١٨٤٨)، بۆتان (١٨٤٨)، بتلیس (١٨٤٩) و لە لایەکی تریشەوە محەمەد شای قاجار (١٨٣٤ - ١٨٤٧) میرایەتییە ئۆتۆنۆمەکانی کوردستانی ئێران: ئەردەڵان، لوڕستان و موکریانیان بەرودوا بەلەشکرکێشی و زنجیرەشەڕ و تێهەڵچوونێکی خوێناوی و کاولکاری تێکدا و لە جێی ئەوان، دەسەڵاتی ناوەندی عوسمانی و قاجارییان تێدا دامەزراندن. بەمەش ئەو هەندە ئازادییەی هەردوو بەشی کوردستانی بندەستی قاجاری و عوسمانی هەیانبوو، لە دەستیان دا و وەك "کریس کۆچێرا" دەڵێ: "کوردیان بێ سەر هێشتەوە" و (٥) هەردوو دەوڵەتەکەش لە جێی ئەو میرنشینانە، کاربەدەستی ناکوردیان دامەزراند، کە ئەم کاربەدەستانە بێ ئەوەی لە تایبەتمەندییەکانی: فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، مێژوویی" کۆمەڵگەی

کوردســتان تێبگــەن، کەوتنــە بــەڕێوەبردنێکی نەشــارەزایانە و بــێ بەزەیییانــە و زاڵمانــەی کوردسـتان و بـەئارەزووی خۆیـان و بـێ پـەروا دەسـەڵاتی چەوسـێنەرانەی خۆیــان و بــاج و ســەرانەی زۆرتریــان، ڕۆژ دوای ڕۆژ هەڵکــشاوتر دەکــرد، چــونکە ئەگەرچی ئەم میرنشینانەی کورد، بەهۆی دابەشبوونی سیاسی کوردستان بەسەر دوو دەوڵەتی ناکۆکی سونی و شیعەدا، کە دوو زمانی ڕەسمیی جیاواز و دوو فەرهەنگی جیـاواز و پێـڕەوی دوو جـۆر ڕێکخـستنی سیاسـی، کۆمەڵایـەتی، ئـابووری جیـاواز و تۆپۆگرافی نالەباری ئـەرزی کوردسـتان و" نـەیانتوانیبوو هـەنگاوی بـەرەو هاوکـاری و یـەکێتی و یـەکبوون و داڕشـتنی کـار و بەرنامـەی هاوبـەش هـەڵبگرن و زۆر جـاریش بەدنەدان و نەخشەی سـەرانی عوسمـانی و ئێـران؛ شـەڕ و بەیەکـدادانی خوێناوییـان لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکانی خۆیشیاندا کردووە؛ بەڵام لە هـەمان کاتیشدا، ئەم میرنشینانە لە زۆر سەردەمدا سەرومڕ لە پێناوی دروسـتکردنی نیمـچە سەربەخۆییەکی ناوچەیی و پاراستنی داد و ئاسایش و ئازادی دانیشتووانی سنووری ناوچــەکانیان و پارێزگــاری کــردن و گەشەســەندنی فەرهــەنگ و ئــەدەب و داب و نەریتی کوردەواریدا، لەشکری ڕێکخراو و چەکدار و ئیدارەی چەسپاویان هـەبووە و هەندێکیــشیان پــارە و ســکەیان بــەناوی خۆیانــەوە لێــداوە و لــە نوێــژی ڕۆژانــی هەینیشدا، لەجیاتی ناوی سوڵتانی عوسمانی، نـاوی میرەکـان هێنـراوە و زۆر جـاریش هەستی پاکی نەتەوەیی و نیشتمانیی، هانیداون بۆ تەقەللای خۆ ڕزگارکردن لەو دوو هێـزە و پێکهێنـانی قـەوارەی گـەورەتری سـەربەخۆیی، کـە ئەمـەیان بەئاشـکرا، لـە سـەرەتای چارەکی دووەم، تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهـەم، لـە چـەندان ڕاپـەڕین و یـاخیبوونی پـچڕ پـچڕ و ناوچـەیی میرنـشینەکانی: بۆتـان، سـۆران و بابانـدا خـۆی نوانـدووە" بۆیــە لــەناوبردنیان بۆشـاییەکی گـەورە و ئاشـکرای لـە دڵ و دەروونـی مرۆڤی کورد و هەمەلایەنەی کۆمەڵگەی کوردیـدا دروسـت کـردووە و لـەو بۆشـاییە گەورەیەشدا، کە نزیکەی چل ساڵێکی خایاندووە، دەسەڵاتی بێگانە؛ چەوسـاندنەوە و بێـدادی و زوڵمـی زۆرتـری هێناوەتـە ناوچـەکانیان و شـیرازەی ئاسـایش و ئـۆقرەی ناوچەکانیشیان هەر بەرەو شێواوتر و دواکەوتووتر چووە.ئەم داروبارە، وەك "وەدیع

جویده" دەڵێ: زەمینەی بۆ دەرکەوتنی "شێخ"ەکان وەك ڕێبەرانی سیاسی خۆش کرد، کە دوای سەرکوت و هەڵوەشاندنەوەی میرنشینەکان و ئاکامەکانی(٦) ئەو سەرکوتکردنە، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٣٠ – ١٨٥٣ز) بەهۆی بنکەیەکی بەربلاو و پێشینەی ئایینی بەهێز و زیرەکیی دووربینانەی خۆی و لە ئاکامی بەتەنگەوە هاتن و بەپیرەوەچوونی داخوازیی و تەنگوچەڵەمەکانی خەڵکی کوردستانەوە، لە دەیەی (١٨٧٠ – ١٨٨٠ز)دا دەبێتە بەرجەستەترین کەسایەتی مەزن و درەوشاوەی کوردستان و جەماوەریش وەك دەرەتان و بانگەوازێکی تازە و ڕزگارکەر بۆی بنوارێ و هیوای بەرنامە و ئامانجی سیاسی و چارەی کێشەی ڕەوای کوردی لێ بخوازن.دەرکەوتنی شێخ عوبەیدوڵڵا، وەك کەسایەتییەکی دیار؛ نیشانەی هۆشیاری زۆرتری میللی گەرایی (ناسیونالیست)ی کوردە(٧).هەرچەندە پێشتریش هەستی میللی گەرایی لە ناو کورددا هەبووە، (بەڵام قسە ڕاشکاوەکانی شێخ، کە دەیوت: نیازی وایە کوردستانێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ؛ مەبەستی ئەوە بوو، ئەو حکومەتەی بەنیازە دایمەزرێنێ؛ زۆر جیاوازتر دەبێ لەوانەی پێشووتری خۆی؛ واتە: کەسانی وەك (میر بەدرخان بەگی بۆتان، کە مەبەستەکانی هەر لە بازنەی خودموختاریدا دەسووڕانەوە و(٨) لە دەیەی (١٨٢٠)، تا دەیەی (١٨٤٠) سەرومڕ حوکمی بەسەر چەندان ناوچەی خۆرهەڵاتی تورکیا و باکووری خۆرهەڵاتی (ئێستای) عێراقدا دەکرد و هەمان ئەو ناوچانە، دواتر کەوتنە ناو قەڵەمڕەوی حوکمی شێخ عوبەیدوڵڵاوە.بۆیە "وەدیع جویدە" پێی وایە: "دەرکەوتنی شێخ عوبەیدوڵڵا، دەرکەوتنی جۆرە ڕابەرایەتییەکی نوێیە لە ناو کورددا. بەواتە: شێخ عوبەیدوڵڵا یەکەمین و ڕەنگە گەورەترین ڕێبەری ئایینی - سیاسی کوردستان بێت."شێخ عوبەیدوڵڵا لە بەردەم گێروگرفتی کەڵەکەبووی خەڵك و زوڵمی بەردەوامی کاربەدەستانی قاجاری و عوسمانیدا، بەئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی ڕێگەچارەیەك بۆ ڕزگاری خەڵك بدۆزێتەوە.لەم پێناوەشدا کە بەمێژووی شۆڕش و ڕاپەڕینە بەرودواکانی کورددا دەچێتەوە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی دەبێ شێوازێکی تازەی خەباتی ڕزگاری بگیرێتە بەر و هاوکاتیش لە دەیەی (١٨٧٠ - ١٨٨٠)دا، گەلانی

ئـەوروپا لـە بوارەكـانی ئـابووریی، سیاسـیی، فەرهـەنگیی و سـپاییدا، بـەخێرایی لـە پێشكەوتندا بوون و (نەتەوە) دەبووە بنچینەی دروستكردنی دەوڵەت و لەم بوارەشدا گەلانی باڵكان بەهۆی پشتیوانیی ڕووسیاوە توانییان دەوڵەتی نەتەوەیی پێك بهێـنن؛ كە بەچاولێكەریی لەم دەرفەت و تاقیكردنەوەیە، گەلی ئەرمـەنی هاوسـێی دێرینـەی كورد، لە دوا جەنگەكانی نێوان ڕووسیا - عوسمانیدا و بەتایبەتیش لە جەنگی ١٨٧٧ - ١٨٧٨، بەنهێنی و بەئاشكرا پـشتیوانییان لـە هێرشـی لەشـكری ڕووسـیا، دژی دەوڵـەتی عوسمانی كرد و بەپێچەوانەشەوە گەلی كورد لە هەمان ئەو جەنگانە و بەتایبـەتیش لـە دوا جـەنگی ڕووسـی - عوسمانیـدا، شـێخ عوبەیـدوڵلا بـەدەم بانگـەوازی (غـەزا و جیهـاد)ی دەوڵـەتی عوسمانییـەوە دەچـێ و پـشتیوانیی لـە لەشـكری عوسمـانی دژی ڕووسیا دەكات و جەنگەكـەش بەتێـكشكاندنێكی گـەورەی دەوڵـەتی عوسمـانی دوایـی دێت و بەدوای خۆیدا برسێتیی و هەژاریی و قاتوقڕیی و نەخۆشـیی و پەتایـەكی لـە ڕادەبەدەر دەهێنێ و دەبێتـە مایـەی بێزاریـی و یـاخیبوون و ڕاپـەڕینی جـەماوەر لـە زۆر جێگەی ئیمپراتۆری عوسمانیدا و لە هەمان كاتیشدا هـەر دوا بـەدوای بڕانـەوەی جـەنگ، لـە سـەرەتای بـەهاری ١٨٧٨ و لـە هـەردوو ڕێكەوتننامـەی سـان سـتیڤانۆ (١٨٧٨/٣/٣ز) و بـەرلین (١٨٧٨/٧/١٣ز)دا، كـە ئاكامـەكانی جەنگەكـە سـەروبەر دەكـەن، ڕووسـیا لـە پاداشـی ئـەو چاكەیەدا، كـە گـەلی ئەرمـەن بەرامبـەری كـردووە، بەسـەر توركیاوە دەیكاتە مەرج، كە دەبێ ریفـۆرمێكی شـێوە ئۆتۆنـۆمی لـە ناوچـە ئەرمـەن نـشینەكاندا بـۆ گـەلی ئەرمـەن جێبـەجێ بكرێ و بـەو پێیـەش كـە ئـەو شـوێنانەی ئەرمەنەكان دەیانویـست ئۆتۆنـۆمی تێـدا جێبـەجێ بكەن، زۆربـەی كوردنـشینەكانی قەڵەمڕەوی عوسمانی بوو؛ ئەمـەش هەڵوێـستێكی دژواری بـۆ كـورد دروسـت دەكـرد. چونكە دوای ئەوەی ڕووسیا و ئینگلستان ئەم مەرجەیان لـە بەنـدی (١٦)ی كۆنگرەی بەرلیندا دەچەسپێنن، دەوڵەتانی ئەوروپا و بەتایبەتیش ئینگلـستان پـشتیوانیی ئـەم مەرجـە دەكـەن و گوشـاری جێبـەجێكردنی بـۆ سـەر عوسمـانی دەبـەن.دەولـەتی (عوسمانی)ش لەمە زۆر بێزار و تووڕە دەبێ و گەلی ئەرمەن بەمایەی دەستێوەردانی وڵاتانی ئەوروپا لە كاروباری ناوخۆی دەزانێ و بـەدوای ڕێگەچارەیەكدا دەگـەڕێ، تـا

تۆڵە لە ئەرمەن بکاتەوە. بەڵام چونکە لەو کاتەدا وڵاتانی ئەوروپا پشتیوانییان لە ئەرمەن دەکرد، نەیدەوێرا خۆی ڕاستەوخۆ تۆڵەیان لێ بکاتەوە، بەڵکو دەیویست دەرفەتی ئەو هەڵچوون و خرۆشانەی گەلی کورد بقۆزێتەوە، کە کێشەکەی لەگەڵ کێشەی ئەرمەندا ئاوقای یەکتر دەبوون و بەمەش لە یەك کاتدا دوو نیشانی پێکەوە دەپێکا و کوشتاری گەورە و خوێناوی لە نێوانیاندا ڕووی دەدا.شێخ عوبەیدوڵڵاش بۆ بەپیرەوەچوونی ئەم بارودۆخە نوێیە، لە بەهاری ١٨٧٨دا بانگهێشتنی سەرانی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بۆ بارەگاکەی خۆی لە نەهری دەکات و دوای زنجیرەکۆبوونەوەیەکی بەردەوام، کە چەندان مانگ دەخایەنێ، بەڕابەری و ڕێنوێنی شێخ عوبەیدوڵڵا چەند بڕیارێکی گرنگ دەدرێ: ١- کاری سیاسیی و ناساندنی کێشەی ڕەوای کورد بە دەوڵەتان دەست پێ بکرێ، بۆ ئەوەی بەر لە کۆکردنەوەی هێز و لەشکر، بەڕێگەی دیالۆگ و ناردنی نوێنەر و نامە بۆ لای باڵوێز و نوێنەرانی ئەوروپا و ڕووسیا و تەنانەت بۆ لای سەرانی قاجاری و عوسمانی؛ کێشەی ڕەوای کوردیان بخرێتە بەردەم و ئەو وێنە بەزۆر ناشیرین کراوەی کورد، جوانتر نیشان بدەن، کە گەلی کورد نەتەوەیەکی ئازادی و ئاشتیخوازە و نایەوێ زیانی بۆ هیچ کەس هەبێ و بۆ ئەوەش دڵنیابن شیاوی ئەوەیە، خۆی کاروباری خۆی بەڕێوە ببات، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەرفەتێك بەکورد بدرێ و تاقی بکرێتەوە. ئەوسا ئەگەر نەیتوانی خۆی بەڕێوە ببات، یان زیانی بۆ دەرودراوسێی هەبوو، ئەوا ئامادەیە لە دادگاریەکی نێودەوڵەتیدا دادگایی بکرێت. ٢- یەکەمین ڕێکخراوی سیاسیی کوردی، بەناوی (یەکێتی کوردان)، یان (کۆمەڵی کوردان) دروست بکرێ. ٣- خەبات بۆ ڕزگاری لە دەسەڵاتی عوسمانی و قاجاری دەست پێ بکرێ و لە هەردوو ئەو بەشەی کوردستاندا، دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد دروست بکرێ.بۆ ئەنجامدانی ئەم بەرنامەیەش، لە سەرەتادا شێخ عوبەیدوڵڵا بەرنامەی ڕزگارکردنی کوردستانی بندەستی عوسمانی هەبوو. بەڵام دوای هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی کوردستان و بەو هۆیەوە کە دەوڵەتی عوسمانی، تازە لە جەنگێکی دۆڕاو ببۆوە و لەبەر زۆر هۆ (کە ئێرە جێی نییە)، (٩) بەچاك زانرا لە پێشدا شۆڕش لە کوردستانی ئێرانەوە دەست

پێ بکرێ و دوایی دەست بەئازادکردنی کوردستانی عوسمانیش بکرێ.لەم پێناوەدا لە کۆتایی مانگی (٩) و سەرەتای (١٠/١٨٨٠ز)دا، لە دووقۆڵەوە لەشکری پێکهاتووی کورد لـە جـەماوەری هـەموو ناوچـەکانی کوردسـتان، کـە نزیکـەی (٤٠ تـا ٥٠) هـەزار کـەس بوون، بەنیازی گرتن و ئازادکردنی کوردستانی ئێران، هێرشیان بـۆ سـەر ناوچـەکانی موکریان و ئازەربایجان و ورمێ برد و لە سەرەتای هێرشدا لە قۆڵی موکریانـەوە، کـە شێخ عەبـدولقادر و هـەمزاغای مـەنگوڕ سـەرکردایەتییان دەکـرد، لـە ماوەیـەکی زۆر کورتدا توانییان ناوچەیەکی فراوان: شـنۆ، نەغـەدە، سـابلاخ، میانـدواو، ئـازاد بکـەن. بـەهیوای پێکهێنـانی دەوڵـەتی کوردسـتان، کاربەدەسـت بـۆ ناوچـە ئازادکراوەکـان دادەنـێن.لـە قـۆڵی (ورمـێ)ش کـە شـێخ عوبەیـدوڵڵا خـۆی سـەرکردایەتی دەکـرد و بەرنامەی گرتنی شاری ورمێی بوو، لە هەفتـەی دووەم و سـێیەمی تـشرینی یەکـەمی (١٨٨٠ز)دا، بەرەیـەکی تـری لـە دەوری شـار و قـەڵای ورمـێ کـردەوە و دوای هێـرش و پەلامار و شەڕ و تێهەڵچوونێکی سـەخت و خوێنـاویی، کـە نزیکـەی مـانگ و نیـوێکی خایانـد، هـەردوو قۆڵەکـەی موکریـان و ورمـێ، نـەیانتوانی مەبەسـتەکانی خۆیـان جێبەجێ بکەن و هەردوو هێزەکە بەتێشکاویی بـەرودوا، لـە دوای هەفتـەی یەکـەمی مـانگی (١١/١٨٨٠ز) بـەرەو مەرگـەوەڕ و دواتـر بـەرەو نـەهری پاشەکـشێ دەکـەن.لـەم شەڕانەدا، سەرەتا هەموو دانیشتووانی ناوچە عەجەم نشینەکانی میانـدواو، مەراغـە، بنـاو و ورمـێ و دواتـریش هـەموو لەشـکر و هـەموو سـەرانی بەرجەسـتەی لەشـکری ئێرانی، لە سەرتاسـەری ئێرانـەوە بەپەلـە کۆکرانـەوە و ڕەوانـەی قۆڵـەکانی ڕاپـەڕین کران و بەڕقێکی ئەستوورەوە، دژی هێزەکانی کورد شەڕیان کرد" پێ بەپێی ئەمەش، دەربـاری قاجـاری بەپەلـە و پـەژارەوە کـاری دیپلۆماسـی بـۆ ڕازیکردنـی ڕووسـیا و ئینگلستان دەستپێکرد؛ تا ڕووسیا لەشکر بگەیەنێتـە سـنوورەکانی ئێـران - تورکیـا و هاوکـاتیش ڕووسـیا و ئینگلـستان گوشـار بخەنـە سـەر تورکیـا، تـا لـە سـەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکـەدا بەشـدارییان بکـات.ئـەم شۆڕشـە، جگـە لـەوەی لەبـەر زۆر هـۆ، بـۆ ناوچـەکانی ئـەردەڵان و کرماشـان و هـەورامان نەتەنییـەوە و نـەبووە ڕاپـەڕینێکی سەرتاسەری هەموو کوردسـتانی بندەسـتی قاجاری، لـە هـەمان کاتیـشدا هـەموو ئـەو

ناوچـانەش کـە ئـازاد کرابـوون، بـەزوویی لـە لایـەن هێزەکـانی دەوڵـەتی ئێرانـەوە سـەندرانەوە؛ کـە ئەگـەر هۆیـەکانی تێـشکانی سـەربازییانەی شۆڕشـەکە بەسـەر بکەینـەوە، بـەم ئەنجامانـە دەگـەین: ١- هەبئـەتی ئـەرکان، یـان سـەرکردایەتییەکی شارەزای زانستەکانی جەنگ و تەجرەبەی جەنگینی نیزامـی نـەبوو. ٢- لـە دەسـتە و تیپی لەیەکچوودا، بێ گوێدانە خێڵ و ناوچە، کۆ نەکرابوونەوە و رێك نـەخرابوون. بەڵکو هێزی هەر خێڵە پێکەوە بەفەرماندەیی سەرۆکی عەشیرەتەکان کۆبببوونەوە.

٣- نـە فەرمانـدەکانی هێزەکـە و نـە جـەنگاوەرانی لەشـکرەکە، مەشـقی جـەنگیی دانەنـدرابوون.٤- چـەکی قورسـیان نـەبوو. چـەکەکانی تریـان بـەزۆری خـراپ و بەشێکیشیان چەکی ئاگرداریان هەر نەبوو.٥- خۆراك و جلوبەرگ و پێویـستییەکانی تریـان دەبـوو لـە لایـەن خۆیانـەوە دابـین بکـرێ.٦ - لەشـکرێکی ناڕێکوپێـك، مەشـق نەدیو، بێ دیسیپلین، بێ تەجرەبـە" بـەئارەزووی خۆیـان کۆبببوونـەوە و بـەئارەزووی خۆیـشیان بڵاوەیـان لـێ کـرد.(١٠) بڵاوەلێکردنەکـەش کـە هـەر زوو دەسـتی پـێ کـرد، لەبـەر دوو هـۆ بـوو: ١- لـە سـەرەتای هێـرش و پـەلاماردا بـۆ سـەر میانـدواو و دەوروبەری، هێزەکانی کـورد کەوتنـە کوشـتن و تـالانی و شـڕەخۆری ئـەو ناوچـانە و خـەریکبوون بەگواسـتنەوەی ئـەو تالانییانـەوە، کـە ئەمـە وای لێکـردن هـەر زوو بەرەکانی شەڕ بـەجێ بهێڵن و تالانییـەکان بگەیەننـە ناوچـەکانی خۆیـان.٢- زۆر لـە سەرۆك خێڵەکانی موکریان، بەنهێنی و بەئاشکرا، لە پـێش شۆڕشـەکە و لـە گەرمـەی شۆڕشـەکەدا، پێوەنـدییان بەلەشـکری دەوڵـەتی ئێرانـەوە کردبـوو، کـە دوای خۆبەدەستەوەدانی هەر دەستەییێکیان، دەبوونە مایەی دڵساردیی بەشدارانی شۆڕش و چـاولێکەریی بـۆ سـەرۆك خێـڵ و خـەڵکانی تـریش.بـەلام لـە ڕووی سیاسـییەوە سەرکەوتن و ئاڵوگۆڕی تازەی هێنایـە کایـەوە:١- شۆڕشـی ١٨٨٠ وەرسـووڕانێکی نـوێ و هەمەلایەنەی سیاسیی، فەرهەنگیی، کۆمەڵایەتیی، بـوو بەسـەر بزووتنـەوەی کـورددا هات. چونکە تێکڕای بزووتنەوەکانی پێشووتری کورد، هەر لە ڕاپـەڕینی ئـەمیرخانی برادۆست (١٦٠٩)، تا ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی نێوان چارەکی دووەمـی سـەدەی نـۆزدەی میرانـی: سـۆران، بابـان، بتلـیس، بۆتـان و ئـەوانی دواتـریش، کـە لـە دژی زوڵـم و

زۆرداریی عوسمانی و سەفەوی و قاجاری راساون؛ هەموویان ئەنجامی پیشخواردنەوە و تەقینــەوەی ئــەو هەســتە مێژینەیــەی گــەلی کــورد بــوون کــە پێــشتر لــە ســەردەمی شەرەفخانی بتلیسی (١٥٤٣ - ١٦٠٤) و دواتریش لـە سـەردەمی ئەحمـەدی خـانی (١٦٥٠ - ١٧٠٧)دا، سەری هەڵدابوو. ئەم هەستەش بریتی بوو "لـە هەسـتی خۆبەبێگانـە زانـین لە ڕۆم و عەجەم، هەستی خۆبەکورد زانین، هەستی پێویستی یـەکبوون و پێکهێنـانی دەوڵەتی کوردی بەهێز، کە کـورد و کوردسـتان لـە دەسـتدرێژی و ململانێـی نـاڕەوای ئــەو دوو هێــزە بێگانەیــە بپــارێزێ"(١١).)بــەلاّم لەبــەر نەخــەملێن و نەڕەخــسان و "نەگەیشتنی هەلومەرجی ئابووری، کۆمەلاّیـەتی، فەرهـەنگی" ئـەم هەسـتە هـەروەك نــەبوو بەئایـدۆلۆژیای چـینی هەڵبــژاردەی کۆمــەڵ و نەیـشبوو بەخواسـتی خــەڵك و بزووتنــەوەی جــەماوەر". تــا لــە دواچــارەکی ســەدەی نــۆزدەدا "هاوزەمــان لەگــەڵ ســەرکەوتنی نەتــەوەکانی ئاڵمــان و ئیتاڵیــا، لــە پێکهێنــانی دەوڵــەتی نەتــەوەیی یەکگرتوودا و هاوزەمان لەگەڵ پەرەسـەندنی خـەباتی نەتـەوەکانی باڵکان: بوڵگاریـا، سرب، ڕۆمانی، یۆنان"دا، بۆ ڕزگاربوون لە ژێردەستی تـورك و دامەزرانـدنی دەوڵـەتی نەتەوەیی سەربەخۆ، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە ناوەکییە قووڵانـەی لـە ڕووی ئـابووری، کۆمەلاّیەتی، سیاسـیی"یـەوە بەسـەر خـەڵکی کوردسـتاندا هـات، خـەباتی کـورد چـووە قۆناغێکی نوێوە، کە دەگونجێ دابنـرێ بەسـەرەتای گـۆڕانی "هەسـتی نەتـەوەیی" بـۆ "هۆشـی نەتـەوەیی" و دانـانی بناغـەی سـەرەتا گـشتییەکانی چوارچێوەی سـتراتیژی کـاری نەتــەوەیی کــورد، لــە پێنــاوی ڕزگــاری و یەکگرتنــەوە و پێکهێنــانی دەوڵــەتی سەربەخۆدا" . ١٢)) ٢- ئەم بەرنامە تازەیەی شێخ عوبەیـدوڵلاّ، مەترسـییەکی گـەورە و تازەشی بۆ هەردوو دەوڵەتی ئێـران و عوسمـانی و تەنانـەت بـۆ وڵاّتـانی ئـەورووپا و بەتایبەتیش بۆ ئینگلستان و ڕووسیا پەیدا کـرد، کـە شـێخ عوبەیـدوڵلاّ بـێ هـەدادان تەقــەللای دیپلۆماســییانەی ئــەوەی لەگەڵیانــدا دەدا قایلیــان بکــا پــشتیوانیی لــە داخوازییەکانی بکەن؛ چونکە بەدیهاتنی بەرنامەکەی شێخ عوبەیدوڵلاّ دەبـووە هـۆی ئاڵوگۆڕێکی چاوەڕوان نەکراو و نەزانراوی تازە، لـە تـەرازووی هێزەکـانی ناوچـەکە و ئەو ململانێ بەتینەی ڕووسیا و ئینگلستان، لەسەر ئارام و دامرکاو ڕاگـرتنی ئێـران و

ئیمپراتۆری عوسمانی هەیانبوو، کە ئەم دوو هێزەی ڕووسیا و ئینگلستانیش لەو ڕۆژگارەدا گەورەترین زلهێزی جیهان بوون. لەبەرئەوە بەرنامەکەی شێخ عوبەیدوڵلا دەبووە تێکدانی تەرازووی هێزەکانی نێودەوڵەتیی، کە وەك "ئابۆت"ی سەرکۆنسوڵی ئینگلستان لە تەورێز دەڵێ: "ئەم بەرنامەیەی شێخ عوبەیدوڵلا دەبووە مایەی لەبەریەك ترازانی ئیمپراتۆری عوسمانی و بزواندنی عەرەبەکانیش بۆ ئەوەی ئەوانیش داوای جیابوونەوە لە عوسمانی بکەن"١٣))بۆیە گەورە باڵوێزی ڕووسیاش هەر سەبارەت بەم بەرنامەیەی شێخ عوبەیدوڵلا دەڵێ: "شێخ دژی گەورە گەورەکان هەنگاو هەڵدەگرێ"١٤)) هەر لەبەرئەمەش بوو کە ڕووسیا و ئینگلستان، نەك هەر بەدەنگ بانگەوازە زۆرەکانی شێخەوە نەچوون، کە داوای لێدەکردن بۆ جێبەجێکردنی داخوازییەکانی کورد، ددان پیانانێکی نێودەوڵەتییان لێ وەربگرێ، بەڵکو زۆر بەسەختی دژی داخوازییەکانی کورد وێستان و گەلەکۆمەکی نێودەوڵەتییان دەکرد.بەلاّم لە هەمان کاتیشدا شۆڕشی (١٨٨٠) سەرنجی دەوڵەتانی ئەوروپای بۆ لای کێشەی کورد و گرنگیی جیۆپۆلێتیکی کوردستان ڕاکێشا و لە جاران زیاتر بەچاوی بایەخ پێدانەوە بنوارنە کوردستان، کە تەنانەت شۆڕشی (١٨٨٠) بووە هۆی ئەوەی ولاّتێکی وەکو ئەمەریکا، بۆ یەکەمجار، دەوڵەتی ئێران بەشێوەیەکی ڕەسمیی بناسێ و دوو ساڵ دواتر، لە ساڵی (١٨٨٢)دا، بەناوی: بەرگری و داکۆکی لە مافی مەسیحییەکانی ناوچەکە، نوێنەری خۆی بۆ ئێران بنێرێ.(١٥)٣- بزووتنەوەی کورد لە هەردوو بەشی بندەستی قاجاری و عوسمانیدا، لە دوای لەناوبردنی میرنشینەکانی کوردەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ هێوربوونەوەیەکی بەسەردا هاتبوو. سەرانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و قاجاری خەریك بوو شێوە لەبیرچوونەوەیەکی کێشەی کوردیان بەسەر خۆیاندا دەهێنا. بەلاّم ئەم شۆڕشە بۆ هەردوو دەوڵەتەکە وریاکردنەوە و بیرخستنەوەیەکی پێویستی لا دروست کردن، کە سەرانی عوسمانی هەر زوو کەوتبوونە خۆیان و دەیانویست بۆ بەرژەوەندی خۆیان، باوەشی درۆزنانە بۆ کورد بکەنەوە و لە پێش و لە گەرمەی شۆڕشەکەدا تەقەللای ئەوەیان دا، کێشەی کورد دژی ئەرمەن لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە وەك

گوشارێکیش بۆ هێنانە دی ئاوات و مەرجەکانی خۆیان، بەرامبەر ئێران بەکاری بهێنن" دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەش، سەران و میران و میرزادە و شێخ و مەلای کوردیان، لە خۆیان نزیك خستەوە و مووچەیان بۆ زۆریان بڕییەوە و دواتریش لە ساڵی (١٨٨٥) بەدواوە، هێزێکی گەورەیان بەناوی: سوارەی حەمیدییە، لێ پێکهێنان، کە لە کاتی بەکارهێنانی ئەم هێزەدا بۆ سەرکوت و دامرکاندنەوەی شۆڕشی گەلانی باڵکان و ئاشنایەتی پەیداکردنی ئەفسەرانی کوردی ناو ڕیزەکانی سوارەی حەمیدییە، لەگەڵ ئەفسەرانی ناسیۆنالیزمی تورکدا، هوشیاریی نەتەوەییان زیاتر گەشەی کرد و بەناو ڕیزەکانی عەشایەر و شارەکانیشدا بڵاو دەبووەوە و" دواتریش ڕووناکبیرانی کورد کەوتنە دەرکردنی ڕۆژنامە بەزمانی کوردی و پێکهێنانی یانە و ڕێکخراوی سیاسیی، کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیی و دروستبوونی زنجیرە ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی چارەکی دووەمی سەدەی بیست، کە دیارترینیان شۆڕشی (١٩٢٥) بوو بەسەرکردایەتی "شێخ سەعیدی پیران"ی هەمان پەیڕەوی سەر بەڕێبازگەی نەقشبەندی.٤- ئەگەرچی دەوڵەتی عوسمانی لە دەمێکەوە و بەتایبەتیش لە دوای بڕانەوەی جەنگی (١٨٧٨)ەوە، دەیویست لە ڕێگەی بەگژداکردنی کوردەوە، تۆڵەی سەخت لە ئەرمەن بکاتەوە، بەڵام شێخ عوبەیدوڵڵا زۆر هوشیارانە گەلی کوردی لەم پلانە پاراست و بەهۆی گواستنەوەی جوگرافیای شۆڕشەکەوە، لە کوردستانی عوسمانییەوە بۆ کوردستانی ئێران، توانی (لە ڕۆژگاری خۆیدا) شانازیی دۆستایەتی کورد و ئەرمەن بپارێزێ.بەڵام دواتر سەرانی عوسمانی لە ڕێگەی سوارەی حەمیدییەوە، ئەو کۆنە قینەیان، بەئەرمەن ڕشت و لە چەند شاڵاوێکی بەربڵاوی درێژخایەندا، کە دەبێتە (٥) جار: ١٨٤٩، ١٨٩٦، ١٩٠٥، ١٩١٥، ١٩١٨ قەتڵوعامێکی زۆر دڕندانەیان لە گەلی ئەرمەن کرد" ئەمەش ئەوەی دەرخست کە ئەگەر دەسەڵاتی کورد بەدەست ڕێبەرانی خۆیەوە بوایە، ئەو چەند شاڵاوە دڕندانەیەی بەهۆی سوارەی حەمیدییەوە کرانە سەر ئەرمەن، هەرگیز ڕوویان نەدەدا.
- ٢ - **ئەم بەڵگەنامەیە**دەستپێشکەریی دیپلۆماسییانەیەی شێخ عوبەیدوڵڵا، هەر زوو بووە جێی سەرنج و ئاوڕدانەوەی دۆست و دوژمن، لە وڵاتانی دوور و نزیك و

هەموویان بەچاوی بایەخدانی تازەوە، ئاوڕی تازەشیان لە کێشەی کورد دایەوە و بۆیان دەرکەوت؛ کە ئەگەر تا ئەو ڕۆژگارەش سەرنجێکیان لە کێشەی کورد نەدابێتەوە، ئەوا دەبێ بەهۆی شۆڕشی (١٨٨٠)وە، ئاوڕی تازە لە کورد بدرێتەوە. بۆیە "ئاپۆت"ی سەرکۆنسۆلی ئینگلتەرا لە تەورێز، لە نامەیەکیدا، کە لە ڕۆژانی هەڵایسانی شۆڕشی (١٨٨٠)دا، بۆ (ئێرل گرانڤێل)ی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرای ناردووە؛ دەڵێ: "من پێم وا نییە ئەوروپا دوایین دەنگی کێشەی کوردی بیستبێ؛ ڕەنگە دواڕۆژ ئەم پرسیارە بێتە ئاراوە: دەبێ لەگەڵ کوردستان چ بکرێ؟!"(١٦))بۆیە ئەم ئاوڕدانەوەیە تازەیە، ئەو دەوڵەتانەی وا لێ کرد، بکەونە هەواڵ و ڕاپۆرت کۆکردنەوە لەسەر خودی شێخ و خۆ ئامادەکردنی بۆ ڕاپەڕینی (١٨٨٠ز) و لە گەرمەی ڕاپەڕینەکە و دوای ڕاپەڕینەکە و تا ئێستاش، هەر جێی باسوخواس و لەسەر نووسینە؛ کە هەموو ئەو نووسین و لێکۆڵینەوانە، وەك سەرەتای قۆناغێکی نوێ دەنوارنە ئەم سەردەمەی کورد و ڕاپەڕینی (١٨٨٠ز) و ڕابەرەکەی. هەر لەم بوارەشدا نووسین و بەڵگەیێکی زۆر، لە ئەرشیفی ڕووسیا، ئینگلستان، دەربارەی قاجاری و عوسمانی و لە لایەن سەرانی هەردوو لەشکرەکانیان و نووسەرانی تری ڕۆژگاری قاجارەوە، لەو ڕاپەڕینە و ڕابەرەکەی بەجێماون؛ کە تا ئێستا بەشێکی زۆر لەو نووسین و بەڵگەنامانە، بوونەتە کەرەسە و بابەتی هەندێ کتێب، یان فەسلێك لە کتێب و لێکۆڵینەوە.بەڵام بەشە زۆرەکەی ئەم بەڵگانە، کە بەڵگەی قاجارین، ئەگەر تا ئێستا (هەندێکیشیان) لە دووتوێی کتێب و لە شێوەی کتێبیشدا چاپ بووبن، دیسان هەر کەرەسەی خاو بوون و سەروبەر نەکراون و بەگوێرەی مێژووی ڕووداوەکان ڕیز نەکراون و هێشتا ئەڵقەی پەرتوبڵاو و لە یەکتر هەڵوەشاوەی ڕووداوەکانن و نەخراونەتەوە ناو زنجیرەی ڕووداوەکان و لە هەمان کاتیشدا بەو هۆیەوە کە زۆربەی ئەم بەڵگەنامانەی قاجاری، هێشتا ڕووناکییان نەدیوە و دەستی لێکۆڵەرەوە و توێژینەوەیان نەگەیوەتێ؛ بۆیە ئەو چەند کتێبەش کە تا ئێستا لەسەر ئەم ڕاپەڕینە دواون،(١٧) لەم بەڵگانە بێ بەشن.مەبەستیش لەم بەڵگەنامانەی قاجاری دوو جۆرن:١- جۆرێکیان ئەو نامە و یادداشتنامە و تەلگرافە ڕەسمییانەن، کە

دەوڵەتی قاجاری بەهەموو دامودەزگاکانییەوە (هەر لە ناسرەدین شاوە، تا وەزارەتی کاروباری دەرەوە و باڵوێز و کۆنسوڵ و کارگێڕ و هەموو بەڕێوەبەرایەتی قاجاری) لەگەڵ خودی دامودەزگاکانی خۆیان و لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، ڕووسی و ئینگلیسدا گۆڕدراونەتەوە.٢- جۆرێکی تریان ئەوانەن کە سەرانی لەشکر و نووسەرانی قاجاری، لە شێوەی بیرەوەری و کتێبی شەخسیدا نووسیویانن و بریتین لە یادداشت کردن و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی ١٨٨٠، بەهەموو وردەکارییەکانییەوە، کە خۆیان ڕاستەوخۆ لەگەڵ لەشکری قاجاردا، لە سەنگەری دژی ڕاپەڕینەکە بەشداربوون و شەڕیان کردووە.ئەگەرچی ئەم دوو جۆر بەڵگەنامانە بەگیانی ناحەزانە و دوژمنانەی ڕۆژگاری قاجارەوە نووسراون؛ بەلاّم لە هەمان کاتیشدا گەنجینەیەکی دەوڵەمەندن و پڕن لە زانیاریی تازە و شاراوە دەربارەی ڕاپەڕینەکە.بەو هۆیەشەوە کە ئەم بەڵگەنامانە، لە ئەرشیف، یان ناوەند و کتێبخانەیەکی دیاریکراودا نەپارێزرا بوون، بۆیە چنگخستن و کۆکردنەوەیان زۆر بەدژواری و لە ماوەی (٨ - ٩) ساڵی کاوەخۆدا هەموویانم چنگ خستوون.ئەم بەڵگەنامەیەی بەردەستتان، کە بەئەندازەی کتێبێکە و ناوی: "إفتتاح ناصری"یە؛ سەرهەنگ حاجی عەلی ئەکبەر نووسیوێتی، کە کوڕی (حیسامولولك)ە و خۆی و باوکی، لە ئەفسەرانی پایەبەرزی سوپای دەوڵەتی ئێران بوون و لە کاتی شۆڕشەکەی (١٨٨٠ز)دا، لە تێکڕای قۆڵەکانی: بناو، میاندواو، موکریان، سندووس، شنۆ، مەرگەوەڕ و لاجاندا، تا ڕۆژانی گرتن و بردنی شێخ عوبەیدوڵلاّ بۆ ئەستەموول، واتە: تا نزیکەی (٨ - ٩) مانگ ڕاستەوخۆ لە ڕیزی لەشکری ئێراندا دژی هێزەکانی کورد، شەڕ و بەشداریی بەردەوامیان کردووە و هەر لەو سەروبەندەشدا ئەم کتێبەی وەك بیرەوەری ڕۆژانی شەڕەکان و سەروەریی خۆیان نووسیوە و بەو هۆیەشەوە کە خۆی ئەفسەر بووە؛ زانیاریی بەرەکانی شەڕ و مێژووی شەڕەکان و ناوی بەشدارانی هەردوو هێزەکەی کورد و ئەفسەرانی دەوڵەتی ئێرانی زۆر بەوردی و ڕاستیی نووسیوە و وەك دیارییەك پێشکەشی ناسرەدین شای کردووە.زانیارییەکانی ئەم کتێبە، لە چاو سەرجەمی ئەو بەڵگە و بیرەوەری و کتێبانە دەوڵەمەندترن، کە تا ئێستا لەسەر شۆڕشی (١٨٨٠)

نووسـراون.ئـەم کتێبـە هێـشتا دەستنووسـە و نوسـخەیەکی کـە پێشکەش (ناسـرەدین شای قاجار) کراوە، ئێستا لە کتێبخانەی میللی تاراندا، بەژمارە (٨٨٤ - ف) و پێرسـتی (ل - ٤١٨) پـارێزراوە. ئــەم کتێبــە (٧٩) لاپــەڕەی قــەوارە گەورەیــە، کــە ڕووبــەری لاپـەڕەکانی بریتییـە لـە (٢٥سـم * ١٥,٥سـم) و لـە هـەر لاپەڕەیەکیـشدا (١٦) دێـڕی بەخەتی شکستەی نەستەعلیق تێدا نووسـراوەتەوە. هـەموو کتێبەکـەش (١٢) بەشـە. بۆ یەکەمین جار ئەم دەستخەتە لە لایەن نووسەری ئـەم وتـارەوە، لـە سـاڵی (١٩٩١)دا، لە کتێبخانەی ناوبراوەوە بۆ کاری کتێبێکم بـەناوی: "شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوڵلا" لـە بەڵگەنامـەی قاجاریـدا، زانیـارییم لـێ وەرگـرت و پوختەیـەکیم لـە پاشـکۆی کتـێبی ناوبراودا بڵاوکردەوە و پێش ئەو کتێبە و دواتریش، هێـشتا لـە هـیچ سەرچاوەیەکی تـری بیـانی و کوردیـدا نەکراوەتـە سەرچـاوە و باسـی نـاوەرۆکی نـەکراوە، تـەنیا ئاماژەیەك بەپێناسە و نووسەرەکەی کراوە"

- ٣- ئەگەرچـی ئــەم کتێبــە بــەگیانێکی نەیارانــە و چەواشــەکردنی ڕووی ڕاســتیی داخـوازیی و بەرنامـەی شۆڕشـەکەی شـێخ عوبەیـدوڵلا نووسـراوە، بـەڵام ئێمـە نـەك دەسـکاریی ناوەرۆکەکـەیمان نـەکردووە، بـەڵکو تاکـە وشەیەکیـشیمان لـێ نـەگۆڕیوە و کۆشـاوین بـەوجۆرەی تەرجەمـە نەکـەین، تـا خوێنـەری کـورد ڕازی بکـەین و بـەدڵی بێت، بەڵکو دەبێ خوێنەری وردبینی کورد، ئاگاداری ئەوە بێت، کە ئەم بەڵگەنامانـە، تەنیا کەرەسەی خاون و دەخرێنە سەر خەرمانی مێـژووی هێـشتا نەنووسـراوی ئـەم قۆنـاغ و شۆڕشانەی کورد، تـا کـورد دواتـر خـۆی بـەگوێرەی نووسـینەوەی بەرنامـەی مێژووی خۆی، کـەڵکیان لـێ وەربگرێـت، کـە مێـژووی گـەلانی دنیـاش هـەر بـەمجۆرە کۆکراونەتــەوە و نووســراونەتەوە، چــونکە ڕاســتگۆیی تەرجەمــەکردنی بەڵگەنامــە لەوەدایە؛ وەکو خۆی بەرچاو بخرێ و کاری هـەڵاوێردکردن و بـژار و سـاغکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ڕەخنەگرانـەی بەڵگەنامـەکان، لـە ئەسـتۆی جۆرێکـی تـری پـسپۆڕانی تــــردان و پێویـــــستییان بـــــەجۆرە خوێندنەوەیـــــەکی دیکـــــە هەیـــــە.

- ٤ - نووسـەری ئـەم کتێبـە، مێـژووی ڕووداوەکـانی بـە"مێـژووی هیجـری (کۆچـی) نووسـیبوون، کــە ئێمــە هــەموویانمان بەمێــژووی (زایــین) گۆڕیــون و لــە هــەر

شوێنێکیشدا بەپێویستمان زانیبێ، پەراوێزمان بۆ زیاتر زانیاریی خوێنەران، بۆ زیاد کردووە.بەناوی خوای مەزن ڕۆژنامەی هەواڵی ڕووداوێکی سەیروسەمەرە، کە ساڵی ١٢٩٨ کۆچی (١٨٨٠ز) لە "ئازەربایجان" ڕوویدا. باسی باوکی شێخ عوبەیدوڵڵا و حاڵ و باڵی خۆی و یاخیگەرییەکەی و ئەو کەسانەی یارمەتییان دا و بەدەستهێنانی چەك و تەقەمەنی و ئەو پوول و پارانەی چنگی خستن و ڕووداوەکانی بەڕێکەوتنی لە "نوچە"(١)) و چوونی "حیسامولولك"(٢)) بەرەو "مەرگەوەڕ" و عەزیزوڵڵا خانی لایجان لەبەر بەختی بەرزی شاهەنشا، تەواوبوون و تیاچوونی "شێخ" و هاوڕێیانی و ئەو هۆزانەی تا کۆتایی ساڵی ١٢٩٨ کۆچی (١٨٨١ز) لەگەڵیدا بوون.

**بەشی یەکەم :**

لە سەردەمی پاشایەتی شاهەنشای غازی: محەمەد شای خوالێخۆشبوو(٣)، شێخ تاها، کە شەیتانێك بوو لە بەرگی کوردانـدا، دەرکەوت و خۆی وەك یەکێك لە سەییدەکانی "طباطبایي" ناساندبوو. شێخ تاها دانیشتووی "نەهری"یە، کە گوندێکە لە "نوچە" و لە خاکی عوسمانی دایە، لەوێشەوە تا "مەرگەوەڕ"، کە سەر بەناوچەی "ورمێ"یە، چوار قۆناغەرێیە.شێخ تاها لە ڕێگەی چەند کەسێکەوە خۆی بەخزمەت شاهەنشای بەرز و بەڕێز گەیاند و ئەویش (٧) حەوت گوندی لە ناوچەی مەرگەوەڕ پێ بەخشی؛ تا ژیان و خانەقای دەروێشانی پێ بەڕێوە ببات. بەم شێوەیە (٣٠) ساڵ دەستی بەسەر داهاتی ئەم گوندانەدا گرت و مەزنایەتی لە ناو کوردە بێ عەقڵ و نەفامەکاندا بەدەست هێنا؛ تا گۆڕ بەگۆڕ بوو.دوای کۆچی شێخ تاها، شێخ "عوبەید"ی(٤) حەرامزادەی کوڕی، جبەی دەروێشی بەشاندا دا و عەشیرەت و کوردەکانی هەڵفریواند، تا کێشەیەك لە نێوان دەوڵەتانی ڕووس و عوسمانیدا پەیدا بوو.هەرکە هەواڵی شەڕی نێوان ئەم دوو دەوڵەتەی بیست(٥)، جەماوەرێکی زۆری لە عەشیرەت و خێڵەکانی کوردی کۆکردەوە و لەولاشەوە چەکی شەڕی بەناوی "جیهاد" و وەك ئەمانەت لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرت و ڕووبەڕووی لەشکری ڕووس بوونەوە. ئەم عەشیرەتە کوردانە لە نزیك "حەسەن قەلا" تووشی لەشکری ڕووس هاتن. بەڵام بەو هۆیەوە کە کورد بەپێی بەرنامە و

گەلاڵەیـەك، شـەڕیان نـەدیوە و بەرنامـە و یاسـای شـەڕ نـازانن، بۆیـە لـە بەرامبـەر لەشکری دەوڵەتی "ڕووسیا"دا، توانای خۆڕاگرییان نەهێنا و دوای دوو سـەعات شـەڕ و پێکـدادان، هـەلاتن و ڕێگـەی دەشـت و دەریـان لەبـەر گـرت و بـەو چـەك و تەقەمەنییانەی کە وەك "ئەمانـەت" لـە دەوڵـەتی عوسمانییـان وەرگرتبـوو؛ لەگـەڵ خۆیانـدا بردیـانن و بـەدەم ڕێگەشـەوە ئـەو گوندانـەیان تـالان و ڕەشـەکوژ کـرد، کـە لەسـەر دیـنی حـەزرەتی "عیـسا" بـوون، یـان دانیـشتووانی دەوڵـەتی عوسمـانی بوون.شێخ "عوبەید" کە سەیری کرد لەشکرەکەی تێکشکاوە و ڕیسەکەی لێ بۆتەوە بەخوری، خۆیشی لەگەڵ هەندێ خزم و کەس مابوونـەوە؛ بۆیـە لەگـەڵ "سـدیق"ی کـوڕی(٦)، هـەلاتن و ڕوویـان لـە شارۆچـکەی "وان" کـرد، لەوێـشەوە بەڕێبەرایـەتی "شـێخ جـەلال"؛ کـە یەکێکـە لـە شـێخەکانی ئـەهلی سـوننەت، هـەموویان پێکـەوە دەچنە خزمەت "ئەحمەد پاشا"ی سـەرفەرماندەی لەشـکری دەوڵـەتی عوسمـانی.لـە سەروبەندی تێکشکانی لەشکری دەوڵەتی عوسمانیدا، شێخ چاوی لە هاومەزهەبیی و نان و نمەکی دۆستایەتی نووقاند و دەستی دزیی و تالانی بۆ سەر چەك و جبەخانە و کەرەسـەی جـەنگیی لەشـکری عوسمـانی درێـژ کـرد و تەقەمـەنی و چـەکی ئـەو لەشکرەی هەلگرت و بەرەو "نوچە"ی ڕەوانە کردن، کە مەڵبەنـدی نیـشتەجێبوونی خۆی بوو. لەم ماوەیەدا بەهۆی چەك و تەقەمەنی زۆر و گردبوونەوەی جەماوەری کوردیـشەوە، دەسـتدرێژییان بـۆ سـەر هـەموو شـوێنەکان دەسـتپێکرد. خـەڵکی ڕەشۆکییش، کە بۆ خۆنواندن و ڕشتنی خـوێنی موسـڵمانان، وەك ئـاژەڵن؛ لـە دەوری کۆبوونـەوە و تـا دەهـات بنـچینەی ناپـاکیی و زۆرداریـیان زیـاتر پتـەوتر دەکـرد و خەیاڵی پیسیان لە مێشکدا دەهێنا و دەبـرد. **باسی هەلاتنی عەبدوڵلاخانی زەرزا لە زیندانی نەوابی والا: معین الدوله و ناوبژیکردنی حاجی ڕەحیم خانی ورمـێ و چـوونی شـێخ عوبەیـد بـۆ "نوچـە" و فـەرمانڕەوایی "ئیقبالولدەولـە"**.لـە سـەردەمی فەرمانڕەوایی نەوابی والا: مـوعین دەولـەدا لـە ورمـێ، لەبەرئـەوەی عەبـدوڵلاخان و برایم خانی برای، لە شارۆچـکەی "شـنۆ" دەسـتدرێژییان بـۆ سـەر خـەڵك کردبـوو؛ دەسـتیان بەخراپـەکاریی کردبـوو، نـەوابی والا لەگـەڵ جـەماوەرێك بـۆ "شـنۆ"

چووبوون، هەردووکیان دەگرێ و دوای تەمێکردن، لە زینـدانیان دەخات. هەنـدێ ئاکـار و ڕەوشـتی نالـەبار لـە هاوڕێیـانی نـەوابی والا و کەسـوکارەکانیان ڕوویـدا و ئەوانیش لـە زینـدان هـەلاتن. کەچی هـەر خـودی ئەمانـە، کـە پێشتر لەگـەڵ شـێخ (عوبەیـدوڵلا) دوژمنایـەتییان هـەبوو، لـە ترسـی گیـانی خۆیـان و لـە ترسـی تووشـبوونیان، پـەنایان بـۆ شـێخ بـردەوە. ئـەم کـارەش ئەوەنـدەی تـر بـووە هـۆی چـاوقایمی و ڕووهـەڵماڵراویی "شـێخ".مەحمـەڵ ئاغـای ڕەوەنـد، دانیـشتووی "دەشتەبێڵ"(٧))، کە هەنـدێك زەویـوزاری لـە "ئیقبالدەولـە" بـەکرێ گرتبـوو، دوای بیستنی ئەم هەواڵە، هەندێ پوول و پارە و شتومەکەی نـاوبراوی هـەڵگرت و پـەنای بـۆ "شـێخ" بـرد. خەسـرەوخانی سـەرهەنگ، کـوڕی ئیقبالدەولـە(٨)، دەسـتەیەك سەربازی دڵسۆزی بۆ گـرتنی مەحمـەڵ ئاغـا بـەرەو دەشـتەبێڵ نـارد و شـێخیش بـۆ پاراسـتن و پـشتیوانیکردنی مەحمـەڵ ئاغـا، حەسـەن بـەگی "بەردەسـوور"ی لەگـەڵ چوارسـەد (٤٠٠) تفەنگـچی بـۆ بـەرەی شـەڕ، تـا دۆڵـی "قـاسملو" دەنێـرێ.بەشـی دووەمعەبدوڵلاخان ماوەیەك لای شێخ دەمێنێتـەوە و نـاو و شـۆرەتێك پەیـدا دەکا. دەسـتی بەناوبـژیکردنی نێـوان خـەڵك و شـێخ کـرد و چـەندین نامـەی بـەملا و لادا نووسی و خۆشەویستیی "شێخ"ی دەرخـواردی خـەڵکی دەدا. بـۆ نموونـە: نامەیـەکی بۆ حاجی ڕەحیم خانی ورمێ نووسی و بـەناوی شـێخەوە بـۆ "نوچـە"ی بانگهێـشتن کرد. ناوبراویش بەدیاری و دەسـتی پـڕەوە بـۆ لای شـێخ چـوو. دوای گەڕانـەوەی لـە "نوچـە"، باسـی هیـچی نـەکرد، تـا فـەرمانڕەوایی "ورمـێ"ی بـۆ "ئیقبالدەولـە" دەستەبەر کرد. ئیتر بەو هۆیەوە کە لەگەڵ ناوبراو خزم بوو، چەند شتێکی لە شێخ گێڕایەوە. ئیقبالدەولەش کە بێ ئاگـا بـوو لـەوەی "الاقـارب کالعقـارب - هـەر خزمـە، لێت دەبێتە دووپشك"، فریوی ئـەو بـێ دینـەی خـوارد و داوای لـە مەحمـەڵ ئاغـا و عەبدوڵلاخان کرد، تا لەگەڵ ناوبراو سـەردانی ورمـێ بکـەن. ئیقبالدەولـەش لـەبری خراپەی ئەوان؛ بەسەریکردنەوە و میهرەبانیی بەرامبەر نواندن، ئـەو قـەرزەش کـە لەسەر مەحمەڵ ئاغا بوو، لێی خۆش بوو. دوای وتووێـژێکی زۆریـش بڕیاریانـدا کـە عەبـدوڵلاخان بانگهێـشتنی "عەبـدولقادر"ی کـوڕی شـێخ بـۆ ورمـێ بکـات و

فـەرمانڕەوایی "مەرگـەوەڕ" و "شـنۆ"ی پـێ بـسپێرن و دوای دامەزرانـدنی ئـەو فەرمانڕەواییەش "شێخ" بۆ مەرگەوەڕ بهێنێ و ئیقبالدەولەش سەردانی ئەوێ بکات و هـەردووکیان لـە مەرگـەوەڕ چاویان بەیـەك بکـەوێ و بڕیـار و بـەڵێنی خۆیـان بدەن.دوای ڕۆیشتنی عەبدوڵلاّخان، محەمەد ئاغای مامش(٩) لەگـەڵ (٣٠٠) سـوار بـۆ ورمێ دێن و وایان بڕیـار دا، کـە بـۆ سبەینێ سـەرلەبەیانی، لـە بـاخی "عـەلی بـەگ ئاجودان" تەنیا بن و پێکەوە قسەی خۆیـان بکـەن. سبەی بـۆ بـاخی نـاوبراو چـوو. محەمەد ئاغای مامش لەوێ ئەو نامە تایبەتییانەی نیشانی ئیقبالدەولە دا، کە شـێخ بـۆی نووسـیبوون و عـەرزی کـرد: ئەگـەر بتانـەوێ مـن ژێـر دەسـتەی شـێخ بم و فـەرمانڕەوایی مەرگـەوەڕ و لاجـان و شـنۆی بـدەیتێ، ئـەوا دەبێتـە کەڵـەگا. چـونکە ئەگەر هێلکەی قەلەڕەشکە، کە سروشـتی خـۆی هـەر ڕەش و تاریکـە؛ بیخەیتـە ژێـر تاووسی باخی بەهەشتیش، ئەوا کاتێ هێلکە پەروەردە دەکرێ و لە بـاخی بەهەشـت گەورە دەبێ و ئاوی لە کانی سەلسەبیل بدەیتێ و جوبرەئیلیش فوو بـەو هێلکەیـەدا بکات، سـەرئەنجام هێلکـەی قەڵەڕەشـکەکە، هـەر دەبێتـەوە بەقەلەڕەشـکە و تاووسـی داماویش ڕەنجی بەخەسار دەچێ.بەلاّم ئیقبالدەولە، ئـەم شـتەی بـەنێوان ناخۆشـیی ئەو و عەبدوڵلاّخان (ی زەرزا) لێکدایەوە. ئـەم مـشتومڕەش ماوەیـەك خایانـدی؛ تـا شێخ قادر و عەبدوڵلاّخانی زەرزا گەیشتنە ورمێ. ئیقبالدەولـە بـەبێ بیرلێکردنـەوە و دەستبەجێ فەرمانڕەوایی شنۆ و مەرگەوەڕی پێدا؛ کە ئـەوی ڕاسـتی بـێ لـە مـاڵی "ئەفشار" دایە!(١٠) و بەدەستی خۆی، خۆی لە چاڵاوی سەرسوڕمان داهێشت و بـووە هانـدەرێك بـۆ داگیرکردنـی ورمـێ و ئەفـشار. فـەرمانڕەوایی "لاجـان"یـش بـەحاجی ڕەحیم خان درا.محەمەد ئاغای مامش کە لەوە بێ ئومێد بوو فەرمانڕەوایی ورمێـی بدرێتێ؛ بەجێهێشت. ئیقبالدەولە و شێخ‌یش ئەم هەڵوێستەیان پـێ خـۆش نـەبوو؛ بۆیە بەمحەمەد ئاغایان ڕاگەیاند؛ کە ئەگەر سەری ملکەچکردن شۆڕ نەکاتەوە، ئەوا ئـیتر ئەگـەر قـسە و پـەیامێك لـە نێوانمانـدا مـابێ، هـەر قـسە و پـەیامی زمـانی شمشێرە!. محەمـەد ئاغـاش چـونکە نزیکـی سـابلاّخ ببـووەوە، حـاڵ و بـاڵی خـۆی بـۆ "ئاغا شـازادە"(١١)) بـاس کـرد، تـا بـەڵکو ئـەم قـسە و باسـانە، لـە ڕێگـەی نـاوبراوەوە

بەخاکی پێی پیرۆزی حەزرەتی ئەقدەس و والا "وەلیعەهد"١٢)) بگاتەوە (ڕۆحمان بەفیدای بێ) و چارەیەکی دەردەکەی بکات. هەڵبەتە دواتر بەناچاریی سەری ملکەچکردنی شۆڕ کرد، تا بەڵکو بەم شێوەیەیان گیان وماڵی خۆی بپارێزێ. ئەم شتەش بووە مایەی بەهێزتربوونی شێخ عوبەید. هەر کەسێکی تریش هەر بەحاڵ لە فەرمانی دەرچووبایە، ماڵی وێران دەکردن. کەسیش لە خێڵە کوردەکان توانای ئەوەی نەبوو سەرپێچی فرمانی بکات. ناوبراویش لە خۆی دڵنیا و بەرزەفڕ بوو، تا کارەساتەکەی "هەمزە ئاغای مەنگوڕ"ی(١٣) بەسەرداهات.**بەشی سێیەم** کە ساڵی ١٢٩٧ کۆچی (١٨٧٩)دا، بەفرمانی ئەقدەس، وەلیعەهدی باڵای شازادە (ڕۆحمان بەفیدای بێ)، فەرمانڕەوایی سابلاخ، بەنەوابی "لوتف عەلی کوڕی موئەییدلدەولە" سپێردرا، هەمزاغا سەرۆکی خێڵی مەنگوڕ بوو. لەبەر خراپە و پیسیی، کە لە سروشتیدا هەبوو، هەمیشە لە کاربەدەستانی دیوانی باڵا دەترسا و لە فرمانەکانی شارۆچکەی سابلاخ هەڵدەهات. بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ "مقلی میرزای کوڕی مەلەك قاسمی میرزا" ناسیاویی و ئاشنایەتیی لەمێژینەی هەبوو. شازادەش پیاوێکی جێگەی باوەڕ بوو، بۆیە دوای ئەوەی بەمەی زانی، فرمانی بەمقلی میرزا کرد؛ کە تۆ هەمزاغا لە لایەن منەوە دڵنیا بکە و بۆ شاری بهێنە و پێی بڵێن بەهیچ جۆرێ لە لایەن حکوومەتەوە ئازاری پێ ناگا؛ پاش بڕیاردانی باجی خێڵی مەنگوڕ، ساغ و سەلیم بۆ شوێنی خۆی بگەڕێتەوە.مقلی میرزا ئەم ئەرکەی قبووڵ کرد و دوای تەقەللایەکی یەکجار زۆر، هەمزاغای ڕازی کرد، تا لە حکومەت دڵنیا بێ. چونکە هەمزاغا جەزرەبەی زۆری لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەتەوە لێ درابوو. هاتە سابلاخ؛ لە کاتی گەیشتنیدا، دانیشتووانی شار بەرەو پیری چوون و پێشوازییان لێ کرد و بەڕێزەوە بۆ لای "ئاغا شازادە" بەرەو شوێنی فەرمانڕەوایەتییان برد و میهرەبانیی و سۆزی زۆریان بەرامبەر نواند.بەڵام "عەزیزی فەتاح"، کە لە ئاغاکانی موکری بوو؛ ئەویش لەبەر باج نەدان، لە زەمانی فەرمانڕەوایی حاجی مەحموود خانەوە، هەڵاتبوو؛ لەم هاتنەی هەمزاغادا، ئەویش بۆ شار هاتبوو. ئاغا شازادە دەستبەجێ گرتی و لە زیندانی کرد و داوای باجی لێ کرد. قادراغاش ئەم

هەواڵەی بەگوێی هەمزاغا گەیاند. هەمزاغاش نامەی بۆ ئاغا شازادە نووسی و ناوبژیی بۆ کردن. شازادە لە وەڵامدا وتبووی: من کارم بەسەر "عەزیز"ەوە نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ، کە دەبێ سبەینێ حسابی لەگەڵ "میرزا تەقی"دا یەکلایی بکاتەوە و پاشماوەی باجەکەی بدات، لەوە بەدواوە ئیتر ئازادە" ئەو حەرامزادەیە (هەمزاغا) ئەم وەڵامەی بەدڵ نەببوو. خۆی و (١٠) کەس، لە نزیکانی خۆی، بەچەکەوە چوونە ناو فەرمانداریی و وتی: دەبێ عەزیز بەربدەن.شازادە کارەکەی بەمیرزا تەقی سپارد و وتی: با حسابەکەی خۆی بدات و دوایی ئەو (عەزیزی فەتاح) بەدەست هەمزاغا بسپێرێ. بەڵام بەدزیشەوە بەمحەمەد بەگی فەڕاشباشی دەڵێ: دەبێ کارێك بکەیت، ئەم حەرامزادەیە (هەمزە ئاغا) بێ چاوڕووە، زیندانی بکەیت. فەڕاشباشیش یەکسەر لەگەڵ دووسێ فەڕاشی تردا بۆ ماڵی هەمزاغا دەچن و زنجیرێکیان پێ دەبێ و پێی دەڵێ: بەفرمانی نەوابی والا، ئەم زنجیرە ماچ بکەن و لە ملی خۆتانی بکەن.هەمزاغاش لە ترسی ئەوەی دەستگیری نەکەن، ئاگای لە خۆی بووە و بەپارێز بووە. خزم و دۆستەکانی بەخەنجەرەوە هەڵدەکوتنە سەر فەرمانبەرەکانی دەوڵەت. لوتفعەلی ناوێکی فەڕاشباشیش دەست بۆ قەمەکەی دەبا و تۆزێك هەمزاغا بریندار دەکا.کە فەرمانبەرەکان جوامێریی و دەستبردی هەمزاغا دەبینن، لە ترسی گیانیان هەڵدێن. هەمزاغا خۆی بۆ لای دەرگا دەکوتێ، پاسەوانەکان ڕێی پێ دەگرن. بەخەنجەرێکی خوێنڕێژ یەکێکیان دەکوژێ. شەڕ لە نێوان هەمزاغا و پاسەوانەکاندا دەقەومێ. ئەحمەد ئاغای برازای هەمزاغاش بەگوللەیەك دەکوژرێ. کوردی ئەو دەوروبەرانە کۆدەبنەوە و بڕیار دەدەن بکەونە کوشتنی پیاوانی دەوڵەت و ڕووتکردنیان.دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە، مەلاکانی ئەو ناوچەیە، خۆیان دەگەیەننە هەمزاغا و لەم کارە ناشایستەیەی پەشیمان دەکەنەوە و پێی دەڵێن ئەم کارە دەبێتە سۆنگەی کوشتن و تاڵانکردنی خەڵکی ناوچەکە. ئەویش ڕازی ببوو.ئەم ڕووداوە لە کاتێکدا بوو، کە پێشتر و تا ئەم کاتە، لەگەڵ شێخ عوبەید دوژمنایەتی هەبوو، سەری تاعەتی بۆ شۆڕ نەدەکردەوە. بەڵام لە ترسی ماڵ و سامان، دەستبەجێ دەستی هەڵگرت و ڕووەو "نوچە" بەڕێکەوت؛

سەری ئیتاعەتی شۆڕ کردەوە و باسی کارەساتەکەی خۆی گێڕایەوە. ئەم ڕووداوەش بووە هۆی زیاتربوونی دەسەڵات و چاوقایمیی شێخ.**بەشی چوارەم**کاتێك شێخ عوبەید زانی هەمزاغا ملکەچێتی و عەشایەریش چاوەڕێی فرمانن؛ چەند فرمانێکی بۆ ئەملاولا نووسی، چەند پیاوێکی تایبەتی بەرەو ئێلی مەنگوڕ و زەرزا و هەرکی و ڕەوەند و بناری و پیران و زوودی و شکاك و دەشتی و مامش و دانیشتووانی شنۆ و لاجان و مەرگەوەڕ و موکری نارد. لە ماوەیەکی کورتدا لەشکرێکی زۆری لە خێڵ و هۆزەکان کۆکردەوە. شێخ قادری کوڕی خۆی بەجێنیشینی خۆی دانا و هەمزاغایشی بەسوپاسالاری لەشکر دەستنیشان کرد و بەرەو ئازەبایجانی ڕەوانە کردن. لەبەرئەوەش کە هەمزاغا دڵی لە فەرمانڕەوای شارۆچکەی سابلاخ ڕەنجاو و تۆڵەی کوشتنی برازاکەیشی هەر لە دڵدا بوو، بۆیە لە سەرەتادا لەشکری بەرەو سابلاخ تاو دا.دوای بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە، ئاغا شازادەی فەرمانڕەوای سابلاخ، چۆنێتی هەلومەرجەکەی بەدەسەلاتدارانی ئازەربایجان ڕاگەیاند و داوای هێز و یارمەتی کرد. بەڵام بەرپرسانی ئەو ناوچەیە پێیان وا نەبوو شۆڕشی کوردان گەیشتبێتە ئەو ئاستە؛ بۆیە فرمانیان دا؛ محەمەد سادق خانی ئاجودانباشی و محەمەد حسین خانی بەختیاری، لەگەڵ (٣٠) سوار و ڕەحیم خانی سەرکردەی چەلیبانی، لەگەڵ (١٠٠) سوار، بەرەو سابلاخ بچن. ئاگاداری ئەوە نەبوون، کە لەشکری کوردان چەندێکن و خراپەیان تا چ ئەندازەیەکە.کاتێك شێخ قادر و هەمزاغا لە "نوچە"وە بەڕێکەوتن، لە سەرەتادا یەکڕاست بۆ هاتنی لەشکر و دابینکردنی کەلوپەلی پێویستی ڕێگە، هاتنە ناو شاری "شنۆ". (٣)) ڕۆژ لەوێ مانەوە. بەرلەوەش شێخ (عوبەیدوڵا) بۆ شارۆچکەی شنۆ بێت، محەمەد ئاغای مامش، سولەیمان ئاغای برازای بۆ "نەهری" نارد، تا هەر کاتێ شێخ عوبەید بیەوێ پشتیوانیی لە هەمزاغا بکا، هەواڵەکە بنێرێ. ئەویش دەستبەجێ هەواڵی نارد، کە شێخ نامەی بۆ دەوروو‌بەر نووسیوە و خەریکی کۆکردنەوەی لەشکرە. محەمەد ئاغا بەپەلە خۆی گەیاندە "سندووس" و باسەکەی بۆ جەلال خانی حاکمی قەرەپەپاغ گێڕایەوە و تێیگەیاند و برایم ئاغای لەگەڵ جەلال خان بەرەو سابلاخ نارد. ئەوانیش دوای گەیشتنیان، باسەکەیان

سـەرلەبەر گێڕایـەوە(١٤). ئاغـا شـازادە وەڵامـی دانـەوە: ئێـوە بـچن بەكۆكردنـەوەی لەشكرەوە خەریك بن، منیش لەگەڵ جەماوەری "موكری" لە دواوە دێـم.دیـسان لـە "مەرگەوەڕ"ەوە هەواڵی هاتنی شێخ قادریان هێنا بـوو. محەمـەد ئاغـا لەگـەڵ بیـوك خانی كـوڕی ئەسـكەندەرخان بەپەلـە بـەرەو سـابلاخ چـوون و باسـی ڕووداوەكانیـان كرد. ئاغا شازادەش سەرانی موكری كۆكردەوە و داوای هاوكاریی لێكـردن، تـا بـەرەو شنۆ بچن. بەڵام هـەر كامێكیـان قـسەیەكیان كـرد و بیانوویـەكیان هێنایـەوە. ناچـار سەلیم خانی چاردۆڵی ئامادەیی خۆی نواند. بـەدوای ئـەودا: محەمـەد سـادق خـان و ڕەحـیم خـانی چـەلیبانی-ش ئامـادەیی خۆیـان دەربـڕی و لەگـەڵ محەمـەد ئاغـا (ی مـامش) و بیـوك خانـدا نێـردران. ئەمانـە لەگـەڵ چـەند كەسـێكی كـەمی مـامش و قەرەپەپاغ و" ... هتد، تا دۆڵی سندووس چوون و (٣) ڕۆژ لەوێ مانـەوە.كـاتێ شـێخ (عوبەیـدوڵلا) گەیـشتە شـنۆ، هـیچ هێزێكـی پـشتیوانیی لـە ورمـێ و سـابلاخەوە نەگەیـشتبوون(١٥). لـەم سەروبەندەشـدا هــەواڵی ئـەوە بڵاوبــووەوە؛ كــە شــێخ (عوبەیدوڵلا) خۆی بـۆ ئـەوە تـەیار و ئامـادە كـردووە تـا سـەرەتا هـۆزی قەرەپـەپاغ بكـوژن و تـاڵان بكـەن. ئەمانـەش هەركـە ئـەم هەواڵـەیان بیـست، ترسـان و محەمـەد ئاغای مامشیان بۆ شنۆ نارد و خۆیان بـەرەو سـندووس گەڕانـەوە. سـەلیم خـان زۆر هەوڵیــدا ڕایــانگرێ، گوێیــان نەدایــە. ناچــار ئــەویش بەتــەنیا بــەرەو ســابلاخ گەڕایـەوە.بـەڵام شـێخ (عوبەیـدوڵلا) لـە شارۆچـكەی "شـنۆ"وە بـەرەو سـندووس بەڕێكەوت.خەڵكی سـندووس و قەرەپـەپاغیش، كـە بـریتی بـوون لـە: جـەلال خـانی حاكم و بیوك خـان نـایبی ئـاجودان و حەسـەنعەلی خـانی سـەرهەنگ و خـان كـیش خان و ئیبراهیم ئاغـا و عـەباس ئاغـا، لـە هـەواڵی هـاتنی شـێخ ترسـان. هـەر چـۆنێ لێكیان دایەوە، دەرەقەتی شەڕی شێخ نایەن، بۆیە هەموویان سوارە و پیادە، چـوونە پێشوازیی شێخ و بەم شـێوەیە گیـان و مـاڵی خۆیـان پاراسـت. سـەد خـەروار گـەنم و پـەنجا خـەروار جۆیـان بـەناو "سیورسـات"ەوە(١٦) بەلەشـكرەكەی شـێخ دا. ئـەویش بڕیاری دا، كە كەس ناتوانێ ئازاری دانیشتووانی گوندەكانی سـندووس بـدات.لـەوێوە بــەرەو ســابلاخ كەوتنــە ڕێ، قەرەپەپاغــەكان تكــای ئــەوەیان كــرد، لەبەرئــەوەی

سوارەکانیان لـە خۆراسـان فرمانیـان پـێ سـپێردراوە، دەبـێ لـەوە ببـوورن، کـە ئێمـە ناتوانین بۆ سابلاخ بێین.شێخ قادر مۆڵەتی دان، بەلام بڕیار درا دەبێ سیۆرسـات بـۆ لەشکر دابین بکەن و بینێرن. شازادەش کە هەواڵی هاتنی شێخ قادری بـۆ سـندووس و پێشوازیی خەڵکی سندووسیشی بیستبوو، لەولاشـەوە خـەڵکی سـابلاخ و خێڵـەکانی موکریانیشی لەگەڵ شێخ هاودڵ بـینی؛ لـە هـەلاتن زیـاتر، هیـچی تـری شـك نـەبرد، بەناچـاریی لـە سـابلاخەوە لەگـەڵ محەمـەد سـادق خـان و محەمـەد حـسێن خـان و ڕەحیم خان بەرەو سابلاخ هەلاتن. شەو لە "میاندواو" مانـەوە و بـۆ بـەیانی بـەرەو "مەراغـە" چـوون. لەولاشـەوە شـێخ قـادر و هـەمزاغا لەگـەڵ هـۆزی مـەنگوڕ و عەبدوڵلا خان و ئیبراهیم خانی زەرزا و عەلی ئاغا لەگەڵ هۆزی هـەرکی، محەمـەد ئاغا لەگەڵ ئیلی ڕەوەند، شێخ جیهانگیر لەگەڵ خێڵی بنـاری، مامەنـد ئاغـای پـیران، قەرەنی ئاغا لەگەڵ ئیلی زودی؛ قاسم ئاغای کوڕی عەلی خان لەگەڵ سوارەی شکاك، دەرویش ئاغای نەعمان ئاغای هەرکی، عەبدال بەگ لەگـەڵ هـۆزی دەشـتی، قۆتیـاس ئاغا لەگەڵ خەڵکی سۆمای برادۆست، محەمەد ئاغای مستکانی، کوێخا مولهیم لەگەڵ خەڵکی مەرگەوەڕ، عوسمان ئاغای گەورك، محەمەد ئاغا لەگەڵ خێڵی مامش چوونە نـاو سـابلاخەوە. خـەڵکی شـار و سـەرانی مـوکری و مـەلاکانی ئـەهلی سـوننە، پێـشوازییان لێکـردن. (٣) سـێ ڕۆژ لـەو شارۆچکەیەدا مانـەوە. "خـان بابـا خـان"ی کوڕی مەجید خانیان کردە فەرمانڕەوای سابلاخ و بەرەو میانـدواو بەڕێکـەوتن.ئـەو کەسانەی (چ خەڵکی شار و چ سەرانی موکری) لەگەڵ شێخ (قادر)ا هاوکارییـان کـرد و بەرەو میاندواو لەگەڵیدا چوون، بریتی بوون لە: میرزا عەبدولوەهابی قازی، میرزا قادری قازی، میرزا قاسمی قازی، شێخ جەسیم (ئیمـام جومعـە)، شێخولئیـسلام بـایز ئاغای نەقیب، کوڕی مەلەکولقاسمی مـیرزا، عەبـدوڵلا ئاغـای کـوڕی مـەحموود ئاغـا، خـەلیل ئاغـا، کوڕەکـانی محەمـەد کـەریم بـەگ، فـەتحوڵلا خـانی کـوڕی موزەففەرولدەولـە، کوڕەکـانی تـری مەجیـد خـان، ئـەمین ئاغـای کـوڕی قـادر ئاغـا، سەلیم بەگ و کوڕەکانی فەیزوڵلا بەگ، عەزیزی فەتاح، حەسەن ئاغـا، سـەلیم بـەگ و کوڕە بەناوبانگەکانی، ئاغا و خولەفا و شێخەکانی تری ئەهلی سوننە" لـە شـارەوە،

بەرەو گوندی "حاجی حەسەن" چوون؛ کە قۆناغەرێیەك لە میاندواوەوە دوورە و لەو گوندەدا (٥٠ هەزار) کەس سوارە و پیادە دابەزین.**بەشی پێنجەم**باسی هاتنی عەلی خانی حاکمی مەراغە، بۆ یارمەتیدانی خەڵکی میاندواو و کوشتن و تالانکردنی میاندواودوای بلاوبوونەوەی هەواڵی هاتنی شێخ (قادر) بۆ شارۆچکەی سابلاغ و هاوکاریکردنی خەڵکی ئەوێ و نیازی بەرەو میاندواو هاتنی؛ عەلی خان حاکمی مەراغە، لەگەڵ محەمەد سادق خانی سەرکردەی سوارەی بەرەی پێشەوە و محەمەد حسەینخانی بەختیاری و محەمەد سادق خانی ئاجودانباشی ئەفسەری حەزرەتی وەلیعەهد و حاجی میرزا و ڕەزا قولیخانی ئیسفەهانی و ڕەحیم خانی فەرماندەی سوارەی چەلیبانی، بەگالیسکەیەك لە مەراغەوە بەڕێ کەوتن. بەدەم ڕێوەش لەگەڵ سەلیم خانی چاردۆڵی(١٧) یەکدەگرنەوە و بەرەو میاندواو دێن.سێ (٣) سەعاتی ڕۆژی دەمێنێ، دەگەنە شار. تۆپ دەبەنە شار و بەرامبەر دوژمن لە "باستیان" دایدەنێن. خانووەکەی ئەحمەد خانیش (کە ئیدارەی دەوڵەتە) دەکەنە بارەگا و شەو هەتا بەرەبەیانی، تەگبیری کاری ئەو بێ تەگبیرانە دەکەن.(٢٠٠) دووسەد کەس لە دەستەی سوارەی بڵباس، بەفرمانی شێخ قادر و بەسەرکردایەتی "نوری بەگ"ی(١٨) خاڵۆی ناوبراو، هێرش بۆ سەر میاندواو دەبەن. لەولاشەوە عەلی خان (ی حاکمی مەراغە) لەگەڵ هاوڕێیانی تری؛ وەك شێری شەرزە، دەستیان کردەوە. ئەو شێرانی شەڕە، تووڕەبوون و سەرلەبەری ئەندامەکانی لەشی دوژمنانیان تێکشکاند. لە نێوان سوارەکاندا لەبەر شەڕ و بگرە و بەردە، گوللەیەکی زۆر تەقێندرا، لە ئاکامدا خاڵۆی شێخ قادر، گوللەیەکی سەلیم خانی (چاردۆڵی) بەرکەوت و بەرەو جەهەننەم نێردرا و سوارەی بڵباس تێکشکان و ڕایانکرد.کاتێك شێخ قادر هەواڵی تێکشکانی سوارەی بڵباس و کوژرانی خاڵۆی خۆی بیست، وەك بەرازی پێکراو و ماری زامدار، خولی دەخوارد. فرمانی کوشتن و تالانکردنی میاندواوی بەو لەشکرە زۆرەی دا. یەکەمین کەسێك، کە بۆ ئەم کارە ناخێرە ڕاست بووەوە، جەلیل ئاغای حەرامزادە بوو؛ کە هەر ئەم جەلیل ئاغایە، چاکە و نیعمەتی زۆری لە دەستی حەزرەتی ئەقدەسی والا: وەلیعەهد دیتبوو، چاوی لە نان و نمەك

پۆشی و بە(١٠٠ سەد) سوارە و (٣٠٠ سێ سەد) پیادەوە، بەرەو میاندواو چوون. کوردەکانی تر، بەهەمزاغا و ئەوانی تریشەوە، هەموویان بەشوێن ئەواندا بەرەو میاندواو بەڕێ کەوتن. عەلی خان و ئەوانی تر شەڕیان پێ نەکرا و جگە لە هەلاَتن، چارەیەکی تریان نەبوو. بەناچاریی تۆپیان بەجێهێشت و ڕایانکرد. خەڵکی شاریش، هەر کەس توانای ڕاکردنی هەبوو، هەلاَت. ئەوانی تر بەردەستی دوژمن کەوتن.**شیعر**:لەبەر ئەو خەڵکە بێ ئەدەبە ڕۆژی خەڵکی میاندواو، وەك شەوی لێهاتلەبەر گوللە؛ ئەوەندە سنگ و بەرۆك زامدار بوون دایك بیری منداڵی خۆی نەما بووئەوەندە کوژراو لێرە و لەوێ کەوتبوون باوك سۆزی بۆ کوڕی خۆی نەما بوولە هەموو لایەکەوە خوێن ئەوەندە ڕژا بوو لە ئاژاوەی ئەو قەومە بێدادگەرەداکەس خۆی نەدەناسییەوەیەکێك خەنجەری ئاورەنگی بەدەستەوە بوو یەکێك دەموچاوی بەخوێن شتبووژنان: هاوار و واوەیلایان دەکرد لە هەموو سووچێکەوە هاوار هەڵدەستاکارەساتەکە بەجۆرێك بوو چاوی جیهان، بۆ حاڵی ئەو داماوانە دەگریامەریخی خوێنمژ، لە بێ بەزەیی ئەو بێ بەزەییانە پەرێشان حاڵ دەبووڕۆژگارێك بوو، کە لە پشت پەردەی عیسمەتیانەوە بای سەبا، بەحاڵە حاڵ هاتوچۆی دەکردکەچی لەوێ سەرپۆشی عیسمەتیان لەسەریان دەفڕاند و کیژە ناسکۆڵەکانیانکە لە لانکەی نازدا گەورە کرابوون بەدیل دەگرتنئالاَی زوڵمیان بەجۆرێك هەڵکرد و ئاگری زۆریان بەجۆرێك هەلاَیساند، کە منالی شیرەخۆرە و کەم تەمەنیانلەگەڵ پیری لە پێ کەوتوو بەئاگری زوڵم دەسووتاندزوڵم لەوێ ئەوەندە ئالاَی هەڵکرد کە قەڵەم لە بەرامبەر نووسینیدا دۆش داماوەبەڵێ دوای سێ ڕۆژ و شەو، کە بەردەوام خەریکی کوشتن و تالاَنکردن بوون، یەك کەس لە خەڵکی شاری میاندواو، لەو شارەدا نەما، ئیتر یان هەلاَتن، یان کوژران، یان بەدیل گیران.شێخ قادری حەرامزادە، نامەیەکی بۆ باوکی نووسی؛ کە لە سایەی سەری بنەماڵەی "تاها"١٩)) و بەختی حەزرەتی "شێخ"ەوە(٢٠)، لەو ڕۆژەوەی لە "نوچە"وە کەوتووینەتە ڕێ، تا ئێستا، ڕوومان لە هەر شوێنێك کردبێ، کەس لە فرمانمان دەرنەچووە؛ جگە لە خەڵکی میاندواو، کە کەمێك پێی بێ ئەدەبییان

درێژ کرد و سەرپێچیان کردین؛ بۆیە بوون و نەبوونیانمان وەك تۆز و خۆڵ بەبا کرد و ماڵمان لێ وێران کردن.هەمزاغا و فەرماندەکانی تریش، هەر وایان نووسی و بەپەلە بۆ "شێخ"یان نارد.**بەشی شەشەم**بەلاّم پاش کوشتاری میاندواو، هەمزاغا و هەندێك لە سەرانی موکری و عەشیرەتەکان، لەبەر تاوان و خیانەتی خۆیان، لە غەزەب و توورەیی "حەزرەت - ظل الله - ڕۆحی عالەم بەفیدای بێ"، ترسان و وایان لێکدایەوە؛ کە ئەم شەڕ و خراپەکارییە، ناشارردرێتەوە و کەس ئەرکی ئەم مەترسییە، بەئەستۆ ناگرێ. لەبەرئەوە باشتر وایە خێڵی قەرەپەپاغیش بەهاوبەشی خۆیان دابنێن، کە بۆ هەوێنی ئەم خراپەکارییە، هەرچی زۆرتر بێ باشترە، چونکە شتی لاواز، بەشتی بەهێز تیا دەچێ؛ بۆیە هەموو پێکەوە بۆ بارەگاکەی شێخ (عەبدولقادر) چوون و وتیان: خێڵی قەرەپەپاغ دڵیان لەگەڵ دڵی شێخ نییە و لەم شتە دەترسین، نەوەك ببنە هۆی لەبەریەك هەڵوەشان و بلاّوبوونەوەی لەشکر و سەربازەکان، کەوایە وا باشترە هەموویان بۆ ئێرە بانگ بکەین، تا خەیاڵی سەرپێچی کردن نەکەن.شێخ قادر بۆچوونەکەیانی بەدڵ بوو. فرمانی بۆ جەلال خان و حەسەنعەلی خانی سەرهەنگ و بیوك خان نووسی؛ تا سەرکردەکانی بەسوارییی بۆ ئێرە بێن و تێکەڵ لەشکری ئێمە ببن؛ ئەگەریش درەنگ بکەن، بەدڵنیاییەوە دەبنە نێچیری گوللەی ئێمە.لە کاتی گەیشتنی نامەی شێخ قادردا، لای ئیقبالدەولەوە هەواڵ گەیشت، کە لەشکری "خۆی"، لەگەڵ شەجیع عەلی خان گەیشتوونەتە "ورمێ" و لەشکری "ئەفشار"یش ئامادەیە و مەترسن، بەیانی دەگەینێ.جەلال خان خێرا ئەم هەواڵەی بەوردی بەگوێی محەمەد ئاغای مامش گەیاند. ناوبراویش هەرکە ئەم هەواڵەی بیست، بەبیانوویەکەوە مۆڵەتی لە شێخ قادر وەرگرت و بەرەو "سندووس" بەڕێکەوت. بەلاّم لەشکری کورد، بۆ گەیاندنی تالاّنییەکانیان بۆ جێگا و ماڵی خۆیان، لە شێخ جیابوونەوە. شێخیش بۆ سابلاّخ گەڕایەوە. بەلاّم چونکە ئەو ڕێوی سیفەتانە، لە کوشتنی خەڵکی بێ دەسەلاّت و بێوەژنان دەمە چێشتە ببوون و شتێکیان چنگخستبوو، دیسان لە دەوری شێخ کۆبوونەوە و بەتەمای سندووس بوون. خەڵکی سندووسیش لە نەگەیشتنی یارمەتی و بلاّوبوونەوەی ئەم

هەواڵەش(٢١)، زۆر ترسـان و جـەلال خانیـان بـە(١٥٠ سـەد و پـەنجا) سـوارەوە ڕووەو ساباڵاخ نارد. محەمەد ئاغاش بەناچاریی چاوی لەو کرد.لـەوێوە شـێخ (قـادر) بـە(٥٠ هەزار) کەسەوە بەرەو "مەراغە" و "بناو" بەڕێکەوت. بەڵام هێشتا شێخ لە سـاباڵاخ دەرنەچوو بوو، کە هـۆزی "پـیران" هێرشـیان بـۆ سـەر قـەڵای "لاجـان" کـرد و (١٠٠ سـەد) سـەرباز و تۆپـچی سـاخلوی ئـەوێیان گـرت و تۆپـەکانیان شـکاند و خـستیاننە چاڵاوەوە و سەربازەکانیشیان بۆ لای شێخ هێنا. بەڵام محەمـەد ئاغـای مـامش لەبـەر نان و نمەك کردنی دەوڵەت و دۆستایەتیی لەگـەڵ ئەفـشار، لای شـێخ (عەبـدولقادر) تکای ئازادکردنی بۆ کردن و لە لایەن شێخەوە بەخشران و خـوێنی نەڕشـتن. بـەڵام تفەنگ و کەلوپەلەکانیان لێ دامـاڵین و مەرەخەسـی کـردن؛ ئـەوانیش بـەرەو ورمـێ گەڕانەوە.

**بەشی حەوتەم**

**باسی ئاگاداربوونی بەرپرسانی حەزرەتی ئەقدەس ئەسعەد ئەرفەع والا: وەلیعەهـدی لانکە کەیوان لە خرا پەکاریی کوردان و ناردنی لەشکری سەرکەوتوو لە تـەورێزەوە بـۆ بەربەرەکانێ لەگەڵیان و هەواڵ ناردن بۆ دار الخلافەی تاران و بەڕێکەوتنی لەشـکری "عێراقـی"، بەسـەرکردایەتی نـەواب ئەشـرەف والا: حیـشمەتولدەولە**.دوای ئاگـاداربوونی بەرپرسـانی حـەزرەتی ئەقـدەس ئەرفـەع والا: وەلیعەهـد (ڕۆحمـان بەفیدای بێ) لـە چوونی شـێخ (قـادر) بـۆ شارۆچکەی سـاباڵاخ و هاوکـاریکردنی لـە لایـەن خێڵـەکانی قەرەپـەپاغ و مـوکری و هـەڵاتنی نـەواب والا: ئاغـا شـازادە؛ وایـان بەچاك زانی کـە پیـاوێکی عاقـڵ و کامـڵ و بـاش، بکاتـە فـەرمانڕەوای ئـەوێ، بـەڵکو بەدڵخۆشیی دانەوە، خێڵ و عەشیرەتەکان دڵنیا بکاتەوە و لـە خـەیاڵی خراپـەکاریی، دووریان بخاتەوە و کار نەگاتە ئاستی شەڕ و کوشتن. لەبەرئەوەش کە "سەدردەولە" لە لایەن حەزرەتی والا؛ شانازیی پلـەی ئێـشك ئاقاسـی باشـی گـەری پـێ بـڕاوە و لـە هونەری سەرکردایەتیکردن و بەڕێوەبردن و خەڵك نەوازییدا دەستی باڵای هەبووە؛ ڕایانسپارد و لەگەڵ سوارەی کۆمەڵێکی تەهماسبقولی خـان یۆزباشـی، ڕەوانـە کـران. بەڵام دوای بیستنی هەواڵی بارودۆخی میاندواو و خەڵکی مەراغـە و بنـاو، ترسـان و

سکالأنامەیان بۆ خاکی بەرپێی حەزرەتی والا نووسی و چۆنێتی ڕووداوەکەیان بۆ ڕوونکردنەوە و یارمەتییان خواست. بەفرمانی حەزرەتی والا، ڕۆحمان بەفیدای بێ، مقّرب الخاقان: ئاغا خانی سەرتیپی ئەفشار و مقّرب الحضرەتی بالأ: لوتفعەلی خانی سەرهەنگ، بە(٤٠٠ چوارسەد) سەربازەوە لە فەوجی چوارەم و فەوجێکی ئەمیرییە، بەچوار گالیسکە تۆپەوە، ڕۆژی ٢٥ی مانگی شوال المکرمی ١٢٩٨ کۆچی (١/١٠/١٨٨٠ز)، لە تەورێزەوە بەڕێ کەوتن، بۆ سبەینێ: شەممە ٢٦ی مانگی شەوالی ١٢٩٨ کۆچی (٢/١٠/١٨٨٠ز)، محەمەد خانی سەرهەنگ موهەندیس، لە بەرەی موهەندیسیەوە ناردییانەوە و لە نزیك بارەگای خانەقا، کە لە پەنا "شاهی" دایە، ئاغا خانی سەرتیپ لەگەڵ "حاجی سەدرولدەولە"، یەکتر دەگرنەوە و پێکەوە بۆ "بناو" دەچن و لە ئاقار و دەوروبەری شارەکە سەنگە لێ دەدەن و لە هەر دۆڵێکیشدا تۆپ و سەرباز دادەمەزرێنن و خەریکی پاسەوانیی دەبن.دوای گەیشتنی ئەم هەواڵأنە بەدار الخلافەی تاران لە دەرباری هەمایۆن: ئەعلاحەزرەت شەهریاری (ڕۆحی من و ڕۆحی هەموو جیهان بەقوربانی بێ)، بڕیار درا کە میر میرانی گەورە: مستەفا قولیخانی ئیعتیماد سەڵتەنە (فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان) وەك سەرکردایەتی گشت لەشکر، بەڕێ بکەوێ، ناوبراویش لەگەڵ فەوجی "بەهادۆران"، بەیاوەریی سەیید محەمەد خان و فەوجی دووەمی تایبەت، بەسەرهەنگیی: مقرّب الحضرەتی بالأ: حاجی عەلی خانی کوڕی حاجی حسام الدولە و سێ دەزگا تۆپ و جبەخانە، بۆ ناو "بناو" هاتن. شەو لەوێ مانەوە. بۆ بەیانی محەمەد خانی سەرهەنگ موهەندیسی بۆ ئاقاری شار نارد، تا شوێنی سەربازگەکە دەستنیشان بکات. ئەویش دوای دەستنیشانکردنی شوێنەکە، ڕایگەیاند: فەوجەکان و تۆپخانە بەرەو کەنار شار بەڕێخەن.ئیعتیماد سەڵتەنەش بارەگای خۆی لە ناوەندی سەربازگەکە دامەزراند، کە ڕووبەڕووی ڕێگەی هاتنی کوردان و ڕووی لە مەیدانی شەڕەکە بوو. پشتەوەی لەشکرەکەشی بەمقرب الخاقان ئاغا خانی سەرتیپ سپارد. سەرکردایەتی لەشکرەکانی "بناو"یش بریتی بوون لە: میر میرانی هێژا ئیعتیماد سەڵتەنە، عمدە الامراو العظام: حاجی سەدرولدەولە، مقرب الخاقان ئاغا خان

سەرتیپ لەگەڵ (٤٠٠ چوارسەد) سەربازی فەوجی چوارەمی تەورێز، حاجی عەلی خانی سەرهەنگ لەگەڵ فەوجی دووەم، بەتایبەتیش سەیید محەمەد خانی یاریدەدەری فەوجی بەهادۆران، لوتفعەلی خانی سەرهەنگ لەگەڵ دەستەی ئەمیرییە، بیوك خانی سەرهەنگی مەراغە، محەمەد خانی سەرهەنگ موهەندیس؛ لەشکری سوارەش بریتی بوون لە: محەمەد حسێن خانی بەختیاری بە(٤٠٠ چوارسەد) سەربازەوە، ئیبراهیم ئاغا قەراجەداغی بە(٢٠ بیست) سەربازەوە. هەمووشیان سەنگەرەکانیان دامەزراند و چەندین مەتەرێزیان دروست کرد و تۆپ و تۆپخانەیان لە جێگای خۆیان دانا و ئامادەی شەڕ و چاوەنواڕی گەیشتنی دوژمنیان کرد.دوای ئەوەی هەواڵی دەرکەوتنی شێخ عوبەید بەدار الخلافەی تاران گەیشت، لە لایەن دەربارى موعەدەلەت مەداری حەزرەت، سێبەری خوداوەند (ڕۆحی من و ڕۆحی جیهانی بەقوربان بێ)، فرمان درا، کە: حەزرەتی ئەشرەف ئەرفەع ئەمجەد والا: کامەران میرزای نایب السلطنەی ئەمیری گەورە، سوپایەکی خوێنڕێژ، بەرەو ئازەربایجان بنێرێ، تا بوون و لە مانی خراپەکاران بەبای فەنادا بدات. بۆیە نواب ئەشرەف ئەمجەد والا: "حەمزە میرزای حیشمەتولدەولە"ی(٢٢) کردە سوپاسالاری لەشکر. دوو فەوجی ئازەربایجانیش، کە بەمحەمەد قولیخان حسام الدوله سپێردرا بوون، لە دار الخلافەوە (واتە: لە پایتەختەوە) بەڕێ کەوتن.نەوابی والا بۆ دابینکردنی کەلوپەلی پێویست (٣ سێ) ڕۆژ لە مەیدانی ئەسپ سواریدا، بەتۆپخانە و فەوجی شاسەر و ژریمانی یەکەمەوە مانەوە، ڕۆژی هەینی، ٩ی مانگی زیقەعیدە (١٨٨٠/١٠/١٥ز) لە ئەسپ سوارییەوە قۆناغیان بردە گوندی "کەن"، کە گوندێك بوو لە گوندەکانی دار الخلافە.بۆ بەیانی بەوپەڕی ڕێکوپێکییەوە لە گوندی ناوبراوەوە بەڕێ کەوتن. بەڵام دەستەگەلی ئازەربایجانی، کە بەر لە نەوابی بالاْ بەڕێکەوتبوون، بۆ ئەوەی هێزەکان بگەن، لە گوندی "کەرەج" ڕاوەستان. هەر لەبەرئەوەش قۆناغی ئەو ڕۆژەیان لە گوندی کەرەج بوو. لەوێشەوە کە هێزەکان یەکیانگرتەوە، ئیتر لە ناو ڕێ ڕانەوەستان و شتێکی تازە ڕووی نەدا. ڕۆژی ١٤ی زیقەعیدە (١٨٨٠/١٠/٢٠ز) گەیشتنە "قەزوین".دەستەگەل و سوارە خەڵکی قەزوین

لەگەڵ "نصر الملك"، کە فرمانی پێ کرابوو لەشکر و سەرباز کۆبکاتەوە، بەرەو پیریان هاتن. نەوابی والا، بەوپەڕی سەربەخۆییەوە هەزار "جریب"ی(٢٣) بۆ شوێن سەربازگەکە دیاری کرد.ڕۆژێکیان بۆ کۆکردنەوەی سەربازی قەزوین و حەسانەوەی هێزی پیادە تەرخان کرد. ڕۆژی ١٦ی زیقەعیدە (١٨٨٠/١٠/٢٢ز) بۆ بەڕێکەوتنی لەشکر دەرکرا. جەماوەری لەشکرەکە دەستە دەستە وەك شەپۆلی زەریا بەڕێ کەوتن؛ جگە لە ڕۆژێك نەبێ، کە لە "قوتی ئاوا" بۆ حەسانەوەی هێزەکان ڕاوەستان. ئیتر شتێکی ئەوتۆ ڕووی نەدا.ڕۆژی ٢٤ی زیقەعیدە (١٨٨٠/١٠/٣٠ز) گەیشتنە شارۆچکەی "بیجاڕ"، کە ناوەندی فەرمانڕەوایی ناوچەی "گەڕووس"ە و لە پەنا ئەم شارۆچکەیەدا باروبنەیان خست. حیسامولمولکیش کە چوار ڕۆژ پێشتر لە بەڕێکەوتنی نەوابی والا، بۆ بەڕێ خستنی (٤ چوار) فەوجی هەمەدان، لە دار الخلافەی بیجاڕییەکانەوە بەڕێکەوتن، ئەویش عەلی ئەکبەر خانی سەرهەنگ، فەوجی مەنصووری بۆ ناردنی چادر و جلوبەرگ و کەلوپەلی پێویستی تر، لە دار الخلافە دامەزراند و خۆی بۆ هەواڵ ناردن دەچێ.لە هەموو جێگەیەك یاڵی ئەسپیان کردە سەرین و زینیان کردە جێگەخەو چادریان کردە ئاسمانی سەر سەریان. هەشت ڕۆژ دوای گەیشتنە "هەمەدان"، فەوجی شەشەم و مەنصوور و هەواڵنێران و (١٠٠ سەد) سواری تر، کە خۆیان داوای هاتنیان کردبوو، لە گوندی "قەهرومین"ی مەحاڵی هەمەدان (قۆناغەرێیەك لە بیجاڕەوە دوورە) ئامادەبوون. عەلی ئەکبەر خانی سەرهەنگیش بەخۆی و هەندێك کەلوپەلی ترەوە، هەر لەو گوندە تێکەڵ بەفەوجەکان بوو. ئیتر حیسامولمولك چاوەنواڕی گەیشتنی کەلوپەلی تری نەکرد و یەکسەر بەرەو شوێنی دیاریکراو بەڕێ کەوت. ڕۆژێك بەر لە گەیشتنی نەواب ئەشرەف والا: حیشمت الدولە (هەمزە میرزا) گەیشتنە بیجاڕ. هەلومەرجەکانیشی بەتەلگراف عەرزی حەزرەتی ئەقدەس ئەرفەع والا: نایب السلطنە، ئەمیری گەورە کردبوو. ئەمەش دەقی وەڵامی تەلگرافی حەزرەتی ئەشرەفی والایە - ڕۆحمان بەفیدای بێ.مقرّب الخاقان حیسامولمولك، تەلگرافتان گەیشت و حەزرەتی پاشا چاوی موبارەکیان پێی کەوت. ئەم خزمەتەی ئێوە و گەیشتنی

فـەوجی شەشـەم و مەنـصوور و هـەواڵنێران و (١٠٠ سـەد) سـوار، بـەر لـە گەیـشتنی لەشکری گەورەی ئەکرەم کامکار: حشمت الدولـە، بـە"بیجارِ" زۆر بـەدڵی حـەزرەتی "شا" بووە، فـەرموویان تـەلگرافتان بـۆ دەنێـرم، سـەد هـەزار جـار ئافـەرین بـۆ ئـەم خزمەتەتان، کە سەرنجی زۆریان پێ دەدرێ و خزمەتی ئێوەش بەچاوی موبارەکیـان ون و بێ پاداشت نابێ. هەرچەندە بڵێین گـەورەییان فـەرموو. سـەبارەت بەئـەکرەم کامکار: حشمت الدولەش، بەجیاواز تەلگرافێ بۆ کراوە؛ کە بـەپێی فرمـان، خـۆراك و پێویـستی ئەسـپ و باربـەر (١٠٠ سـەد) سـوار، بـەپێی نرخـی ڕۆژ بـدەن و لـە لایـەن ئێمەشـــــەوە هـــــەواڵی ســـــەربازانی فــــەوجی هەمــــەدان بپرســــــن. (نایب السلطنە ئەمیر کـەمبیر)لـە وەڵامەکـەدا، لەتـەك لـوتفی پاشـایەتیاندا، فرمـانی ڕاوەستانی لەشکریشیان دابوو، تا هێزەکەی حشمت الدولەش دەگات. لە کـاتی هـاتنی نەوابی والادا، هەرسێ فەوج و سوارە، لەگەڵ حیسامولمولك و فەرماندەکانی تردا، بـۆ پێشوازیی ڕەسمیـی، لـە سـەربازگەکە هاتنـە دەرێ و تەشـریفاتیان بـەجێ هێنـا. سـێ ڕۆژ لــە شارۆچــکەی بیجــارِ مانــەوە. لــە بیجــارِ نــەواب ئەشــرەف والا، تووشــی نەخۆشییەك هاتن، کە دواتر بەدرێژتر باسی دەکەین.**بەشی هەشتەم چۆنێتی پەنا هێنانی گولاوی ئاغای کوڕی مارف ئاغــا، بــۆ نــاو لەشـکری سـەرکەوتووی ئیعتیمــاد ســەڵتەنە**.کـاتێ ئیعتیمـاد سـەڵتەنە گەیـشتنە "بنـاو"، دوای تـەواوبوونی کاروبـاری ســەنگەر و مەتــەرێز ئامــادەکردن، هــەر ئــەوە مــا چــاوەنوارِی لەشــکری شــێخ بکات" عەبدوڵڵا بەگ ناوێکی کورد هەبوو. ماوەیەك لای ئیعتیماد سەڵتەنە خەریکی خزمەتکردن بوو. چەند نامەیەکی بۆ سەرانی موکری و قەرەپەپاغ نووسی و بەرەو "میانـدواو"ی نـارد، کـە تیایانـدا نووسـیبووی: لـە تـوورِەیی حـەزرەتی "ظل اللهی" بترسن و بەفریوی فێڵ و تەڵەکەی ڕێوی ئاسای "شێخ" خۆتان مەکەنە نێچیری شێر و شمشێر، هەڵبەتە هەر کەسێکیش لەبـەر بـێ دەسـەڵاتیی، پـەنامان بـۆ بهـێنێ، بـەر سێبەری بەخشینی پادشایانە دەکەوێ، چونکە لێبووردنی ئەم دەرگایە، لە ئەندازەی تـاوان گـەورەترە.دوای ڕۆیـشتنی عەبـدوڵڵا بـەگ و گەیانـدنی نامـەکان، بەخـەڵکی مـوکری و قەرەپـەپاغ، ئیـسماعیل ئاغـا، کـە یـەکێك بـوو لـە سـەرانی قەرەپـەپاغ،

گوێڕایەڵیی کرد و لەگەڵ هەندێ خزم و کەسی خۆیدا بۆ بناو هاتن. ئیعتیماد سەڵتەنەش سۆز و میهرەبانیی بەرامبەر نواندن و خەڵاتی باشی کردن و پاشان فرمانی کرد: بگەڕێنەوە تا بەڵکو ئەوانی تریش بەمیهر و خۆشەویستیی هیوادار بکەن و لەگەڵ خۆتاندا بیانهێنن. تا سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە، ١٤ی مانگی زیقەعیدەی حەرام (١٨٨٠/١٠/٢٠ز) سوارێکی کورد هات و وتی: گولاَوی ئاغای موکری(٢٤)، لە تووڕەیی و غەزەبی حەزرەتی ظل اللهی ترساوە و لە گیانی خۆی بووردووە و ئەوە ئێستا پەنای بۆ سوپای سەرکەوتوو هێناوە و داوای لێبووردن لە دەرباری عەدالەت مەداری حەزرەتی هومایۆنی ئەعلایە و چاوەنواڕی دڵنیایی و زامنی لەم لەشکرە هەیە.ئیعتیماد سەڵتەنەش دوای بیستنی ئەم هەواڵە، فرمانی بەحاجی رەزا قولیخانی ئیسفەهانی کرد، تا لە بارەگای سەربازگەکە بێتە دەرێ و لە لێبووردنی دڵنیای بکات و بۆ ناو لەشکری بەشکۆی بانگهێشتن بکات. حاجی ڕەزا قولیخانیش دەستبەجێ چوو، لە زامنکردن و لێبووردنی دەوڵەت دڵنیای کرد.کاتێ گولاَوی ئاغا بەتەواوی دڵنیا بوو، لەگەڵ ناوبراو بۆ ناو سەربازگە هاتن" گولاَوی ئاغا دەڵێ: ئەوە شێخ قادر و هەمزاغان، کە بەجەماوەرێکی زۆرەوە لە عەشیرەت و خێڵەکان دەگەنێ و ئەوەندە زۆرن، کە ژمارەی سەربازەکانیان لە ئەژمارکردن نایەن، ئەگەر ئاماریان بگریت، لە هەرچی بیر بکەنەوە، زیاترن.ئیعتیماد سەڵتەنە و فەرماندەکانی تر، دوای بیستنی ئەم هەواڵە، هەر کام لە سەنگەری خۆیاندا دامەزران و ئامادەی شەڕ بوون.**شیعر**:هەموو چاکی مەردایەتییان بەلادا کرد هەموو کەلوپەلی شەڕیان ساز کرد لەناکاو، لە دامێنی بەربلاَوی دەشتەوە کێویکی تا بڵێی قورس و قایم دەرکەوتوەك ئەستێرە بریسکەیان دەهات لە هەموو لایەکەوە ئالاَ دەبینراهەموو سوور و زەرد و کەوی و بنەوشەهەردوو سوپاکە ڕووبەڕووی یەك بوونەوە؛ لەم بۆ ئەو و لەو بۆ ئەم. سەدان قسە کرا، پاڵەوانانی پڵنگ کوژ، کە دڵیان وەك دڵی شێر بوو، بەخوێنی دوژمن خاك و خۆڵیان کردە قوڕاو. لەو دەشتە پڕ لە قینەدا، لەبەر دەنگی تۆپ، دەتوت زەوی دەمی داپچڕیوە، لە کوردان ئەوەندە کوژرابوون، دەتوت زەوی بۆتە تەپۆڵکەی مردوو.

دەستەیەك كە ڕووەو سەنگەر هێرشیان دەبرد، گەلێك جار ڕێدەكەوت سەریان دەبەخشی.خودی ئیعتیماد سەڵتەنە خۆی بەو پیرییەشەوە؛ لە شەڕدا خۆی نواند و بەجۆرێك لە بەربەرەكانێدا خۆی ڕاگرت، كە مەگەر هەر لاوان لەو پیرەپیاوەدا ئەو هیمەتە ببینن. بەڵێ ئەگەر بەپێوانەی دەشتێكیش ڕێوی هەبێ، یەك بەچكەشێر بەسە". بەكورتی تا (٣ سێ) ڕۆژ، هەوری بەلاَ، ئاسمانی تەنی و بارانی گوللە، وەك تەرزە دەباری، بەجۆرێك دنیا سەری سووڕ مابوو.دوای هەلاَیسانی ئاگری شەڕ و بەرەنگاریی، هەندێك لە كوردەكان بەرەو شاری "بناو" هێرشیان هێنا و ئەو ماڵانەیان وێران كرد و ئەو كەسانەشیان كوشتن، كە لە ئاقار و دەرەوەی شار بوون. لە سەروبەندی ئەم ڕووداوەدا بەفرمانی ئیعتیماد سەڵتەنە، چەند گوللەتۆپێك، لە سەنگەری دەرەوەی شارەوە بەرەو ڕوویان هاوێژرا. جەنابی حاجی میرزا عەلی قازی "بناو"یش، لەگەڵ خەڵكی شاردا، هێرشیان كردنە سەر و لە شار دەریانكردن.دوای (٣ سێ) ڕۆژ و شەو، شەڕ و كوشتنی كوردان، لەبەرئەوەی هەواڵی لەشكری "ئەراك"یشیان بیست و ئازایەتی ئیعتیماد سەڵتەنەیان بینی، ناچار بەزین و هەلاَتن". بەڵێ شەڕكردن لەگەڵ نەڕە شێر، بۆ ڕێوی پیر، ئازایەتی ناهێنێ.چەند ڕۆژێك دواتر جەنابی حەسەنعەلی خان؛(٢٥) وەزیری "فەوائید"، كە لەسەر داوای خۆی لە ناوچەی "گەڕووس"ەوە بەرەو ئەو شوێنە دەهات، لەگەڵ فەوجی گەڕووس و سوارەی "دویرن" و "قادر ئاغا"(٢٦))، كە بە(١٠٠ سەد) سوارەوە لە ناوچەی "سایین قەلاَ"وە تێكەڵ بەهێزەكەی وەزیر (ی فەوائید) ببوون؛ گەیشتن و لەوێشەوە دوای (١٤ چواردە) ڕۆژ ڕێ، بەرەو "قەرەقشلاَق" بەڕێ كەوتن.لەم سەروبەندەدا شێخ قادر لە سابلاَخ بوو، هەركە بیستی ئیعتیماد سەڵتەنە بەرەو "چلیك" بەڕێ كەوتووە و هەواڵی گەیشتنی هێزەكەی "ئەراك"یشی زانی؛ ئیتر خۆی پێ نەگیرا و خەیاڵی هەلاَتنی بەرەو "شنۆ"ی كەوتە سەر. خەڵكی سابلاَخیش لە مەبەستەكەی گەیشتن و چوونە ماڵەكەی و وتیان: ئێمەت بۆ هەتا هەتایە لای دەوڵەت بەتاوانبار دانا و بووینە خائین، ئێستاش دەتەوێ هەڵبێیت!؟ ئێمە ئەو كارەمان پێ باش نییە؛ لەبەرئەوە یان دەبێ بەرگریی بكەیت، یان سەری

ئیتاعەتیان بۆ دانەوێنە. ئەگەر بێتو مەسەلەی لێبووردنی حەزرەتی ظل اللهي لە ئارادا مابێ، ئەوا هەردوو لامان دەگرێتەوە. ناچار شێخ قادر وەڵامی دایەوە، کە: هێشتا من ئەوەندە لاواز نەبووم، تا بیر لە هەڵاتن بکەمەوە. من بۆ دابینکردن و کۆکردنەوەی خواردەمەنی و یارمەتی بۆ ئێرە هاتووم، ئێوە نابێ بەوجۆرە بیر بکەنەوە، کە من هەڵدێم و ئەمە کاری پیاوانی شەڕ نییە؛ کە گەورەپیاوانی ئێمە لە کاتی گیانەلادا وتوویانە: النار والعار. ئەوانیش وەك عەوامی تێنەگەیشتوو، فریوی پیاوێکی بەئەزموونیان خوارد و بلاوەیان لێ کرد. شێخیش بەهەلی زانی و بەشەو بەرەو شنۆ هەلات.لە قۆلێکی ترەوە، کاتێ ئیعتیماد سەڵتەنە گەیشتە ناو مەحاڵی "چلیك"، دوو ڕۆژ لە کەنار "جەغەتوو"دا مایەوە، لەوێشەوە بەرەو "قەرەقشلاق" بەڕێ کەوتن، کە (٣ سێ) قۆناغەڕێیە (١٨ کیلۆمەتر). هەرکە هەواڵی شێخ قادریان بیست، سوارەکانی "شاهسەوەن" و "چەلیبانی" لەگەڵ جەماوەری قەرەپەپاغ، دوای شێخ (قادر) کەوتن. پاش شەڕێکی سەخت، کە نزیکەی (٢٠٠ دووسەد) کەس لە جەماوەری قەرەپەپاغ کوژران و برینداركران، شێخ قادر لە کێوی باکووری شارەوە، بەرەو "مەرگەوەڕ" هەلات. ئەمانەش لە شارەکەدا دەستیان بەکوشتن و تالانکردنی خەڵك کرد و بۆ "قەرەقشلاق" گەڕانەوە. تا کاتی تەشریف هێنانی حەزرەتی ئەجەل ئەکرەم: سوپاسالاری گەورە و لەشکری "ئەراکی"، کە پاشان باسی دەکەین.**بەشی نۆهەم باسی گەیشتنی هەواڵی کوشتاری "مياندواو" بەمقلی خانی "ئیقبالدەولە" و چوونی شێخ عوبەید بۆ "ورمێ"**.کە هەواڵی گرتنی سابلاخ بە"ئیقبالدەولە"ی فەرمانڕەوای شاری "ورمێ" دەگات، کزە لە جەرگییەوە هەڵدەسێ و مووی لەشی وەك شیش ڕاست دەبنەوە. دەستبەجێ لەگەڵ فەوجی حەوتەم و هەشتەم بەفەرماندەیی خەسرەوخان و خان بابا خان و محەمەد ڕەزا خان سەرتیپی تۆپخانەی "موبارەکە" و دوو تۆپ، لە سێ کیلۆمەتری شاردا ئۆردوو دادەمەزرێنن. (٥ پێنج) ڕۆژیش دواتر شێخ عەلی خانی سەرتیپ، بەفەوجی "خۆی"یەوە دەگاتێ و تێکەڵ هێزەکەیان دەبێ. دوو ڕۆژ دواتر، هەواڵی کوشتاری "میاندواو" لە "ورمێ" بلاودەبێتەوە. ئیقبالدەولە پاش بیستنی ئەم هەواڵە

ترسناکە، بڕیـار دەدا لەگـەڵ تۆپخانـە و فەوجـەکان بـەرەو میانـدواو بـەڕێ بکـەون. بۆیە هەندێ لە گەورەپیاوان و سـەرانی شـار کۆدەکاتـەوە و باسـی ڕووداوەکـەیان بـۆ دەکا و داوای دڵنیاییان لێ دەکات، تا ئاگایان لە شار بێ. ئەو گەورەپیاوانەش بریتی دەبـن لـە: جـەنابی ئاغـا مـیرزا حـسەینی موجتەهیـد، جـەنابی ئاغـا سـەیید ئاغـای پێـشنوێژ و ئاغـا مـیرزا محەمـەد حـسین نـاڤم العلمـا، حـاجی مـیرزا موحـسین لەشکرنووس؛ کە لە ڕاستیدا یەکێکە لـە گـەورە سـەرانی شـار، لەگـەڵ شـەفیع خـانی کوڕی جیهانگیر خـانی بێگلـەربێگی، عەبدولعـەلی خـانی سـەرهەنگ و حـاجی مـیرزا عەبـدوڵلای کەلانتـەر.سـەرلەبەیانی ئـەو ڕۆژە، کـە ڕۆژی یـەك شـەممە: ٢٧ی مـانگی زیقەعیـدەی حـەرام ١٢٩٨ کۆچـی (١٨٨٠/١١/٢ز)، نزیکـەی (٢٠٠٠ دووهـەزار) سـوار و پیادەیان لە دەرەوەی شار ئامادە کرد و دڵنیا دەبێ لەوەی کە ئاگایان لە شار (ورمێ) دەبێ. بەڵام کاتێ لەولاوە هەواڵی لاجان و سندووس و سابلاغ و کوشـتاری میانـدواو بەگوێی شێخ (عوبەیدوڵلا) گەیشتەوە، بۆ ئەوەی تەگبیرێ بکا و فێڵێـك سـاز بکـات، تـا ئیقبالدەولـە لـە شـار دەربـچێ و خـۆی بـەبێ شـەڕ بـۆ نـاو شـار بـچێ؛ شـێخ محەمەدئەمین ناوێك دەکاتە فەرماندەی لەشکر و لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر لـە ئیلـی شکاك و" هتد، بەرەو قەلای "سمایل ئاغا"یان دەنێرێ، کە لـە شـاری "ورمـێ"وە دوو قۆناغەرێ دوورە.سەعاتێك لە شەو تێدەپەڕێ، کە ئەم هەواڵە بـەگوێی ئیقبالدەولـە دەگاتـەوە، نـاوبراو ناچـار بـەرەو میانـدواو بـەڕێ ناکـەوێ و ڕوو لـە قـەلای "سمایـل ئاغـا" دەکـا و بـۆ قایمکـارییش شـێخعەلی خـانی سـەرتیپ بەدەسـتەی "خـۆی" لـە "چـەمەن خـاتوون" دادەنـێ، کـە لـە نزیکـی شـارە. دوای ئـەوەی دەگەنـە قەلاکـە و لەگـەڵ هێزەکـەی "شـێخ محەمەدئـەمین" ڕووبـەڕووی یـەکتر دەبنـەوە، چوار ڕۆژی بـەردەوام خـەریکی شـەڕ و کوشـتن و پێکـدادان دەبـن. کـاتێ هـەواڵی زیـادبوونی جەماوەر و لەشکری کوردان، بەگوێی شێخعەلی خان دەگاتەوە، دەسـتبەجێ دەچـێتە دەرەوە و ئاقـار شـار و خـۆی بەسـەربازگەکە دەگەیـەنێ. بـەڵام کـاتێ شـێخ عوبەیـد هەواڵی بەڕێکەوتنی لەشکری بیست، لەگـەڵ جـەماوەرێك لـە عەشـیرەت و خێڵـەکان، ڕووی لە ورمێ کرد؛ کە ناوی هەنـدێ لـە سـەرانی ئـەو عەشـیرەت و خێلانـە بـریتی

بوون لە:تەمیر ئاغای شکاك، ڕەشید خان بەگی نوچە، عەبدالّ بـەگی نوچـە، بـرایم خان، قادر بەگ، ئەمین بەگ، سەعید بەگ، سەمەد خان، وەهاب خان، عـەزیز بـەگی دەشتی، عەبدولسەمەد بەگی بناری، سەعید ئاغای هەرکی، خـزم و کەسـوکاری شـێخ (عوبەیـدوڵڵا) کـە لەگـەڵی بـوون، شـێخ سـدیقی کـوڕی شـێخ عوبەیـد، شـێخ عەبدولکەریمی مامی شێخ، شێخ ئەبولقاسم، شێخ بـەهادین، شێخ نـورەدین، حـاجی عەلائـەدین (لـە بـن ئامۆزاکـانی شـێخ)"نوێـژی نیـوەڕۆ لـە گونـدی "بارانـدوز" پەیدابوون. حاجی ڕەحیم خانیش هەر لەم گوندە بـوو. دوای نـانی نیـوەڕۆ پێکـەوە بەرەو شار دەکەونە ڕێ. خەڵکی شار کـاتێ هـەواڵی هـاتنی شـێخ عوبەیـدیان بیـست، وەك شـێری شـەڕ ڕاسـتبوونەوە و خۆیـان بـۆ بـەرەنگاریی ئامـادە کـرد و تـەدارەکی شەڕیان دابین کرد. یەکەمین کەسێ لەم کارەدا دەستپێشخەریی کرد و نـان و نمـەکی دەوڵـەتی مـەزنیان لـە بـیر نـەکرد و هـەقی کەوتـە سـەر ئەسـتۆی خـەڵکی؛ جـەنابی سـەیید ئاغـا و ئاغـا مـیرزا محەمـەد حـسین (نـاظم العلمـا)ی ورمـێ بـوون، کـە ئـەم سەرشۆڕییەیان بەخۆیان ڕەوا نەدی و چاکی مەردایەتییان بەلادا کرد، چونکە مردن و تیاچوون لە جەرگەی شەڕدا، لـەوە باشـترە بەدەسـتی دوژمـن بـەدیل بگیرێـی، یـان بکوژرێیت، کە ئەویان کاری پیاوانە و ئەمیشیان پیشەی ئافرەت. پیاو ئەو کەسـەیە؛ دەمی ببەسـتێ و بـازووی بەگـەڕ بخـات.لەگـەڵ (٢٠٠ دووسـەد) تفەنگچی لـە خـزم و کەسوکاری خۆیان، تـەیاری شـەڕ بـوون. خـەڵکی تـریش کـە ئەمـەیان بـینی، خـوێنی پیاوەتییـان هاتـە کـوڵ و دەمـاری غروورىـان کەوتـە لێـدان. لـە ئاغـا و ڕەعیـەت و ناوبەدەرەوە و بێ ناوبـانگ و زانـا و ڕەشـۆکیی، ئـەم قسەیەیان قبـووڵ کـرد و تـیری دوژمنیان لـە تانـەی زمـانی خراپـەکاران بەباشـتر زانـی. بـەڵێ: جِراحـات الـسنان لهـا إلتيام ولا يلتأم ما جرح اللسان. واتە: سنگی پیاوان بە سەرەنێزە بریندار بـێ باشـترە لەوەی کە گیرۆدەی دەستی تیری زمان بێ.هەموویان هاودڵ و هاوزمان بوون و قـۆڵی هیمـەتیان لـێ هـەڵماڵی. لەولاشـەوە شـێخ عوبەیـد گەیـشتە کێـوی "سـیر"؛ کـە قۆناغەڕێیەك لە شارەوە دوورە. شەویش بۆ حەسانەوە، هـەر لـەوێ مانـەوە. حـاجی ڕەحیم خان بۆ ناوشار هات، کاتێ ئەو هەموو خەڵکەی بـینی، زمـانی تانـەی بـزوا و

وتـی: ئـەوە چـیتان بەسـەرهاتووە، وا لـە گیـانی خۆتـان بێـزارن و دەتانـەوێ وەك خەڵکی میاندواو ببنە نێچیری شمشێر!؟ چاوتان بکەنەوە و سەرنج بدەن؛ پەنجە لـە پەنجەی شێر خستن و شەپ لە شمشێر هەڵدان، کارێکی هـەروا سانا نییـە، ئەمـەش خۆی نیشانەی ئەوپەڕی نەزانینە؛ ئێستاش شێخ خۆی، بەنەفەسی پـڕ بایـەخی بـۆ ئێرە دێت و وەك خەڵکی سندووس و سابلاخ، ملی بۆ کەچ بکـەن، تـا خاووخێزانتـان بەدیل نـەگیرێن و ماڵتـان لێ کاول نەبـێ.دوای بیـستنی ئـەم قسانە، هەنـدێ کـەس ڕازیبـوون، تـا خۆیـان بەدەسـتەوە بـدەن. پـەیتا پـەیتاش لـە لایـەن شـێخەوە، بـێ پسانەوە، نامە بۆ خەڵکی شار دەهات؛ کە ئەم زاتە (شێخ عوبەیدوڵلا) کاری بـەگیان و ماڵی ئێوەوە نەداوە و لە هەموو ڕوویەکەوە دڵنیا بـن و مەترسـن. تـەنیا ئەوەنـدە هەیە، گەورەی ئێمـە، نوێـژێك لـە مزگـەوتی جامیعـە (گـەورە) دەکا و لەشـکرەکەی بـەرەو قـۆڵێکی تـر بەڕێـدەخا.هەرکـە هـەواڵی ڕازیبـوونی خـەڵك بـەحاجی مـیرزا موحـسینی لەشـکرنووس گەیـشت، ڕووەو مـاڵی ئاغـا مـیرزا جـەمالی شـێخ الاسـلام ڕۆیشت؛ کە خەڵکەکە لەوێ کۆببوونەوە و هـەواڵی ڕووداوەکـەی پرسـی؛ باسـەکەیان بـۆ گێڕایـەوە و ئـەو نامـە ناردراوەیـان پێـدا، کـە نووسـیبوویان و مۆریـان کردبـوو. ناوبراویش چونکە پیـاوێکی بەتەمـەن و ڕەنجکێـشی چـاك و خـراپ دیـدەی گـەرم و سـارد چێـشتووبوو؛ دەسـتی بـەئامۆژگاریی کـرد و وتـی: ئـەم ڕازیبوونـە چ قـازانجێ بەئێوە دەگەیەنێ! ئەگـەر بـۆ پاراسـتنی گیـانی مـاڵ و منداڵتانـە، ئـەوا دوای ئـەوەی شـێخ و کـوردان بـۆ ئـەم شـارەتان دێـن، ئـیتر دەسـەڵاتی مـاڵ و منـداڵیش، لـە دەس خۆتاندا نامێنێ؛ سەرەڕای ئەمە شێخ عوبەید چ حەددی ئەم دەسـتدرێژییەی هەیـە و کوا توانا و دەسەڵاتی شەڕکردنی هەیە!. ئەوە هەواڵیشیان هێنـاوە، کـە لەشـکرێکی خوێنرێــژ لــە "ئــەراك"ەوە، بەفەرمانــدەیی "حیــشمەت الدولــە" دێــت، هــەموو عەشیرەتەکانی تێکیشکاندووە و خەڵکی ئێرەش هەروا لـێ دەکـات و دەکوژێ. باشـتر وایە چارەیەك بۆ ئەم کارە بدۆزینەوە، تا هەواڵ بەئیقبالدەولە بگـات و بـۆ نـاو شـار بگەڕێتەوە. بۆیە ئاغا سەیید ئیسماعیل (سەرۆکی بازرگانان) و ئاغا میر جەعفـەری پێــشنوێژ و ئــەمین شــەرع و ئاغــا مــیرزا غــەفوور و حــاجی مــیرزا جــەباری

"ڕەوزەخوێن" بۆ لای شێخ (عوبەیدوڵلا) دەنێرن و پێی ڕادەگەیەنن: ئێوە لەگەڵ سوڵتان شەڕتانە، یان لەگەڵ هاووڵاتی؟!. خۆ ئەگەر شەڕتان لەگەڵ دەوڵەتدایە، ئەوە لەشکری دەوڵەت لە ناو شاردا نییە، لەبەرئەوە چاوەنواڕ بن تا ئیقبالدەولە خۆی دەگات. دوایی خۆتان دەزانن هاووڵاتی هەقی بەسەر شەڕەوە نییە، ئەگەر دەتانەوێ شەڕیش لەگەڵ هاووڵاتیدا بکەن، ئەوا ئێمە توانای شەڕ و بڕستی بەرەنگاریمان نییە و هەمووومان لە بەردەستتدا ملکەچین. ئێستاش بۆ ئەوەی منداڵ و خاووخێزانمان نەترسن، لە ئیمڕۆوە تا سبەینێ ئێوارە، دەرفەتی هاتنمان بدەرێ، ئەوسا ئیتر ئارەزووی خۆتانە.هاوکات چەند سوارێکیشیان بەپەلە بۆ لای ئیقبالدەولە بەرێ کرد، کە ئەگەر زوو بۆ ناو ماڵ و گیانی خاووخێزانت نەگەڕێیتەوە، پەشیمان دەبیتەوە.کاتێ ئەمانەش گەیشتنە لای شێخ و کارەکەیان تێگەیاند؛ شێخ لە وەڵامدا بۆی نووسین: ئێمە کارمان بەسەر هاووڵاتییەوە نییە و لە پاراستنی مافی هاووڵاتیش، مەبەستێکی ترمان نییە و بێ ئەوەش زیان بەتاکە کەسێکیان بگات، داخوازییەکەیان پەسەند دەکەم. تەنیا ئەوەندە هەیە، دوای گەیشتنە ناوشار، شەوێك لە شاردا دەمێنینەوە و کەسێکیش هەر لە خەڵکی شار، دەکەینە بەرپرس و ئەوسا بەرەو "تەورێز" دەچین.ئەوانەی لە لایەن خەڵکی شارەوە چووبوون، بەخۆشحاڵییەوە بۆ شار گەڕانەوە. شەویش بەنهێنی دەوروبەری قەڵایان دابەش کرد و سەنگەریان لێدا.بەڵام ئیقبالدەولە، دوای (٤ چوار) ڕۆژ شەڕ و تێهەڵچوون لەگەڵ هێزەکەی شێخ محەممەدئەمین، ڕۆژی پێنج شەممە: ١٥ی هەمان مانگ (١٨٨٠/١٠/٢١ز) دەمەو خۆرئاوا گەڕایەوە، چونکە بەرنامەی کوردان بەجۆرێك بوو، کە دوای خۆرئاوا دەستیان لە هێرش و پەلامار هەڵدەگرت و شەویش دەحەسانەوە" دیسان بەپێی بەرنامەی پێشوویان دەستیان لە شەڕ هەڵگرت. ئاغا بەگی یاوەر پەلە دەکات و لەناکاوێکدا سەربازەکان لە سەنگەرەکانیانەوە، بەکەنار گوندەکەدا بەرەو گوند دەگەڕێنێتەوە. کاتێ کوردان بەگەڕانەوەی سەرباز دەزانن، هێرش بۆ سەر تۆپخانە دەبەن، "عەلی بەگ سوڵتانی" تۆپخانەی موبارەکەیان کوشت و تۆپەکەشیان داگیر کرد. ئەم هەردوو هەواڵەش: هەواڵی هاتنی شێخ (عوبەیدوڵلا) بۆ ورمێ و

داگیرکردنــی تۆپخانــە و کوشــتنی عــەلی ســوڵتان، بەدەســتی شــێخ محەمەدئــەمین، بەپەلە بەگوێی ئیقبالدەولە دەگاتەوە.**شیعر**:لەم وتووێژە وەها سست بوو کە دەستی لە ماڵ و ژیـان بەردالـە دەروونییـەوە بـۆ کـرووز هەسـتا زەوی لای پیـاو، وەك ئاشـی لێهاتپیاو، گیانی کەوتە لەرزین لەبەر ڕق و قین، ئاسمـان و زەوی لـە بەرچـاوی ڕەش بوونزمـان لـە نـاو دەمیـدا وشـك بـوو هـەم لەبـەر دەردی غـیرەت و هـەم لـە ترسـی گیانیناچار دەستی لە شەڕ هەڵگرت و بەرەو شار گەڕایەوە. کاتێکیش هـەواڵی هـاتنی ئیقبالدەولە بەشێخ عوبەید گەیشت، شێخ سـدیقی کـوڕی خـۆی، بـەهێزێکی زۆرەوە بۆ شەڕ نارد، تا ئەوان سـەرقاڵی شـەڕ بـن و خـۆی بـچێتە ناوشـارەوە.لەبـەر بـەختی زینـدووی هومـایونیی، ئیقبالدەولـە بـەبێ ڕووبەڕووبوونـەوە و شـەڕ لەگـەڵ شـێخ سـدیقدا، شـەو گەیـشتە ناوشـار. کـە بـەیانی ڕۆژ بـووەوە و شـێخ عوبەیـد بـەهاتنی ئیقبالدەولەی بۆ ناوشار زانی، بۆی دەرکەوت خەڵکی شار فێڵیـان لـێ کـردووە. بۆیـە زۆر تـووڕە بـوو. لـە کێـوی "سـیر"ەوە بـەرەو بـاخی "سـیاوەش" چـوو. دوای نـانی نیوەڕۆ و نوێژکردن، سـەعاتێك بـەر لـە خـۆر ئـاوابوون؛ ڕۆژی شـەممە: ١٧ی هـەمان مـانگ (١٨٨٠/١٠/٢٣ز)، فرمـانی هێرشـی لـە قـۆڵی دەروازی "عەسـکەرخان"ەوە بـۆ ناوشـار، دەرکـرد.کـاتێ تۆپـچی و سـەرباز و خـەڵکی شـار، هێرشـی کوردانیـان بـینی، هــەموویان لــە ســەنگەرەکانیاندا خۆیــان بــۆ شــەڕ ئامــادە کــرد. بــەڵام هیــچیان گوللەیەکیان نەتەقاند و تەقەیان لێوە نـەهات؛ بـەجۆرێك کـە کوردان پێیـان وابـوو لەم قۆڵەوە کـەس بـۆ شـەڕ نـەهاتووە. بـێ ئەدەبانـە دەسـتیان بەهـەراوهوریا کـرد و ڕووەو لای سەنگەرەکان هاتن، تـا ئـەو کاتـەی هـەموویان پێکـەوە نزیکبوونـەوە، لـەو کاتەدا لەناکاوێکدا فرمانی شـەڕ بەتۆپـچی و سـەرباز درا، بـەجۆرێك کـە هەنـدێ لـە کـوردان هـەر بەگوللـەتۆپێك لەناوچوون. ئـەوانی تریـان دیـواری باخـەکانی شـاریان کردە سەنگەر و کەوتنە شەڕکردن.هـەر ئـەو ڕۆژە، شـێخ عوبەیـد فرمـانی دەرکـرد؛ ئاوی شاریان لێ بگرنەوە. هەردوولا پێـنج شـەو و ڕۆژ، بـێ هـەدادان نەحەسـانەوە و شەڕیان کرد. کوردەکان کە هەلومەرجەکەیان بەوجۆرە بینی، خۆیـان کوتایـە بـاخی "دلگوشـا"وە، کـە بـاخی خـودی ئیقبالدەولەیـە و هـەر پـەنجا هـەنگاوێك لـە شـاری

"ورمێ"وه دووره و کۆشکی بەرزی تێدایه و له سەربانەکانییەوه، کە بەسەر شاردا زاڵن، سەنگەریان دامەزراند. ئیقبالدەولەش فرمانی بەتۆپچییەکان دا تا کۆشکەکە بڕووخێنن. بەگوللە تۆپ و تفەنگ، سەربان و دەروازەی کۆشکیان تێکوپێك دا. بەمەش دەستی کوردانیان له سەرکوتکردنی شار کورت کردەوه. ناچار شێخ له باخ چووه دەرێ و لەسەر تەپۆلکەی ناسراو به"جهوودلەر"، خۆیان قایم کرد. ئیتر لەمە بەدواوه، تا هاتنی "تەیموور پاشا خان"، بەڕۆژ بۆ تالآنیی گوندەکان دەچوون و شەوانەش خەریکی هێرش دەبوون.**بەشی دەیەم باسی هاتنی تەیموور پاشا خان بۆ یارمەتیدانی دانیشتووانی ورمێ و چوونی شێخ عوبەید بۆ دەوروبەری شار**دوای گەیشتنی هەواڵی هاتنی شێخ عوبەید بۆ ورمێ و ئابڵۆقەدانی شار؛ له لایەن ئەعلا حەزرەت قەدەر دەسەڵاتی ئەقدەس، سێبەری خوداوەند، گیانمان بەقوربانی بێ؛ بەتەلگراف فرمانیان بەتەیموور پاشا خان کرد؛ تا لەگەڵ فەوجی نۆیەمی "خۆی" و دەستەی "ماکۆیی" و سوارەی "ئێرانلو" و "سیستانی" و چریکی "خۆی"ی و "ماکۆیی" دەستبەجێ بەرەو ورمێ بەڕێ بکەون. ناوبراویش دەستبەجێ لەگەڵ جەماوەر و هێزی پشتیوان له سواره و پیاده، بەڕێ کەوتن.کاتێ شێخ عوبەید هەواڵی هاتنی تەیموور پاشا خانی(٢٧) بیست، ئەو لەشکرانەی له دەوری ورمێ دانابوون، جووڵاندنی و بەرەو "قەلا"(٢٨)) بەڕێ کەوتن، کە هەر له سەرەڕێیاندا بوو، ڕێگای بەلەشکرەکەی تەیموور پاشا خان گرت. سەربازانی لەشکرەکەش هەرکە ئەم ڕووداوەیان بینی، وەك شێری شەڕ هەڵچوون و فەرماندەکانی لەشکر له جێی خۆیان ڕاستبوونەوه و له دوو قۆڵەوه هێرشیان بۆ بردن. هەموو ئامرازێکی جەنگیان بەکارهێنا. لەبەر زرمەی تۆپ و گرمەی دەهۆڵ، لەشی خەڵك وەك گۆزەی لێهات و دڵیان وەك شەراب. مەگەر ئەو دەشت و دەره نەبوو بەمەعدەن. کە تەرمی کوژراو لەو دەشتەدا، بوو بەعەقیقی یەمەن.دلێران و شێرکوژانی بەدەستوبرد، دەستیان بەخوێنی دوژمن خەناوی کرد. دوای یەك سەعات شەڕ، نزیکەی (٢٠٠ دووسەد) کەس له هێزەکەی شێخ، کوژران و بەدیل گیران. ناچار بەلەشکری تێکشکاوەوه بۆ کەنار شار گەڕانەوه.ڕۆژی دواتر، دیسان هێرشیان بۆ شەڕ و

بەربەرەکانێ هێنایەوە، تا گوندی "عەسکەرئاوا" گەیشتن و خەڵکی ئەم گوندەش دەستیان کردەوە و تێهەڵچوون. تەیموور پاشا خان، لە هاتنی بۆ ناوشار، درەنگی کرد. خەڵکی گوندەکەش دەرەقەت نەهاتن و توانای خۆڕاگرییان نەما. ئەو بێ بەزەییانەش کە دەرفەتی وایان کەم بۆ هەڵدەکەوت، کاتەکەیان بەهەل زانی و لە هەموو لایەکەوە هێرشیان بۆ سەر گوندەکە برد. هەموو دانیشتووانی ئەو گوندەیان بەژن و پیاو و تەنانەت منداڵی شیرەخۆرەشەوە کوشتن و ماڵ و سامانیشیان بەتاڵان بردن و خانووەکانیان بەئاگری زوڵم و ستەم، سووتاندن و دووبارە بۆ دەوروبەری شار گەڕانەوە. تەیموور پاشا خانیش لە قۆڵێکی ترەوە خۆی گەیاندبووە ناوشار و "شێخ عەلی خانی سەرتیپ"یش لەگەڵ فەوجی دەیەمی "خۆی"، پێش لە ناوبراو گەیشتبووە ناوشار. بەڵام لە شار دەردەچێ و تێکەڵ بەلەشکرەکەی ئەو دەبێ.ناوی ئەو سەرکردە و لێپرسراوانەی لەگەڵ تەیموور پاشا خان بوون، بریتی بوون لە:شێخ عەلی خانی سەرتیپ لەگەڵ فەوجی دەیەمی "خۆی"، حەیدەر خانی سەرهەنگ، لەگەڵ فەوجی نۆیەمی "خۆی"، فەوجی "ماکۆیی" بەسەرکردایەتی ئیسحاق پاشا خانی برای تەیموور پاشا خان. سوارەی ئێرانلوو بەفەرماندەیی ئاغا خان "ئێرانلوویی"، سوارەی "سیستانی" بەسەرکردایەتی عەباس قولیخانی سیستانی، سوارەی "ئەباجیقی" بەفەرماندەیی پاشا خان کوڕی خەلیفە قولیخان، سوارەی خێڵی "زیلان"، سوارەی خێڵی "حەیدەرانلوو"، پەنجا (٥٠) سوارەی شکاك بەسەرکردایەتی کوڕێکی عەلی خانی شکاك؛ کە کوڕەکەی تری لەگەڵ هێزێکی هەمان خێڵ، لای شێخ عوبەید بوو. چریکی "خۆی" و "سەڵماس"ی، چریکی "ماکۆیی" بەسەرکردایەتی ئەمانوڵلاخانی کوڕی ئیبراهیم ئاغای ماکۆیی.بەڵام دوای گەیشتنی تەیموور پاشا خان بۆ ئاقار و دەوری شار، سێ ڕۆژی یەکەم، شەڕی نەکرد، تا وای لێهات لەشکری شێخ پرکێشیی کرد و هێرشی بۆ سەر هێزەکەی تەیموور پاشا خان برد. سەربازانی هێزەکە، کە پرکێشیکردنی شێخیان تا ئەو ڕادەیە بینی، خێرا دەستیان کردەوە و کەوتنە شەڕ، هەردوو هێزەکە تا دەمەو ئێوارە شەڕیان کرد و دوایی هەر هێزەیان بۆ سەربازگەکەی خۆی گەڕایەوە. بەمجۆرە ماوەی چوار

ڕۆژی بەسەربرد. ڕۆژی چوارەم، شێخ بارگە و بنەی لەشکرە بەزیوەکەی خۆی پێچایەوە و لە دەوروبەری شار دوورکەوتەوە. تەیموور پاشا خانیش چەند ڕۆژێك دواتر هێزەکەی خۆی پێچایەوە و ڕووی لە "مەرگەوەڕ" کرد و لەوێ تێکەڵ بەلەشکرەکەی "حسام الملك" بوو؛ کە وەك دواتر باسی دەکەین، حەزرەتی ئەجەل ئەشرەف ئەفخەم: موشیردەولە میرزا حسین خانی سوپاسالار ڕایسپاردبوو.بەڵام سەرلەبەری خەڵکی شار (ی ورمێ) لە دەستدرێژیی سەربازانی تەیموور پاشا خان داد و ناڵەیان بوو، کە ئەوان لە لەشکری کوردان زیاتر ئەم ناوچەیەیان وێران کرد و بەئەنقەست یارمەتی خەڵکی "عەسکەرئاوا"یان نەدا و بۆ گرتنی شێخ عوبەیدیش کەمتەرخەمییان کردووە.**بەشی یازدەیەم باسی بەڕێکەوتنی لەشکری "ئەراکی" لە گەڕووسەوە و کۆچی دوایی نەوابی والا: "حشمت الدوله"**.پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە نەوابی ئەشرەف، والا: حشمت الدوله، لە "بیجاڕ" نەخۆش کەوتبوو. سەرەڕای ئەوەش، دوای گەیشتنی وەڵامی تەلگراف، ڕانەوەستا. ڕۆژی ٢٨ی مانگی زیقەعیدە (١٨٨٠/١١/٣ز) بەهۆی ناخۆشیی ڕێگا و لەبەر لێشاوی سوپا، خودی نەوابی ئەشرەف ئەمجەد والا، لەگەڵ هەموو تۆپخانە و فەوجەکانی حاجی حسام الدوله و نصرالملك، کە بریتی بوون لە: دوو فەوجی ئازەربایجان و دوو فەوجی قەزوین، لەگەڵ فەوجی "شاسەر" و "ژریمانی یەکەم" و سوارە، لە "بیجاڕ"ەوە بەڕێ کەوتن (٣) فەوجی هەمەدان، کە "ابو الجمع حیسامولولك" بوو، لەگەڵ (١٠٠ سەد) سوارەی تێکەڵ، ڕۆژێك دواتر بەڕێ کەوتن. لە ناو ڕێگە، کە بریتی بوو لە قۆناغەڕێی "کولتەپە" و "عەلی ئاوا" و "جەعفەرئاوا" و قۆناغەڕێی "سەبیل"، کە سەرەتای ناوچەی "ئەفشار" بوو، شتێك کە بۆ نووسین و باسکردن بشێ، ڕووی نەدا، جگە لە نەخۆشیی نەوابی ئەشرەف والا؛ کە توندتر بوو. شەوێك لە قۆناغەڕێی "سەبیل" ڕایانگرت، بەڵکو کەمێك حاڵی چاك بێتەوە و هێزی ڕۆیشتنی تێبێتەوە" ئەو ڕۆژە حیسامولولك لەگەڵ فەوجەکانی هەمەدان تێکەڵ بوون، بەڵام بەهۆی توندتر بوونی نەخۆشیی نەواب و گەیشتنی هەواڵی پەیتا پەیتای زۆربوونی لەشکری شێخ و کوشتن و تاڵانکردنەوە، دڵەخورپە و نیگەرانیی، لای سەرلەبەری لەشکر پەیدا

بـوو. سـەربارى ئـەوەش بەهـەزار زەحمـەت، بـە"تەختـەڕەوان"، نـەوابى والا، تـا قۆناغەڕێى "كوك ئاغاج" دێنن. نەخۆشييەكەى لـەم قۆناغەڕێيـەدا تونـد دەبـێ و ئاڵوگۆڕى گشتى تووش دەبێ. بـەپێى فـەرموودەى ئايـەتى پـيرۆز: "إذا جاء أجلهم لا يـستأخرون سـاعة ولا يـستقدمون"" كۆچـى دوايـى كـرد، مـەرگ خـاكى حەسـرەتى بەسەردا بێژا، بەڵێن و پەيمان بەئەنجام گەيشت و پەرداخ پڕ بوو؛ ئەو لەشـە بـەناز پەروەردەيە و ئەو سەرە پڕ غرووره، بـۆ غوسـڵ و كـافوور و گـۆڕ بـەجێما. عـەيام و زەمانــە، ســەرى پەنجــە و شــان و بــاهووى بــەهێزيان، بەنــد بەبەنــد لــە كــار خست.(٢٩)دواى ئەو؛ حسام الدولـە و حـسام الملك و نـصر الملك و عـەزيزوڵڵا خـانى سەرتيپى شاهسەوەن، كۆبوونەوە و دارودەستە و پياوەكانى: نـەوابى والا، لەگـەڵ (٥٠ پـەنجا) سـوارەى ئەفـشارى شاهـسەوەن، بـەرەو دار الخلافـەى تـاران بـەڕێ دەكـەون و چـۆنێتى ڕووداوەكـە، بـەخاكى بـەرپێى زێـڕينى ئـەعلا حـەزرەت، قـەدەر دەسـەڵات، شـەهريارى (ڕۆحـى مـن و ڕۆحـى عالـەمى بەفيـدا بـێ) و فـەرەج خـانى تفەنگـدار، بەتايبەتى عەرز دەكەن.مێژووى كۆچى دوايى نـەوابى والا حيـشمەتولدەولە، شـەوى شـەممە: پێنجـەمى مـانگى زيحەجـەى حـەرام ١٢٩٨ كۆچـى، ڕێكـەوتى ٧ى تـشرينى دووەم، لە گوندى (كۆك ئاغاج)، لە "سـايين قـەڵا"ى هەوشـار(٣٠). دواى بەڕێخستنى تـەرمى نـەوابى والا، هـەر كـام لـە گـەورە فەرمانـدەكان تێكـەڵ بـەهێزەكانى خۆيـان بوون. قۆناغيان لە گوندى "ساينجوود" گرت؛ لەبەرئەوەش كە مـير ميرانـى گـەورە: محەمەد قوليخان حسام الدولە، تەمەنى خزمەتى لەوانى تر زۆرتر و لە هەمووشيان پيرتــر بــوو، بۆيــە حيــسامولمولك و نەصــرلمولك و عــەزيزوڵڵا خــانى ســەرتيپ و ئەوروپاييیەكانيش(٣١) كرديانە سەركردەى لەشـكرى خـاوەن شـكۆ و نامەيەكيـشيان نووسى، كە هيچ كەسێك لە سەربازانى لەشكر، مـافى نافـەرمانى و سەرپێـچى نييـە و دەبێ لە قسەى ئەو دەرنەچن. لەم شـوێنەدا سـەليم خـانى چاردۆڵى و بيـوك خـانى كوڕەزاى سولەيمان خان، خۆيـان بـەناو لەشـكردا كـرد و سـەرى سـەربڕدراوى چـەند سـەربازێكى شـێخيان هێنـا و بـوو بەمايـەى دڵگـەرميى جـەماوەرى لەشـكرەكە. بـۆ ئێوارێ هەواڵ هات، كە فەيزوڵڵا بەگ(٣٢) (يەكێ بوو لە سـەرانى لەشـكرەكەى شـێخ

و لـه كولتەپـەی چـوار قۆناغـەرێی گونـدی سـاینجوود بـوو) خـۆی بـۆ ئـەوە ئامـادە كـردووە، ئيمـشەو هێـرش بـێنێ.ئـەو شـەوە لەشـكرەكە، قـەرەوڵ لـە سـوارە و پيـادە، بــەجۆرێك دادەنــێن، كــە ئەگــەر دەهــەزار ســواريش بيويــستبايە هێــرش بهــێنێ؛ نــــەيتوانيبا. تـــا بەرەبــــەيان ســــەركردە و فەرمانــــدە و ســــەرباز، بەتفــــەنگ و كەلوپەليانـەوە، لـە نـاو سـەربازگەكەدا خـەريكی چاودێريی و پاسـەوانيی بـوون.بـۆ بەيانی، لەسەر ئەوەی كـە جێهێـشتن و خـۆ نـەبانكردن لـە فـەيزوڵڵا بـەگ و دانـانی دوژمنی لە پشتەوەی سـەربازگە؛ كـارێكی خراپـە، حيـسامولدەولە و حيـسامولولك و نەصرولولك و عەزيزوڵڵا خانی سـەرتيپ و فەرمانـدەكانی ئـەوروپايی، سـەرلەبەری فەرمانـدە ژێردەسـتەكانيان كۆكردنـەوە و باسـی ڕووداوەكانيـان بـۆ كـردن و پيـاوی جـەنگاوەريان لـێ ويـستن. هـەموو فەرمانــدەكان وتيــان: ئێمــە بــۆ گيانبــازيی و خزمــەتگوزاريی، نافرمــانيی ئێــوە ناكــەين و ســڵ لــە ئــاگريش ناكەينــەوە و ورە بـەرنادەين. بۆيـە گـشت هێـزی تۆپخانـە و لەشـكری سوارە و پيـادە، بـەرەو "تيكـان تەپە" بەڕێ كەوتن.**شيعر**:شەيپوور گرماندی و نەی دەستی بـەناڵين كـرد دار، پـەيتا پەيتا لە سنگی دەهۆڵ دەدافەرماندەكانی لەشكر، بەخۆكەوتن سەرێكی پڕ لە قـين و دڵێكی كينەخوازتۆپ، كە دەتـوت ئـەژديهای لـە دەمدايـە لەسـەر زەوی دايانناناڵەبـەر تيشك و باق و بريقی تفەنگی لەشـكر زەوی ڕوون بـووەوە و هـەوا تاريـك بووڵەبـەر خرمەی سمی سوارەی سم پۆڵايين ئاسمان بەرنامەی سووڕانی لە يـاد چۆوەمەيدانی جەنگ، بەجۆرێك ڕازاندەوە و ئاڵاكانيان بەرزكردەوە كە مانگ لە ترساندا پەنای بۆ بورجی عەقرەب بردموشتەری، بوو بەموشـتەری بـورجی سـەرەتان پـاپۆڕی زوهـرە، ئازايـەتی خـۆی نوانـدئاڵا هـەڵگری سـەركەوتن و ئەجـەل، لـە پـێش شـەڕ قـەزا: لای ڕاست و قەدەر: لای چەپی هەڵبژاردهەر لەو ڕۆژەدا عەلی ئەكبـەرخانی سـەرهەنگ، بـۆ پاراسـتن و ئاگـاداری لـە بارگـە و بنـە و ئازووقـە و پاراسـتنی بەشـی پـشتەوەی لەشكر، دەستەی مەنسووری لە پـشتەوەی سـەربازگە دامەزرانـد و فرمـانێكی لەسـەر دەرچــوو، كــە دەقــی فرمانەكــە لێــرەدا يادداشــتكراوە:دوای بــڕينی دوو فرســەخ (١٢كيلۆمەتر)، هەواڵ گەيشت كە فـەيزوڵڵا بـەگ بـەهێزێكی زۆرەوە بڕيـاری هێـرش

هێنـانی داوە، بۆیـە لەشـکریان بەئامادەباشـییەوە پـۆلێن کـرد و ئامـادەی هێرشـیان کردن. کاتێ فەیزوڵلا بەگ لە دوورەوە لێشاوی ئـەو لەشـکر و ئـەو هـەموو سـوارە و پیادە ڕێکوپێکانەی بینی، وەك ئەم شیعرە دەڵێ: "هەڵاتن بـەوەختی خـۆی و سـەری نەبڕدراو، لە پاڵەوانێتی و سەری بـڕدراو باشـترە"، هـەڵاتنی لـە خـۆڕاگریی بەچاکتر زانی و هـەڵات. هەنـدێك لـە سـەربازانی پیادەی، کـە لـە ترسـی گیانیـان، لـە پـەنا و پەسێر و چاڵاوەکاندا خۆیان حەشار دابوو، بەگوللەی سەرباز، سەریان لەسـەر خـاکی ڕەش دادەنـا و ئـەو ئـافرەت و منداڵانـەی لـە گوندەکانـدا مابوونـەوە، بـەئاگر سووتان.(٣٣)**شیعر**:ئاگرێکی وایان لەو وڵاتە بەردا بـەردی ڕەق؛ وەك: مـۆمی لێهاتپیر و لاو، هـەموو سـووتان ژن و منـداڵیان بەیەکـەوە لەناوبردئـەو کەسـەی تووشـی بەتووشی سەربازەوە بوو سەری بێ لـەش و لەشـی بـێ سـەر، کـەوتئاگر و دووکـەڵ و بگرە و بەردەیەکی وەسا ساز ببوو دەتوت قیامەت هەڵساوەیەکێ داماوە، لە خـوێن و خۆڵـدا گــەوزاوە یــەکێکی تــر، بــەخوێنی دڵــی، تــەوێڵی وەك هەڵاڵــە ســوور هەڵگەڕابوودەسـتەیەك؛ قـۆڵی شـەڕیان هـەڵماڵیبوو دەسـتەیەکی تـر؛ تـازە هیوایـان بەمانــەوەی خۆیــان نەبوودەمــە دەمــی ئێــوارە، دەســتیان لــە کوشــتار بــەردا. حیسامولدەولە و دەستەی شاسەر و ژریمان، بەرایی گوندی "قەرەتەپە"یان(٣٤) کـرد بەبارەگا، کە لە چەمی "خشنو"دا بوو. حیسامولولك و نەصرولولك بەهۆی تەنگیی جێ و ڕێ، لەگەڵ (٣ سێ) فەوجی هەمـەدان و (٢ دوو) فـەوجی قـەزوین و هەنـدێك لـە سـوارەکاندا، گونـدی "قاشـوق"یـان(٣٥) کـردە قۆنـاغ، کـە چارەکە قۆناغەڕێیـەك (١,٥کیلۆمەتر) لە "قەرەتەپە"وە دوور بوو. لە هەردوو سەربازگەکەشەوە پاسەوان و پێش قەرەوڵیان بـۆ دەوروبـەر نـارد.شـەو، حەسـانەوە و بـۆ بـەیانی، دوای گەیـشتنی حیسامولدەولە پێکەوە بەرەو "تیکان تەپـە" بـەڕێ کـەوتن. کـە گـزنـگ لـە پـەردەی ئاسمانـەوە سـەری دەرهێنـا، مـار و مێـروو جمـان، لەشـکریش دەسـتە دەسـتە بـەڕێ کەوتن، وەك چۆن زەریا لەبەر بادا شـەپۆڵ دەدا، سـوارەی شاهـسەوەنیش لـە هـەموو شـوێنێ پـێش قـەرەوڵ بـوون و دەسـتەکانی تـریش؛ سـوارە و پیـادە، بـەڕێکوپێکی و شـکۆوە ڕێیـان دەکـرد. چـوار سـەعات لـە ڕۆژی هـەینی، (٨ی مـانگی زیحەجـە:

١٨٨٠/١١/١٢ز) تێپـەڕی بـوو، چـوونە "تیکـان تەپـە"وە. پیـاوانی فـەیزوڵڵا بـەگ و ڕەعیەتەکانی، تا قەواریان نەمابوو، بەڵام خودی تیکان تەپە، گەورە و لە نێوان دوو کێودا هەڵکەوتبوو. خانووی بـاش و مزگـەوت و حـەمامی زۆر باشـی تێـدا بـوو. بـەر لەوەی گوندەکە جێ بهێڵن؛ کە نیازی شـەڕیان لەسـەردابوو، لـە دەوروبـەری گونـد و سـەر هـەردوو کێوەکـە، سـەنگەری قایمیـان لێـدابوو. ئـارد و گـەنمێکی زۆریـان کۆکردبـۆوە، هـەموویان پێـشێل کـران و زۆربـەیان سـووتاندبوون، بـەجۆرێك کـە هەموویان ببوونە کۆمایەك خۆڵ و خۆڵەمێش. لە هەموو لایەکەوە هەواڵی مەرگ و کاولکاریی، بەگوێی گیـان دەگەیـشت.دیسانەوە هەنـدێ سـەرباز و سـوارەیان کـردەوە پـێش قـەرەوڵ و گـەلێ سـەنگەریان سـاز کـرد. بـۆ شـەوێ، عـەلی ئەکبـەر خـان سەرهەنگی فەوجی مەنسووری هەمەدان، لەگەڵ وەلیخانی یاوەر، سوارەی چاردۆڵی، لـە هـەموو شـوێنێکی سـەربازگەکەوە پاسـەوانیان دەرکـرد.بـۆ ڕۆژی دواتـر، نزیکـی چێـشتەنگاو، هەنـدێ لـە سـەربازەکانی قـەزوین، لەوانـەی بـۆ تـاڵان لـە سـەربازگەکە دەرچووبوون، کەوتبوونە بۆسـەی کوردانـەوە. لـەو کاتـەدا نەصـرولمولك لـە بارەگـای حیـسامولدەولە بـوو، دوای بیـستنی ئـەم هەواڵـە، عـەلی ئەکبـەر خـانی سـەرهەنگ دەنێرێتـە لای عـەزیزوڵڵا خـانی سـەرتیپ و ڕووداوەکـەی بـۆ بـاس دەکـات. ئـەویش دوای بیستنی ئەم هەواڵە، هـەموو سوارەکانی خـۆی ئاگـادار دەکاتـەوە و دەسـتبەجێ سواری ئەسپ دەبـن. ئەسـفەندیار خـان (سـەرتیپی سـوارەی بـەختیاری)یـش لەگـەڵ سوارەکانی خۆی بەدوایاندا ئاوزەنگی دەتەقێنن. هەموو شێرەپیاوانی مەیدانی شەڕ، کـە لـە شـەڕدا بـەپڵنگ دەڵـێن: ڕێـوی، سـەرلەبەریان مەردایـەتییان بـاڵای کـرد، بـۆ یارمـەتی لەشـکر جیابوونـەوە. کـاتێ ئـەم قـسەیە لـە نـاو سـەربازگەدا داکـەوت، لـە هەرچوار لاوە بووە هـەرا و زەنـا. لەبـەر غـیرەت، مـووی لەشـی پیـاو، دەتـوت نـووکی ڕمـن و لەسـەر کراسـەوە ڕواون.عـەلیڕەزا خـان (سـەرهەنگی تۆپخانـەی موبارەکـە) بەدوو دەزگا تۆپ و سوارەی سـەلیم خـانی چاردۆڵی-یـەوە بـۆ یارمـەتی سـەربازەکان بەڕێ کـەوتن و تـا "جەوانمـەرد"ی(٣٦) گوندەکـەی ئاغـا پاشـای بـرازای قـادر ئاغـای مـوکری غاریـان دا. ئـەو سـەنگەرانەی کـە خـەڵکی گوندەکـە سـازیان کردبـوون،

بەگوللەی تۆپ و تفەنگ، وێران کران.**شیعر**:پیاوی جوامێر، کاتێ ڕێی کەوتە "جەوانمەرد" لەبەر شکۆی شێر، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاخەڵکی "جەوانمەرد" وتیان: ئەم پیاوە کێیە؟ جوامێرتر لەم جوامێرە نییەسەرتاسەری دەشت، بەخوێن ڕەنگا خەڵکی "جەوانمەرد" جیهانیان لێ بوو بە: چەرمە چۆلەکەناچار ئەوەی تووشی بەتووشی گوللە تۆپی ئاگرینەوە نەبوو، هەلات، بەلام دوای سەعاتێ، هەواڵ هات؛ کە سوارەی شاهسەوەن، کەوتوونەتە بۆسەی کوردانەوە، بۆیە لەشکری پیادەش، ڕابوون و ویستیان بچن یارمەتی بدەن، بەلام هێشتا لە سەربازگە دەرنەچووبوون، کە هەواڵی سەرکەوتنیان گەیشت. سەری سەربڕدراوی چەندین کوردیان هێنایەوە و تالانێکی زۆریشیان کردبوون. شەش (٦) سوارەی شاهسەوەن کوژرابوون.ئەو شەوە، عەلیڕەزا خانی سەرهەنگ لەگەڵ سوارەکانی سەلیم خان (ی چاردۆڵی)، لەبەر دووریی ڕێگەکە و پێڕانەگەیشتنەوە، گەڕانەوە. ڕۆژی دەیەمی مانگی زیحەجەی حەرام (١٨٨٠/١١/١٤ز) بەبۆنەی جەژنی قوربانەوە، لە "تیکان تەپە" دەمێننەوە. ئەوانەی ناو سەربازگەکە بەخۆشیی ئەعلا حەزرەت، شەهریاری (ڕۆحی دنیا بەقوربانی بێ) ئەو ڕۆژە جەژنیان گرت و قوربانییان کرد. "سەیفەدین خان، کوڕی سەردار"٣٧)) و "ئاغا پاشا" برازای "قادر ئاغا" بۆ ناو سەربازگەی سەرکەوتوو هاتن. کاتێ سەربازانی تورك بەهاتنی "ئاغا پاشا"یان زانی، خێرا ڕاپەڕین و ڕووەو ماڵەکەی بەڕێ کەوتن، تا بیکوژن و تۆڵەی خەڵکی "میاندواو"یان لێ بسێننەوە. حیساموڵولك بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە دەرگای ماڵەکەیان و نەیهێشت سەربازەکان بیکوژن.ڕۆژی یازدەیەمی زیحەجە (١٨٨٠/١١/١٥ز)، حیسامولدەولە بەدوو فەوجی ئازەربایجان و ژریمانی یەکەم و تۆپخانەی ئوتریشی (نەمسایی)یەوە، لەگەڵ هەندێ سوارە، بەو هۆیەوە کە ڕێگاکە تەنگەبەر بوو، لە پێشەوە دەڕۆیشتن، "بۆکان"یان کردە قۆناغ، کە گوندی "سەیفەدین خانی کوڕی سەردار"ە. ناوبراو لە ڕووی میوانداریی و پێڕاگەیشتنەوە کەمتەرخەمیی و درێغیی نەکرد. لە گوندێکی نزیك بۆکان (١٥ پازدە) دیلی خەڵکی میاندواوی لێ بوون، کە سەربازەکان ئازادیان کردن و بۆ ناو سەربازگەکەیان بردن.

شەو لە بۆکان دەمێننەوە و بەیانی بەرەو گوندی "مەلاڵەر"(٣٨)) بەڕێ دەکەون. لەم قۆناغەڕێیەدا "خان بابا خان"ی کوڕی "مەجید خان"، کە لە لایەن شێخ عوبەیدەوە، بەفەرمانڕەوای سابلاخ دانرا بوو و دوای تێشکانی شێخ، پەنای بۆ سەربازگەی ئیعتیماد سەڵتەنە هێنا، ناوبراویش ئەو (خان بابا خان)ی بۆ پێشوازی لەشکری (ئەراکی) ناردبوو، تا لە ناو ڕێگە، خۆراك و ئاو و تفاق بۆ لەشکرەکە و باربەرەکان دابین بکات. لەشکر لە "قەلا"(٣٩)) لایدا. سەربازەکان هەرکە ناوی "خان بابا خان"یان بیست، بەبێ پرسیار بەسەریدا دەبارێن و لەگەڵ (١٥ پازدە) کەسی تر دەیکوژن. خزم و کەسەکانی تری، پەنا بۆ گوندی "حەمامیان" دەبەن. سەربازەکان هێرش بۆ "حەمامیان"یش دەبەن. ئەوانیش دەست لە گیانی خۆیان بەردەدەن و دوو سەرباز بەگوللە دەکوژن. لایەکی دیوار هەڵدەدڕن و بەشەو هەڵدێن. کاتێ ئەم هەواڵە بەحیسامولدەولە دەگاتەوە، کار لە کار ترازا بوو و خان بابا خان کوژرا بوو. بەلاّم هۆی کوژرانی ناوبراو، خەڵکی میاندواو بوون، کە لەگەڵ لەشکرەکە بوون.بەیانی لە "مەلاّلەر"ەوە بەڕێکەوتن و لە (٦کیلۆمەتری سابلاّخ) لەنگەریان گرت. فەوجی شاسەر و ژریمان لە سەرەتادا لەوێ نەمانەوە و بەرەو "قەرەقشلاّق" چوون و تێکەڵ بەهێزەکەی ئیعتیماد سەڵتەنە بوون. بەلاّم نەصرولولك و حیسامولولك و عەزیزوڵلاّ خانی سەرتیپ و عەلیڕەزا خانی سەرهەنگی تۆپخانەی موبارەکە، بەر لەوەی لە "تیکان تەپە"وە لەشکر بەڕێ بخەن، دوو فەوجی سەربازی مەنسوور لەگەڵ ئاغا حسین سوڵتان و ڕۆستەم سوڵتان و (٥٠ پەنجا) سوارەی شاهسەوەن و سەلیم خان، بۆ پاسەوانییان دەنێرن. چەند سەربازێکی تورك، کە بەنیازی تالاّنیی لە سەربازگە دەرچووبوون، کوردەکان شوێنیان دەکەون و دەیانکوژن. لەم نێوانەدا ئاغا حسین سوڵتان و ڕۆستەم سوڵتان لەگەڵ سوارەی سەلیم خان و شاهسەوەن ڕووبەڕوویان دەبنەوە و (٢٠ بیست) کەسیان لێ دەکوژن و سەربازەکانیشیان لە دەست دەرباز دەکەن. دوای ئەمە، گشت تۆپخانە و فەوجەکان و سوارە، بەرێکوپێکی بەڕێ دەکەون، تا لە گوندی "مەلاّلەر" لەگەڵ حیسامولدەولە یەکدەگرنەوە.سەعات چواری ڕۆژی یەکشەممە: ١٧ی مانگی زیحەجە (١٨٨٠/١١/٢١ز)

دەگەنــــە قەرەقــــشلاّق. لــــەم کاتــــەدا هــــەواڵی کۆچــــی دوایــــی خوالێخۆشــــبوو حیشمەتولدەولە، لە دار الخلافە (تاران)ەوە بەحەزرەتی ئەجەل ئەکرەم سوپاسالاری گەورە دەگا. ئەویش لەبەر ڕێکوپـێکی هێزەکە، خێرا بەڕێدەکەوێ و ڕۆژێك بـەر لـە هاتنی لەشکری "ئـەراکی" بـۆ قەرەقشلاّق تەشـریف دێـنن.**بەشی دوازدەیەم باسی چـوونی لەشـکری سـەرکەوتوو بـەرەو محـاڵی "مەرگـەوەڕ" و "مـەنگوڕ" بـەفرمانی حەزرەتی ئەجەل ئەکرەم حاجی میرزا حسین خانی موشیردەولە" سوپاسـالاری گـەورە و شوێن کەوتنی شێخ قادر و هەمزاغا و دڵخۆشیدانەوەی کوردانی شارۆچـکەی سـابلاّخ و موکری**.بـەلاّم دوای تەشـریف هێنـانی سوپاسالاری مـەزن و گەیـشتنی هـەموو هێـزی "ئــــەراکی" بــــۆ قەرەقــــشلاّق، ڕۆژی دووشــــەممە، هەژدەیــــەمی هــــەمان مــــانگ (١٨٨٠/١١/٢٢ز) بەبۆنــەی ســەلامەتیی وجــوودی پــیرۆزی ئــەعلا حــەزرەت قــەدەر دەسەلاّتی، شەهریاری (ڕۆحی عالەم بەقوربانی بێ) و جـەژنی موبـارەکی "غـەدیری خوم"٤٠))، سەرلەبەیانی جەژنیان گرت، لێپرسراوان هەموو بەگـەورە و بـچووکەوە، بەخزمـەت سوپاسـالاری گـەورە گەیـشتن، هەریەکـە بەشـی خـۆی، بـەر ڕەحمـەت و لـوتفی، بەشـیان پـێ بـڕا. دوای سـلاّو گەیانــدن بەگــەورە بەرپرسـان، داوای کــرد کۆبوونەوەیـەك سـاز بکرێـت، تـا هێزێـك بەشـوێن هـەمزاغا و شـێخ قـادردا بنێـرن. ئەوانیش کۆڕێکی ڕازاوەیـان سـاز کـرد و لـە ئاکامـدا ئـەو کەسـەی فیـداکاریی نوانـد، حیسامولدەولە بوو، کە لەسەر خواستی خۆی، داوای کرد بـۆ "مەرگـەوەڕ"ی بنێـرن. هــەروەها عــەزیزوڵلاّ خــانی ســەرتیپیش بــەری لای "مــەنگوڕ"ی هەڵبــژارد.\ڕۆژی نۆزدەیـەم (١٨٨٠/١١/٢٣ز) عـەزیزوڵلاّ خـانی سـەرتیپ و عـەلیڕەزا خـانی سـەرهەنگی تۆپخانە، بەچوار تۆپ و سـوارەی قەرەپـەپاغ، بەفەرمانـدەیی حەسـەنعەلیخان، (٢٠٠ دووســەد) کــەس دوێــرن و ئێرانلــوو و ســوارەی بــەختیاری و ســوارەی یۆردچــی و فەوجی قەهرەمانیە و حەوتەمی شوقاقی و فەوجێکی حەسەنعەلی خانی ژەنراڵ لە سەربازگەوە بەرەو "لاجـان" و "مـەنگوڕ" بـەڕێ کـەوتن. هـەر ئـەو ڕۆژە حـەزرەتی ئەجەل ئـەکرەم سوپاسـالاری مـەزن، بـۆ بەڕێخـستنی ئـەم لەشـکرە، لـە سـەربازگەکە وەدەرکەوت و لە گەڕانەوەشدا بۆ ئەحواڵ پرسیی و بەسەرکردنەوە، تەشـریفیان بـۆ

ڕەشماڵەکەی حیسامولدەولە هێنا. حیسامولولکیش ڕۆژی بیستەمی هەمان مانگ (١٨٨٠/١١/٢٤ز) لەگەڵ دوو دەزگا تۆپی ئوتریشی (نەمسایی) و کاپیتان "واگنەر" و دوو دەزگا تۆپی کۆن، لەگەڵ محەمەد ئاغای یاوەر، فەوجی شاسەر و ژریمانی یەکەم، لەگەڵ مسێوبارون" و ئاغا خانی سەرتیپ لەگەڵ (٤٠٠ چوارسەد) کەس لە فەوجی چوارەمی تەورێز، فەوجی شەشەمی قەرەگوێزلو لەگەڵ فەزلوڵلا خانی سەرهەنگ، فەوجی مەنسوور لەگەڵ عەلی ئەکبەر خانی سەرهەنگ، فەوجی موخبیران لەگەڵ میرزا عەلی لە لایەن جەنابی ناصرلولك (١٠٠ سەد) کەس لە سوارەی قەرەگوێزلو، لەگەڵ دەلیخانی یاوەر، یوسف خان سەرتیپی شاهسەوەن بە(٤٠٠ چوارسەد) کەسەوە، خان کەشی خانی قەرەپەپاغ بە(٣٠ سی) کەسەوە، یوسف عەلیخان سەرکردەی خەڵخالی بە(١٠٠ سەد) کەسەوە، محەمەد قولیخانی شاهسەوەنی مشکین بە(١٠٠ سەد) کەسەوە، قوربانعەلی خان کوڕی فەزلعەلی خانی شاهسەوەنی مشکین بە(١٥٠ سەدوپەنجا) سوارەوە، قەراجەداغی عالیشان بەگ و سەردار بەگی قووجەبێگلو بە(٥٠ پەنجا) سوارەوە، تەهماسبقولی خان سەرکردەی سوارەی قەراجەداغی بە(١٠٠ سەد) کەسەوە بەرەو "مەرگەوەڕ" بەڕێ کەوتن.سەرلەبەیانی ڕۆژی بیست و یەکەم (١٨٨٠/١١/٢٥ز)، خودی حەزرەتی ئەجەل ئەکرەم(١٤) تەشریفیان بۆ "قادر ئاوا" هێنا و دوای بەڕێخستنی هێزەکان، گەڕانەوە. بەڵام حیسامولولك ئیتر لە ناو ڕێدا (جگە لەوەی کە بۆ دابینکردنی خواردەمەنی لە دەربەندی سندووس ڕایانگرت) چیتر لە ڕێگادا ڕاگیر نەبوون.ڕۆژی بیست و چوارەم (١٨٨٠/١١/٢٩ز) گەیشتنە شنۆ. لەوێ بۆ مەبەستی شارەزابوون لە چۆنێتی ڕێگە و بەهۆی باران بارینیشەوە، دوو ڕۆژی تێدا مانەوە. لەوێ کاپیتان "واگنەر" بەرەو قەرەقشلاق گەڕانەوە و تۆپخانەکەشیان بەمسیۆ "بارون" سپارد.ڕۆژی بیست و شەشەم (١٨٨٠/١١/٣٠ز) بڕیار درا لەشکر لە شارۆچکەی "شنۆ"وە بەرەو گوندی "ئاغ بلاغ" بەڕێ بکەوێ. کە (٣) فۆناغەڕێ (١٨کیلۆمەتر) لەوێوە دوورە. کاتێکیش فەوجی سەرباز لەو دەشتەدا ڕیزبوون، دەتوت زەوی بۆتە زەریا و شەپۆلدان؛ لەبەر سمکۆڵانی ئەسپ لە چەپ و ڕاستەوە، هاوار لە ماسی ناو ئاوەوە هەتا ئاسمان ڕۆیی، لەبەر گرمەی تۆپ و نەڕەی قارەمانی

سوپا، ماسی گیانی دەلەرزی و مانگ گیرا. کاتێ هەواڵی لەشکریان بۆ "مەرگەوەڕ" برد، مەرگەوەڕ بۆ کوردان بوو بەمەیدانی مەرگ. سەرەتا سوارەی قۆجەبێگلو و فەوجی مقرب الخاقان ئاغا خانی سەرتیپ، بۆ پاسەوانیی و شارەزایی ڕێگا بەڕێ کەوتن. دوای ئەوان فەوجی ئوتریشی (نەمسایی) و تۆپە کۆن و تازەکان، لەگەڵ فەوجی شەشەم و دەستەی مەنسوور و هەموو کەلوپەل و بارگە و بنەیان بەڕێ کەوتن. ئەو ڕۆژە دەستەی "موخبیران" لە بەراییەوە دانرابوون و حیسامولمولکیش خۆی لەگەڵ سەرجەمی سوارەکانی و سوارەی یوسف خان و قەرەپەپاغ و" هتد، لە هەموو لایەکەوە، کە لە ناوەڕاستی لەشکرەکەدا بوون، پێ بەپێی تۆپەکان دەڕۆیشتن، لەوپەڕی ڕێکوپێکیدا تا داوێنی چیاکە سەرکەوتن. چوونە سەر کێوێکی وا؛ کە لەو سەرەوە دەیانتوانی بەدەستی ڕووتیی "جدی" و "حەمل" ڕاو بکەن.مسیۆ "بارون" کە فەرماندەی تۆپخانەی موبارەکە بوو، دوای ئەوەی لە ڕێگەکە وردبووەوە، وتی: لەم کێوە پڕ لە بەردەلان و ڕێگا تەنگەبەرەوە، کە هەمووی بەرد و تەلانە، ئەم تۆپانە بەسەرباز و تۆپچی سەرناخرێن، باشتر وایە یەکراست بۆ شارۆچکەی شنۆ بگەڕێینەوە و بەشێکیش لەم لەشکرە، لەگەڵ تۆپخانە لە شنۆ بمێننەوە و بەشەکەی تری لەشکرەکەش لە سوارە و پیادە، بەرەو "مەرگەوەڕ" بەڕێ بکەون.حیسامولمولک ئەم قسەیەی نەسەلماند و فرمانی دەرکرد: تۆپەکان لە ئەسپەکان بکەنەوە و بەسەر شانی سەربازیاندا بدەن و بەمجۆرە ماوەی دوو فۆناغەرێ (١٢کیلۆمەتر)، بەناو ئەو سەرما و بەفر و زریانەدا بەسەر ئەو کێوە ڕەقەن و دەربەندە تەنگەدا، کە مێروولە دەرفەتی ڕۆیشتن و نینۆکی پڵنگی لێ گیر نەدەبوو، شەش سەعات لە شەو تێپەڕی بوو، کە گەیشتنە سەربازگەکە.ڕۆژی دوایی؛ بۆ ئەوەی سەربازەکان پشوویەك بدەن، هەر لەوێ مانەوە و مسیۆ (بارون)یش بۆ تاقیکردنەوەی ڕێگاکە، لەگەڵ دوو سەربازدا نزیکەی فۆناغەرێیەك (٦کیلۆمەتر) سەرکەوتن و گەڕانەوە و وتی: ئەم تۆپانە لەم ڕێگەیەوە، بەشانی سەرباز بۆ سەر ئەم کێوانە سەرناخرێن؛ چونکە لە هەندێ جێدا، هەڵدێری وای هەیە، کە ناکرێ تۆپی پێدا بپەڕێنینەوە، لەبەرئەوە ئەگەر بۆ "شنۆ" نەگەڕێینەوە، ئەوا من ئەم

کاره بەئەستۆ ناگرم. هەواڵیش هاتبوو، کە قادری کوڕی شێخ، بە(١٠٠٠٠ دەهەزار) کەسەوە لەسەر ڕێدایە.مسیۆ بارون تۆپخانە و فەوجی شاسەر و ژریمانی یەکەمیان ئامادە کرد و وتی: ئەوا من بەڕەزامەندیی خۆم، خۆم لەم کارە کێشایەوە و ئیتر دەسەلاتێکم نییە. هەر شتێکیش کە حیسامولولك بڕیاری لەسەر بدات، دەبێ ئێوەش گوێڕایەڵی بن و سەرپێچی لێ نەکەن. دوای ئەوەی ئەم قسەیەی لە خۆکێشانەوە کرد و بەرلەوەش لەشکر بەڕێ بکەوێ، سواری ئەسپ بوو و ڕێگەی گرتە بەر و لەگەڵ سەرباز و تۆپخانەکە گەیشتنە دامێنی کێوەکە.لە هەندێ شوێندا، کە هەڵدێر و تەلان بوو، بەفرمانی حیسامولولك، بەهەزار زەحمەت و کوێرەوەری و بەدەستی خودی حیسامولولك و سەرباز و بەپاچ و پێمەڕە تەختیان کرد و دیسانەوە تۆپەکانیان بەشانی سەربازدا دایەوە و پەڕاندیانەوە؛ بەجۆرێك کە زەین و ئەقڵی مسیۆ (بارون) و فەرەنگییەکانی تریش، وەك شای شەترەنج، لە بزووتنی پیادەی فیلەتەن، دوای ماندووبوونی ئەسپ، ڕامان و ڕۆحیان لە خانووی سەرگەردانیی جێهێشت و ناچار کەوتنە ستایشکردن.سەرەتای خۆرنشین بوو، کە بەمەحاڵی "مەرگەوەڕ" گەیشتن. هەموو خەڵکی ناوچەکە لە ترسی گیانیان، بۆ چیا و دەشت هەڵاتبوون، تاقە کەسێکیش لە "مەرگەوەڕ"دا نەمابوو. دەنگوباسیان عەرزی حەزرەتی ئەجەل ئەکرەم: سوپاسالاری مەزن کرد. عەبدوڵلا خانی زەرزا، کە لە چیای باکووری "شنۆ"وە، هەواری هەبوو و فرمانێکی سەبارەت بەو و بەدانیشتووانی شنۆ نەفەرموو بوو، بەمجۆرە کاری بەناوبراو نەدا و هەر ئەم باسەشی عەرزی جەنابیان کرد.بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە مقّرب الخاقان: تەیموور پاشا خان، دوای بیستنی هەواڵی هاتنی لەشکر، بۆ مەحاڵی مەرگەوەڕ، لەگەڵ هەندێك لە فەرمانـدەکانی خۆی هاتن. شتێك وەك خواردەمەنی و کا و وێنجە، لە شار و گوندەکاندا نەمابوو. بەشەکانی لەشکر کەوتبوونە تەنگوچەڵەمەوە؛ کە بەخششی خوا گەیشت و عەبدولحسین بەگی نایب، کە بۆ هێنانی خواردەمەنی لە "باڵەخچی"ی مەحاڵی "سندووس" لە لایەن حیسامولولکەوە نێردرا بوو، لەگەڵ دەستەیەك سوارەی "قەرەگوێزلوو"، کە بە"وەلیخانی یاوەر"یان سپاردبوو، لەگەڵ

خۆیاندا (١٠٠ سەد) بار ئاردیان بەلەشکر گەیانـد، کـە پـەنجا بـار وشـتریان لـە لایـەن حیسامولولك و پەنجا باریشیان لە "قەرەپەپاغ" بەکرێ گرتبـوو. ئەمـە لـە کاتێکـدا بـوو، کـە ڕێگـاش گـیراو و بەبارسـتایی گـەزێکیش زیـاتر، بـەفر بـاریبوو. هـەر ئـەم دەرفەتە لە بەختی بەرزی شای جێگە "جەم" و "عالەم پەنا" بووە مایـەی دڵنیـایی و هێمنایەتی لەشکر و هەلاَتنی لەشکری شێخ. ماوەی (١٠ دە) ڕۆژ لە "مەرگـەوەڕ"دا مانەوە، بەلاَم لەبەرئـەوەی پێـی وابـوو لـەم زسـتانەدا هیـچیان پـێ نـاکرێ، بۆیـە بـۆ "ورمێ" گەڕانەوە و تێکەڵ بەسوپاکەی سوپاسالاری گەورە بوونەوە، کـە ڕاسـتەوخۆ لـە "سـابلاخ"ەوە بـۆ نـاو لەشـکرەکە دەهاتـەوە.دوای چـەند ڕۆژێـك فرمـان کـرا کـە حیسامولولك بۆ "خۆی" بچێ. قۆناغێکیان بـڕی و هـەر ئـەو شـەوە دوو گـەز بـەفر باری. سەرباری بەفر بارینیش، بـۆ سـبەی بـەیانی فەوجـەکانیان بەڕێخست. هێشتا بـەدەم ڕێـوە بـوون، نامەیـەکیان پێگەیـشت؛ دەڵـێ: هـەمزاغا سـەری هەڵداوەتـەوە و کوردانیشی لەگەڵە. لەبەرئـەوە چوونی ئێـوە چاك نییـە و باشـتر وایـە بگەڕێنـەوە. هەر بەوحاڵ و دارویارەوە، بەوپەڕی شپرزەیی و شێواوییەوە بـەرەو دوا گەڕانـەوە و بۆ شاری "ورمێ" هاتنەوە. دواتر خۆیان بـۆ ئـەوە ئامـادە کـرد، تـا بـەرەو "لاجـان" بچن. کەچی هـەواڵ هـات درۆ بـووە. بـەپێی فرمـان لـە ورمـێ مانـەوە. سـێ فـەوجی هەمەدان و دوو فەوجی قەزوین، لەو زستانە تـووش و سـەختەدا، سـەرەڕای گرانیـی خەلە و خـەرمان و نـەبوونی بارەگـا و جـێ و ڕێ، دەسـتبەرداری پاسـەوانێتی شـار و دەرەوەی شـار نــەبوون و لەگـەڵ دانیـشتووانی ورمێـدا بەوپــەڕی نەرمونیانییــەوە دەجووڵانـەوە. بـەلاَم لەبـەر نەخۆشـیی "تیفـۆس"، هەنـدێ لـە سـەربازەکان مـردن. هەرچـەندە دکتۆرەکـانی لەشـکرەکە بەرپرسـی دەرمـانکردنی دەسـتەی نەخۆشـەکان بـوون و ئەوپـەڕی چاودێریی و سەرپەرشـتیان دەکـردن و هـەموو خزمەتێکیـشیان دەکردن. (١٠ دە) سەربازی فەوجی شەشـەم و مەنـسوور لـە ژێـر ئـاواردا مانـەوە، بـۆ ئاگاداربوونیش لە ڕووداوەکە، حیسامولولك خۆی گەیاندە ئەو شـوێنە و (٧ حـەوت) سـەربازی لــە مــردن ڕزگــار کــرد و (١٠ دە) ســەربازیان فیــدای خــۆڵی بــەرپێی گەوهەرئاسـای پـیرۆز.زسـتان لـە "ورمـێ" مانـەوە. بـەردەوام "سـدیق کـوڕی شـێخ"

پیـــاوی دەنـــارد و داوای لێبـــووردنی دەکـــرد. عـــەرزی جـــەنابی جـــەلال ئاســـای ئەمیرنیزامیان کرد، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی ئـەو دەیویـست، بەچاکیان زانـی کاریـان بەکوڕی شێخ نەدابێ. ئیقبالدەولە و نەصرولولك و حیـساموڵولك، نـاو بـەناوێك لـە شـوێنێك کۆبوونـەوەیان دەکـرد و لەگـەڵ هەنـدێ لـە دانیـشتووانی شـاردا ڕاوێـژیان دەکرد و دەنگوباسیان دەگۆڕییەوە، دواییش هەواڵەکانیان بە"تەتـەر"دا ڕادەگەیانـد. دوای جەژن بەپێی فەرمان، لەشـکر لـە دەوری شـار دامـەزرا و چاوەنواڕی گەیـشتنی فرمان و هاتنی ئیعتیماد سەڵتەنەیان کرد.لە کۆتایی مانگی جەمادی دووەم (کۆتایی مایـسی ١٨٨١ز)دا ئیعتیمـاد سـەڵتەنە گەیـشت. دوای هاتنیـان حیـساموڵولك لەگـەڵ فەوجەکانی سێ قۆڵی عاشقلو و (١٠٠ سەد) سوارە و دەستەیەك مۆسیقاژەن و شـەش دەزگا تۆپ، بەسەرهەنگیی عـەلیڕەزا خـانی گەڕووسـی، لەوپـەڕی ڕێکوپێکیـدا بـەرەو "لاجان" چوون. (١٠ دە) ڕۆژ دوای بەڕێکەوتنی لەشـکری "لاجـان" خـودی ئیعتیمـاد سـەڵتەنە لەگـەڵ نەصـرولولك و فەوجـەکانی "قـەزوین" و فـەوجێکی "ئەفـشار" و سوارەی ڕەحیم خان و فـەڕوخ خـانی چـەلیبانلو لەگـەڵ شـەش دەزگـا تـۆپی بـن پـڕ بەرەو "مەرگەوەڕ" بەڕێکەوتن.ئەم لەشکرانە بەوپـەڕی ڕێکـوپێکیی و ڕازاوەیـی، تـا مانگی شەعبان لە "لاجان" و "مەرگەوەڕ" مانەوە؛ کە جەنابی ئـەمیرنیزام، بـەپێی فرمان تەشریفیان بۆ "لاجـان" هێنـا. ڕۆژی تەشـریف هێنانیـان، فـەوج و سـوارەکان پێشوازییەکی وایان لە ئەمیرنیزام کـرد، کـە بەخەیاڵدا نـەدەهات.ئـەویش ئەوپـەڕی گـەورەیی خـۆی لەگـەڵ ئەنـدامان و نۆکـەران نوانـد. حـەوت ڕۆژ مانـەوە و هـەموو ڕۆژێکـیش بـۆ مەیـدانی مەشـق دەچـوون، جـارێکیش بەتایبـەتی تەشـریفیان بـۆ لەشـکری نیزامـی هێنـا و زۆریـان تـاریفی هەڵـسوکەوت و ڕێکـوپێکیی و پتـەویی سەنگەرەکان و پاك و خاوێنیی سەربازگەکە کرد و سەربازە نەخۆشەکانیشی خەڵات کرد و دەستی سۆزی بەسەردا هێنان. نانی نیوەڕۆیان لـە ڕەشماڵەکـەی حیـساموڵولك خـوارد. مۆسـیقاژەنانی هەمـەدانی، بـۆ پیرۆزبـایی و بەبۆنـەی تەشـریف هێنـانی ئەمیرنیزامـەوە، بـەجۆرێکی وا مۆسـیقایان ژەنـد، کـە (٥٠ پـەنجا) تمـەنیان خـەڵات کـردن و عـەلی بـەگی سوڵتانیی (مۆسـیقاژەن) بەپلـەی یـاوەریی گەیـشت و مـزگێنی

مۆڵەتـدانی ئـەو ڕۆژەش، بەهـەموو نۆکـەرەکان گەیـشت. حـەوت ڕۆژ مانـەوە و پاشماوەی بڕیاری مۆڵەتدانی بۆ هەرکەسێ، بەئەندازەی گیانبازیی و فیداکارییەکەی پێ درا و دوایی تەشریفیان بردەوە" ئەمەش دەقی ئەو نامەیەیە، کە خزمەتـەکانی حیـسامولولك بـاس دەکـا و بـۆ خزمـەت ئـەمیری گـەورەی نایـب الـسلطنە، وەزیـری جەنگ نێردراوە:قوربانی وجوودی موبارەکتـان بم. کاتێـك پلـە و پایـەی خزمـەت و شایان بوونی کەسێك بەوپەڕی خۆی گەیشت، ئیتر دەربەستی سـتایش و پێداهـەڵنان نابێ، بـەڵام دیـسانیش پێویـستە بـەکورتی باسـی خزمەتـەکانی سەرباشـقەی میرانـی مـەزن: حیـسامولولك لـە سـەفەری ئازەربایجـان بکـەم، کـە نـاوبراو هـەر لـە بـەرایی ئەرکەکانی ئەم سەفەرەیدا، ڕۆژێك لەگەڵ خوالێخۆشبوو "حیشمەت دەولە"دا لە دار الخلافەوە بەڕێ کەوتوون، لە کاتێکدا کە شازادەی خوالێخۆشـبوو(٤٢) ڕاسـتەوخۆ لـە ڕێگـەی "گـەڕووس"ەوە بەڕێکـەوتبوو، حیـسامولولك دەسـتبەجێ لـە دار الخلافـە "تاران"ەوە خۆی گەیانـدە "هەمـەدان" و لـە مـاوەی پێـنج ڕۆژدا، هەرسـێ دەسـتەی "قەرەگۆێزلوو" و (١٠٠ سەد) سوارەی تـازەی خـۆی بەوپـەڕی شـکۆ و ڕێکوپێکییـەوە تـەیار و ئامـادە دەکـا و بەپەلـە بـەڕێ دەکـەوێ و چـەند ڕۆژێکـیش بـەر لـە هـاتنی شـازادەی خوالێخۆشـبوو، لـە گـەڕووس ئامـادە دەبـێ. حـەزرەتی والا دەزانـن کـە بەڕێخستنی ئەم سێ فەوجەو بەو خێراییە، کارێکی وا سانا نەبووە و کـاتێکیش لـە گەڕووسەوە لەگەڵ شازادەی خوالێخۆشبوودا بەڕێ دەکەون و لە ناوچەی "ئەفـشار = هەوشـار" ئـەو کارەسـاتە ڕوو دەدا و سـوپای دەوڵـەت، بەفەرمانـدەکان دەسـپێردرێ، سەرەڕای ئەو شێواویی و پەرێشانییەش، حیسامولولك لەشکری خـۆی لـە هـەموویان ڕێکـوپێکتر و جـوانتر بەڕێـدەخا و سـەربازگەی "قەرەقـشلاق" تێکـەڵ بەلەشـکری ناوەندی دەبێ. لەو ماوەیەدا، کە ئەرکـەکانی خـۆی لـە "مەرگـەوەڕ" بـەڕێوە دەبـرد (کە شوێنی نیشتەجێبوونی شێخ قادر بـوو)، گـەورەترین خزمەتـەکانی خـۆی لـەوێ کرد و لەگەڵ کەند و کۆسپی زۆریشدا ڕووبەڕووبووەوە. زۆر کەس ئـەو ئەرکـەی لـە ئەسـتۆ نـەدەگرت، بـەڵام حیـسامولولك ئـەو ئەرکـەی بـەدڵ قبـووڵ کـرد و لـە ناوجەرگـەی سـەرما و سـۆڵە و دژواریـی و بـەفری زۆر و قـات و قڕیـی خـۆراك و

بەسـەختییەکی زۆردا، لـە "شـنۆ"وە تێپـەڕ بـوو و خـۆی گەیانـدە "مەرگـەوەڕ" و ئەوەنـدە ڕۆژەی کـە پێویـست بـوو، لـەوێ مایـەوە. بـوو بەفەرمانـدەی ورمـێ. ئـەو ماوەیەش کە لە ورمێ نیشتەجێ بوو، وەك چۆن فەوج و سوارەکانی خۆی بەوپـەڕی ڕێکوپێکیی ڕادەگرێ، بەهەمان شێوەش خەڵکی ورمێ لە ئاکاری جوانی خـۆی ڕازی دەکا و لەم دواییيانەدا لە "ورمێ"، بەفەوجی "سێ قۆڵی" و سـوارەی "خـۆی"یـەوە، بۆ پشتیوانیی لەشکری "سابلاخ" و پێکهێنـانی هێـزی "لاجـان"، بـوو بەفەرمانـدەی شوێنە گرنگەکانی ئەم دەوروبەرە و نزیکەی (١٠٠٠ هەزار) سـوارەی "قەرەپـەپاغ" و "مامش"ی پێ دەسـپێردرێ. یەکـەم لەبەرئـەوەی بەوپـەڕی ڕێکـوپێکیی و ئەوپـەڕی شـان و شـکۆوە لـە "ورمـێ"وە بـۆ "لاجـان" دەچـێ و دووەم لەبەرئـەوەی لـەوێ لەشکرێکی ڕێکوپێك، بەهـەموو پێویـستییەکانییەوە دادەمـەزرێنێ و ڕێکـی دەخـات. ئەمانەش لە هەلومەرجێکدا ئەنجامـدراون، کـە ئیلـی "قەرەپـەپاغ" و "مـامش" لـە هـاتنی هێـزی دەوڵـەت، بـۆ "لاجـان"، زۆر دەترسـان و سـەرەتا زۆربـەیان بلاوەیـان کردبـوو. بـەلام حیـسامولمولك بـەجۆرێك تەقـەللای هێورکردنـەوەیان و ڕێکخـستنی لەشکری داوە، کـە سـەرلەبەری ئیلـی قەرەپـەپاغ و مـامش، بوونـە دۆسـتی لەشـکر و لەوپەڕی ئاسایشدا کار و کاسبی خۆیان دەکرد. حیسامولمولك بۆ پاراستن و ئاگاداریی شـوێنە گرنگـەکانی ئـەم ناوچـەیە، لـە هـەموو کەسـێك باشـتر تێدەکۆشـا.هەرچـی پێداویـستی سـەرکردەیی ئـەو لەشـکرە و هەلومـەرجی پاراسـتن و پارێزگـاریی بـووە، هـەموویانی بـەجێهێناوە، بـەجۆرێك کـە جـەنابی "وەزیـری فەوائیـدی گـشتی"(٤٣)) ستایشی هەوڵ و تەقـەللا و بـەڕێوەبردنی ئەرکـەکانی دەکـرد و دەستخۆشـانەیان بـۆ دەنووسی.لەم سـەروبەندەدا، کـە ئـەم نۆکـەرە بـچووکەتان لـە سـابلاخەوە بـۆ لاجـان چووم و لە نزیکەوە بەچاوی خۆم هێزەکـەیم بـینی، بـەبێ لاف و گـەزاف عـەرزتانی دەکەم، کە تا ئێستا سەرباز و سـوارەی (پـاش ٩ مـانگ خزمـەت)، ئـاوا هێـشتا تـازە و پاك و خاوێن و لەشکرێکی بەم ئاستە ڕێکوپێك و خاوەن لێپرسـراوگەلی ئـاوا شـایان و چـەکی وا تـازە و نـوێم نـەدیبوو، کـە لـە هـەموو ڕوویەکـەوە شـایانی سـتایش و ئافـەرینن. ئاشکراشـە ئەمانـە هـەمووی لـە ئاکـامی مانـدوبوون و لێوەشـاوەیی و

کـارزانیی "حیـسامولولك"ەوەیـە؛ کـە جگـە لـە گـەورەیی بنەماڵـە و ڕەسـەنایەتی وەجاخزادەبوونی بۆ نۆکـەریی "شاهەنـشا"، بەوپـەڕی خـۆی گەیـشتووە و لـە ڕیـزی سەرکردە و فەرماندەکانی سوپادا، مایەی شانازیی لەشکری دەوڵەتە. هەرچەندە مـن خۆم سەبارەت بەحیسامولولك خۆی و هێزەکەی؛ دەرگای سۆز و خۆشەویستیم بۆی ئـاوەڵا بـووە، بـەڵام پاداشـی ئـەمجۆرە خزمـەت و ماندووبوونانـە، لـەم سـەفەرەی دەرخـستنی لێوەشـایی و کارزانییـان، پێوەنـدی بەبەخـشش و خـەڵاتکردنی ڕەحمـی شـاهانە و چـاودێریی تایبـەتی حـەزرەتی ئەشـرەف والایـە (ڕۆحمـان بـەقوربانی بێ).أمرکُم الأشرف الوالا مطاع، ٢١/ی مانگی شـەعبانی ١٢٩٨ کۆچـی (١٨٨١/٥/٢٢ز)دوو ڕۆژ دواتر (٣٠٠ سێ سەد) سـەرباز لـە فەوجـەکانی "سـێ قـۆڵیی"، ٣٠) سـی) تۆپـچی گەڕووس لەگەڵ غـوڵام حـسین خـانی یـاوەر، فـەوجی "مەنـصووری" بەفەرمانـدەیی حیسامولولك بۆ "سابلاخ" هاتن. سـەرەڕای تـرس و دڵەڕاوکەیـەك کـە دانیـشتووانی شاری سابلاخ هەیانبوو، بەوپـەڕی ڕێکوپێکیی و میهرەبانییـەوە بـەڕێ کـەوتن. دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە و پاشان ئەو هێزەیان بەڕێخست و لە ڕێگەی "میاندواو" و "ساین قـەڵا" و "بیجاڕ"ەوە بـۆ وڵات گەڕانـەوە.خانـەزاوی گیانفیـدا: عـەلی ئەکبـەر خـانی سەرهەنگی فەوجی مەنصوور، کوڕی حیسامولولك، بۆ ئاگاداریی هاوڕێیانی بارەگـای موبارەکی ئەعلا حەزرەتی قەدەر دەسـەڵاتی هومـایۆنی (ڕۆحـم بەفیـدای بـێ)، ئـەم کتێبـەی کـە بـەناوی "إفتتـاح ناصـری"یـەوە نـاودێر دەکـرێ و ئاگـاداری و زانیـاریی پێشکەش بەخاکی بـەرپێی موبـارەك دەکـرێ.کتـێبی "نەصـاری"یـش، کـە زەحمـەتی کێـشاوە و بـەزبانی فەرەنـسایی و هـەر لـەم بارەیەوەیـە؛ ئـەویش هـەر بەدەسـتی موبارەکی ئەعلا حەزرەت ئەقـدەس، سـێبەری خوداوەنـد (ڕۆحمـان بـەقوربانی بـێ) دەگات.(٤٤)

**پەراوێزەکان:**

(١) ســالّح محەمەدئــەمین، کــورد و عەجــەم، چــاپی دووەم، ســلێمانی ١٩٩٢، ل ٦٢.
(٢) استانفورد. جی. شاو ازل کورال شاو، تـاریخ امبراتـوری عپمانی و ترکیـه جدیـد، ترجمه محمود رمچانزاده، انتشارات معاونت فرهنگی آستان قدس رچوی، چاپ اول، ١٣٧٠ش.(٣) مجـیر شـیبانی (دکـتر)، عـالم آرای صـفوی، تـشکیل شاهنـشاهی صـفوی، دانگـشاه تهـران، ٦٤٣١ش، ص ٩١.(٤) سـالّح محەمەدئـەمین، ل ٣٩.(٥) کـریس کوچـیرا: جُنبش ملّی کُرد، ترجمه ابـراهیم یونـسی، مؤسـسه انتـشارات نگاه، چاپ اول، تهـران ١٣٧٣ش، ص ٢٦.(٦) روبـرت اولـسن، ص ٢١، قیـام شـیخ سـعید پـیران، ترجمـه ابـراهیم یونـسی، مؤسـسه انتـشارات نگـاه تهـران چـاپ، چـاپ اول، ١٣٧٧ش، ص ٢١.(٧) هـەمان سەرچاوە، ص ١٩.(٨) هەمان سەرچاوە، ص ٢٠.(٩) بۆ زانیاریی لەو بارەیـەوە، بنـوارە: حەمەباقی، محەمەد: شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلاّ لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، چاپەمەنی دەسگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، لاپەڕە ١٦١ ـ ١٦٩ .(١٠) سالّح محەمەدئەمین، ل ١٦٨.(١١) هــەمان سەرچــاوە، ل ١٥٢ - ١٥٣.(١٢) هــەمان سەرچــاوە، ل ١٥٢ - ١٥٣ (بەهەنــدێك دەسـتکارییەوە).(١٣) حەمـەباقی، محەمـەد، شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوڵلاّی نـەهری لـە بەڵگەنامەی قاجاریدا، چاپەمەنی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠؛ بنوارە پاشکۆی ژمـارە (١٣)، نامــەی ئــابۆت بــۆ گرانڤێـل.(١٤) هــەمان سەرچـاوە، بنــوارە پاشـکۆی ژمــارە (١)، بەڵگەنامـەی ژمـارە ٥٩١.(١٥) کـریس کۆچـێرا، ل ٢٧.(١٦) شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوڵلاّی نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، بنـوارە پاشکۆی ژمـارە ١٣.(١٧) بەتایبـەتیش کتێبـە ناوازەکەی دوکتۆر جەلیلی جەلیل (ڕاپەڕینی کوردەکـان - سـاڵی ١٨٨٠)، کـە تایبـەت و تەرخانە بۆ ئەم ڕاپەڕینە و هەروەها کتێبـەکانی: دوکتـۆر سـەیید عـەزیز شـەمزینی (جووڵانــەوەی ڕزگــاریی نیـشتمانیی کوردسـتان) و (ن. خـاڵفین - خـەبات لـە ڕێـی کوردسـتان)دا، کـە هەریەکـەیان فەسـڵێکیان بـۆ هـەمان ڕاپـەڕین تـەرخانن. بـەڵام کتێبەکــەی ســالّح محەمەدئــەمین ئــاوڕێکی زیرەکانــەی لــە بەشــێکی زۆری ئــەم بەڵگەنامانەی قاجاری داوەتەوە.

(١): مەبەست لە "نوچە"، "ناوچیا"یە و هەمیشەش بەو ناوەوە ناوی دەبات. (٢): حیسامولولك: باوكی نووسەری ئەم بیرەوەرییانەیە و لە ئەفسەرانی پایە بەرزی سوپای قاجار بووە وەك پێشتریش ئاماژەی پێ كرا؛ ناوبراو لە كاتی شۆڕشەكەی شێخ عوبەیدوڵڵادا، وەك فەرماندەیەكی لەشكری ئێرانی، لە تێكڕای قۆڵەكانی شەڕ و پێكدادان، لە: بناو، میاندواو، موكریان، سندوس، شنۆ، مەرگەوەڕ و لاجاندا، تا شكانی هێزەكانی كورد و پاشەكشەیان و گرتن و بردنی "شێخ عوبەیدوڵڵا" بۆ ئەستەموول؛ واتە: تا نزیكەی (٨ - ٩) مانگ، ڕاستەوخۆ لە ڕیزی لەشكری ئێراندا، دژی هێزەكانی كورد، شەڕ و بەشداریی بەردەوامی هەبووە.(٣): شاهەنشای غازی: مەبەست لە محەمەد شا (١٨٣٥ز – ١٨٤٨ز)ی كوڕی "عەبباس میرزا" و سێیەمین شای زنجیرەی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی قاجارە، كە دوای مەرگی فەتح عەلی شای قاجار (ی باپیری)، لە كانوونی دووەمی ١٨٣٥ز-دا كراوە بەشای ئێران. محەمەد شا جگە لەوەی پێوەندییەكی توندوتۆڵی لەگەڵ "سەیید تاها"ی باوكی شێخ عوبەیدوڵڵادا هەبووە، یەكێكیش لە ژنەكانی "خەدیجە خانم" كورد بووە، كە كچی "یەحیا خانی چەهریق" و بەبنەماڵەش سەر بەتەریقەتی نەقشبەندی و مریدی بنەماڵەی "سەیید تاها"ی نەهری بوون.(٤): هەمیشە لەجیاتی "شێخ عوبەیدوڵڵا"، "عوبەید" دەنووسێ.(٥) مەبەست لە دوایین جەنگی (١٨٧٧ – ١٨٧٨ز) نێوان ڕووسیا و توركیایە.(٦): مەبەست لە شێخ محەمەد سدیق (٥٥٨١ز - ١١٩١ز)ی كوڕە گەورەی شێخ عوبەیدوڵڵایە.(٧): دەشتەبێڵ: دەشتێكی بەپیتی نێوان "نەغەدە" و "شنۆ"یە.(٨): ئیقبالدەولە: فەرمانڕەوای ورمێ بووە.(٩): محەمەد ئاغا؛ یان: حەمەد ئاغای مامش (؟ – ١٩٠٨ز) كوڕی "پیرۆت ئاغا" و سەرۆكی هۆزی "مامش" بووە و هەتا لە ژیاندا بووە، سەرومڕ دەوڵەتخواز و ڕاوێژكار و چاوساغی دەوڵەت بووە بۆ لە داوخستنی نەیارانی دەوڵەت و كوردانی ئازادیخواز. محەمەد ئاغا لە گوندی "نەڵۆس"ی سەر بە"شنۆ" كۆچی دوایی كردووە. ناوەندی خێڵی مامش، گوندی "پەسوێ"یە.(١٠): زۆر سەیرە! ئەفشارەكان لە كوردستاندا بەمننەت فەرمانڕەوایی شنۆ و مەرگەوەڕ بەكوردێكی خودی ئەو ناوچەیە دەدەن و بەو ناوچەیە دەڵێن: ماڵی ئەفشار!!.(١١):

ئاغـا شـازاده: مەبەسـت: "لوتفعـەلی خـان"ی کـوڕی تەهماسـب میرزایـە، کـە لـەو سـەردەمەدا فەرمانڕەوایـەکی بـەرتیلخۆر و هـەرزە و تۆسـنی سـابلاخ بـووە و بەبنەچـەش نـەوەی فـەتح عـەلی شـای قاجـارە.(١٢)؛ وەلیعەهـد: مەبەسـت لـە موزەفەرەدین میرزا (١٨٣٥ز — ١٩٠٧ز)ی کوڕی ناسرەدین شایە، کە لە تەمـەنی (٥٠) ساڵییەوە تا مێـژووی کوشتنی ناسرەدین شای باوکی (١٨٤٨ز — ١٨٩٦ز) وەلیعەهدی ئێـران بـووە؛ کـە بارەگاکـەی لـە "تـەورێز" بـووە.(٣١)؛ مەبەسـت لـە هـەمزاغا (؟ - ١٨٨١ز)ی سـەرۆك ئیلـی مـەنگوڕە، کـە بەدرێـژایی ساڵانی (١٨٤٥ز - ١٨٨١ز)؛ واتـە: لـە ماوەی (٢٥) ساڵێکدا وەك قارەمانێکی میللی، لە هەردوو بەشی کوردستانی بندەستی قاجاری و عوسمانی دا، دژی زوڵم و بێدادیی ئەو هەردوو دەسەڵاتە ڕاپەڕیوە و ساڵی (١٨٨٠ز)ش لـە شۆڕشـەکەی شـێخ عوبەیـدوڵلادا، وەك سوپاسـالاری لەشـکری قـۆڵی موکریان - ئازەربایجانی خۆرهـەڵات، زۆر جوامێرانـە فەرمانـدەیی هێزەکانی کوردی کـردووە و لـە ماوەیـەکی کەمـدا شـار و شارۆچـکە و ناوچـەیەکی زۆری بندەسـتی دەوڵەتی قاجاری ڕزگار کردووە و تاقانە سەرۆك ئیلێکی ناوچەی موکریانە، کە دوای تێـشکانی شۆڕشـەکەی شـێخ عوبەیـدوڵلا، سـەری بـۆ هـەردوو دەوڵـەتی قاجـاری و عوسمانی شۆڕ نەکردووە و لە تۆڵەی ئەم ڕاپـەڕین و ملنەدانەشـدا، سـەرانی لەشـکری قاجاری، بەهاوکاریی هەندێ سـەرۆك خێڵـی خائینی کـورد، خـستیانە دواوەوە و زۆر ناجوامێرانە، خۆی و هاوڕێکانیان لە (١٨٨١/٧/٣١ز)دا لە سابلاخ کوشتن و سـەرەکانیان بـەبڕدراوی بـۆ ورمـێ نـاردن و بـۆ چـاو تۆقانـدنی کـوردیش، بـەدەروازەکانی شـاری ورمێدا هەڵیانواسـین. (بـۆ زیـاتر زانیـاریی، بنـوارە: حەمـەباقی، محەمـەد: ڕاپـەڕینی هەمزاغای مەنگوڕ لە بەڵگەنامەی قاجاریدا. چاپەمەنی ئاراس، هـەولێر، ٢٠٠٢).(١٤)؛ واتە: باسەکەیان بۆ ئاغا شازادەی حاکمی سابلاخ گێڕایەوە.(١٥)؛ واتە: هێزی دەوڵـەت بـۆ بـەرەنگاریی لەشـکرەکەی شـێخ لـە ورمـێ و سـابلاخەوە نەگەیـشتبوون.(١٦)؛ سیۆرسات: پێویستی لەشکر و تفاقی باربەر.(١٧)؛ لە بەڵگەنامەکاندا بـە"چهاردۆڵی"، واتە: چوار دۆڵـی دەنووسـرێن. بـەڵام لـە کوردەواریـدا پێیـان دەڵـێن: "چـەرداوەڕوو" چـونکە هەڵکـەوتی جوگرافیـایی ناوچـەکەیان (نێـوان مەراغـە و میانـدواو)، کـە لـە

فارس و تورك و ئـازەرەوە نـزیكن، وای لێكـردوون هەمیـشە بـەگوێرەی هەلومـەرجی بەرژەوەنـدی خۆیـان ئاكـار دەنـوێنن و هەڵوێـست وەردەگـرن و هـەر ڕۆژێـك، هـەر نەتەوەیەكی ئێرانـی: فـارس، تـورك، ئـازەر، كـورد، دەسـتی بـڕوات، خۆیـان سـەر بـەو نەتەوەیە حساب دەكەن. بۆیە پێیان دەڵێن: "چواردۆڵی" و هەر لەبەر ئەم بێ باریی و هەلپەرستییەشیان، كورد پێیان دەڵێن: "چەرداوەڕوو".(١٨): لە هەندێ سەرچاوەدا بە"نوری بـەگ" نـاوبراوە. بـەڵام دوای پرسـیاركردنی ناوەكـەی، دەركـەوت كـە "مـیر بـەگ"ی "بەردەسـووری"یـە.(١٩): مەبەسـت لـە: "سـەیید تاهـا"ی بـاوكی شـێخ عوبەیدوڵڵایـە.(٢٠): مەبەست لـە: شـێخ عوبەیدوڵڵایـە.(٢١): مەبەسـت لـە هـەواڵی ڕەشـەكوژكردن و قەلاچۆی قەرەپەپاغەكانـە؛ كـە گوایـە لـە لایـەن لەشـكری كـورد و شـێخ قـادر و هـەمزاغاوە دراوە و لـە ڕاستیـشدا هـەواڵێكی بـێ بناغـە بـووە.(٢٢): مەبەسـت لـە: هـەمزە مـیرزای مـامی ناسـرەدین شـایە.(٢٣): جریـب: مەبەسـت لـەو ڕووبەری زەوییەیە، كە بەرامبەر بە گوێرەی شوێنی جیاوازە و نزیكەی(١٠٠٠ - ٣٦٠٠) مەتر چوارگۆشـە.(٢٤): مەبەست لـە: گوڵاوی ئاغـا (؟ - ١٨٨١ز)ی كـوڕی مـارف ئاغـای (نستان)ی سەرۆكی خێڵی "دیبۆكری"یە، كە هەر لە بنەڕەتەوە پیـاوی دەوڵـەت و لـە سـەرەتای ئـەم شۆڕشەشـەوە دژی شۆڕشـەكە بـووە و بـەر لـەوەش خـۆی بەدەسـت هێزەكانی دەوڵەتەوە بدات، شێخ عوبەیدوڵڵا نامەی بۆ ناردووە و داوای یـەكتر دیـتن و هاوكـاریی لـێ كـردووە؛ كەچـی نـەك هـەر وەڵامـی نامەكـەی شـێخ عوبەیـدوڵڵای نەداوەتـەوە، بـەڵكو بەبەرچـاوی خەڵكـەوە نامەكـەی دڕانـدووە و بـەردەوامیش دڵـی خەڵكی كوردی لە پشتیوانیی شۆڕشـەكە سارد كردۆتـەوە و تەقـەللای ئەوەیـشی داوە ئاغاكانی موكری و محەمەد ئاغـای مـامش و سـەلیم خـانی چاردۆڵی، بـۆ ئـەوە یـەك بخات، تـا هـەمزاغای مـەنگوڕ (سوپاسالاری شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوڵڵا) بكوژن. ئـەم كـاری خـۆ بەدەسـت دەوڵـەت دانەوەیەیـشی كـاری دڵ ساردكردنەوەی زۆر گـەورە و خراپی بۆ سەرانی تری موكری و لەشكر و بەرنامەی شۆڕشەكەی ١٨٨٠ هـەبووە. (بـۆ زیـاتر زانیـاری، بنـواڕە: غوریـانس، اسـكندر، قیـام شـیخ عبیداللـه شمـزینی در عهـد ناصرالدین شاه، به اهتمام عبدالله مردوخ، چاپ اول ١٣٥٦ش. لاپـەڕەكانی: ٣٧، ٣٩، ٤٨،

٤٩، ٥٥، ٥٩.(٢٥): حەسەن عەلی خان (١٨٢١ز – ١٨٩٩ز)ی کوڕی محەمەد سادق خانی کەبودوەندە و خۆی بەبنەچە کوردی ناوچەی گەڕووسە. خوێندەوار و خۆشنووس و ئەدیب و سیاسەتمەدارێکی هەڵکەوتە و دنیادیدەی زۆر زیرەك و بەتوانا بووە. چەندان کتێبی وەك: "منشآت"، "پندنامەی یحیویە"ی نووسیوە، یان بەخەتی خۆی و لەسەر ئەرکی خۆی، کتێب و دیوانە شیعری شاعیرانی ناوداری ئێرانی نووسیونەتەوە و چاپی کردوون. چەندان جار سەردانی ئەوروپای کردووە و بۆتە باڵوێزی ئێران لە تورکیا و لەبەر ئازایەتیش، پلەی سەرهەنگ و سەرتیپ و ژەنەڕاڵ ئاجودانی لە لەشکری ئێراندا پێ دراوە. دواتریش چەند جارێك بۆتە وەزیر، کە لە پێش ئەم شۆڕشەی شێخ عوبەیدوڵلادا "وەزیری فەوائید" بووە، بەلام لەبەرئەوەی لە باوەڕپێکراوە زۆر نزیکەکانی دەرباری قاجار و خودی ناسرەدین شا، نزیك و جێی متمانەی تەواو بووە، لەم سەروبەندەدا، لە هەمەدانەوە بەهێزێکی گەورەوە بۆ ناوچەی سابلاغ هێنراوەتەوە؛ تا بەشداریی لە دامرکاندنەوەیدا بکات. بەو سۆنگەیەشەوە کە لە دید و بەرژەوەندی دەرباری قاجارەوە بۆ شۆڕشەکە و بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردی نواڕیوە، بۆیە پشتیوانیی زۆریان کردووە و دواتریش لە سەرکوتکردنی شۆڕشەکەدا، ڕۆڵی زۆر گرنگیان پێ داوە. (بۆ زیاتر زانیاریی، بنواڕنە: حەمەباقی، محەمەد، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا لە بەڵگەنامەی قاجاریدا (١٨٨٠)، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٠، ل ٣٠).(٢٦): قادر ئاغای موکری، یان بە: قادر ئاغای ئیندەرقاش ناوبانگی دەرکردووە. لە هۆزی "دیبۆکری"یە و لە ناو دیبۆکرییەکاندا بەتایەفەی "هەباس ئاغا" ناسراون. هەر لە سەرەتای ئەم شۆڕشەوە ویستوویەتی بێ لایەنیی خۆی بپارێزێ. هەرچەندە بەو هۆیەوە کە خۆی زۆر دۆستی "هەمزاغا" بووە، "ئەمین"، یان "میناغا"ی کوڕی بە(٨٠٠ هەشتسەد) کەسەوە لەگەڵ هەمزاغا و شێخ قادردا بووە. بەلام خۆی تەریك گرتووە و نزیکەی مانگێك دوای هەلایسانی شۆڕشەکە، بە(٣ سێ) کوڕی و (١٠٠ سەد) سوارەوە لە دەوروبەری گوندەکانی خۆی لە موکریان بووە و پاشان لە کۆتایی شەڕی "بناو"دا، کە سەرەتای خاوبوونەوەی دەسەلاتی هێزەکانی

کوردی بۆ دەرکەتووە، خۆی گەیاندۆتە گوندی "جەوانمەرد"ی موڵکی "ئاغا پاشا"ی برازای. بەڵام کە گوندی ناوبراویش داویانەتە پاڵ شۆڕشی کورد، ئەوسا بەیەکجاریی لە کوێستانەکانی "مەراغە" و "سایین قەڵا"وە، خۆی گەیاندۆتە "حەسەنعەلی خانی گەڕووس" و ئیتر بۆ هەمیشە لەگەڵ دەوڵەتدا بووە. (بۆ زیاتر زانیاری، بنوارە: حەمەباقی، محەمەد، ڕاپەڕینی هەمزاغای مەنگوڕ لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، ل ٨٥ و").(٢٧): تەیموور پاشا خان لە کوردانی هۆزی "جەلالی"ی ناوچەکانی "ماکۆ"یە و زۆربەی ئەو هێزەش، کە لە "ماکۆ"وە لەتەکیدابوون، لە هەمان هۆز بوون.(٢٨): مەبەست لە "قەڵا"ی شاری ورمێیە، کە لەو سەردەمەدا هەموو شاری ورمێ لەو قەڵایەوە پارێزگارییان کراوە و هەر شوورەی ئەو قەڵایەش، بەدەوری هەموو شاردا، هەموو شاری لە ئامێز گرتووە.(٢٩): حیشمەتولدەولە "هەمزە میرزا"، مامی ناسرەدین شایە و لەم لەشکرکێشییەدا پلەی سوپاسالاری هەموو هێزەکانی دراوەتێ؛ وەك زانرا بەرلەوەی بگاتە بەرەکانی شەڕی دژی شۆڕشگێڕانی کورد، بەدەم ڕێوە نەخۆش کەوتووە و مردووە؛ یان بەواتەیەکی تر: دڵی تۆقیوە!، کە نموونەی ئەمجۆرە مردنە لەناکاو و پڕ سەیروسەمەرانە، هەر لە کوردستان و لە ناوجەرگەی ڕووداوەکانی شۆڕشی کورددا، ئاوقەی چەندین سەرکردە و گەورە فەرماندەی بەرجەستەی سوپای ئێران بووە، کە ئەوانیش لە ناوچە جیا جیاکانی سەرتاسەری ئێرانەوە، بۆ سەرکوتکردنی ئەم شۆڕشە و تۆقاندنی دانیشتووانی تری بێ لایەنی کوردستان کۆکراونەتەوە، لەوانە: ١- حاجی حسین خانی سەدری ئەعزەم (ی پێشووی ئێران)، کە دوای مردنی حیشمەتولدەولە کراوەتە سوپاسالاری لەشکری ئێران (مانگی ١٨٨١/١١ز). ٢- ئەکبەرخانی سەرتیپی ورمێ (مانگی ١٨٨٠/١٠ز). ٣- ئیقبالدەولەی فەرمانڕەوای ورمێ (مانگی ١٨٨١/٨ز). ئەم پیاوە تووشی نەخۆشییەك بوو، هێدی هێدی جەستەی دەتوایەوە. ٤- عەلائولدەولە "ئەمیر نیزام"، کە لە پاداشی سەرکوتکردنی شۆڕشی کورددا، شمشێرێکی گەوهەرداری لە لایەن ناسرەدین شاوە پێ خەڵات کراوە، لە ڕێوڕەسمێکی شکۆداری سوپاییدا شمشێرە خەڵاتییەکەی لە کەمەر بەستووە و هەر لە گەرمەی ئەم شادی ئاهەنگ گێڕانەدا، لەپڕ حاڵی تێکچووە

و لـه مـاوەی یـەك دوو ڕۆژدا (مـانگی ١١/١٨٨١ز) گیـانی دەرچـووە. ٥- محەمـەد ڕەزا خانی سەرتیپی تۆپخانـە (١١/١٨٨١ز). ٦- خەسـرەو خـانی سـەرتیپ (مـانگی ١١/١٨٨٢ز). ٧- مستەفا خانی هەمەدانی "ئیعتیماد سەڵتەنەی فەرماندەی هێزەکانی ئازەربایجانی خۆرئـاوا (مـانگی ١١/١٨٨١ز). ٨- حـاجی ڕەجـەب عـەلی خـانی ئەفـشار "میرپـەنج"، (مانگی ١٢/١٨٨١ز)" هتد. کـە جۆری مردنـی هـەموو ئەمانـەم، لـە دەقی بەڵگەنامـەی قاجاری و بیرەوەری سەرانی لەشکری ئێران خۆیان دەرهێناون. بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەیـەوە، بنـوارە: حەمـەباقی، محەمـەد، شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوڵڵای نـەهری لـە بەڵگەنامــەی قاجاریــدا. چــاپی موکریــانی، هــەولێر ٢٠٠٠، لاپــەڕەکانی: ٥٣٤، ٥٣٥، ٦١٩).(٣٠): هەوشـار: لـە بناوانـدا "ئەفـشار" بـووە و لـە ناوچـەکانی کوردنـشیندا "هەوشار"یان پێ دەڵێن.(٣١): چەند ئەفسەرێکی ئەوروپایی (نەمـساوی) لـەم هێـزەدا بوون.(٣٢): فەیزوڵڵا بەگ (؟ – ١٨٨٢ز) کوڕە گەورەی ئەوڕەحمان بـەگ بـووە، کـە لـە ناوچەکانی نێوان بۆکان - مەهاباددا نیشتەجێن. ناوبراو بەو هۆیەوە کە منـداڵی زۆر بووە، لە ناو بەگزادەکانی ناوچەکەیدا لە هەموویان لە بەرچاوتر بووە. هەر بۆیە لـە ناو بەگزادەکانـدا وەك تیرەیـەکی جیاواز و تـازە، پێیـان وتـوون: "فـەیزوڵڵا بـەگی". نووسەری ئەرمەنی: ئەسکەندەر غۆریانس، کە دۆستایەتی نزیکی لەگەڵیـدا هـەبووە، دەڵێ: (١٥) پازدە کوڕی هەیە و (١٠٠٠) هەزار سوار و تفەنگچی هەیە. ئەمە نـاوی (٩) کوڕی فەیزوڵڵا بەگن: حاجی محەمـەد، سـاڵح بـەگ، حـاجی محەمـەد حەسـەن بـەگ، شێر بەگ، حاجی سەلیم خانی سەرتیپ (شاعیر بووە)، ئـەمانوڵڵا بـەگ، کەیخوسـرەو بـەگ، عەبـدولرەحمان بـەگ.بنەماڵـەی فـەیزوڵڵا بـەگ خـاوەنی زەویـوزاری زۆر و بەپیتن و نەوەکانیشی زۆربەیان خوێندەوار، ڕووناکبیر، شـاعیر، نووسـەر، وێنـەکێش، مۆسیقازان، دەنگخـۆش، نیـشتمانپەروەرن. (بـۆ زیـاتر زانیـاریی، بنـوارە: حەمـەباقی، محەمەد، شۆڕشی شێخ عوبەیـدوڵڵای نـەهری لـە بەڵگەنامـەی قاجاریـدا، چاپەمەنی موکریــانی، هــەولێر ٢٠٠٠، ل ٩٥٥. هــەروەها: ڕاپــەڕینی هــەمزاغای مــەنگوڕ لــە بەڵگەنامـەی قاجاریـدا، دەسگای ئـاراس، هـەولێر ٢٠٠٢، ل ٤٥).(٣٣): واتـە: هـەموویان ســووتاندن، وەك دواتــر بەشــانازییەوە بــە"شــیعر" باســی دەکــات!.(٣٤): جــاران

"قەرەتەپـە" و ئێـستا "قوڕەبـەراز"یـشی پـێ دەڵـێن.(٣٥): قاشـوق لەسـەر چـەمی "جەغەتوو"، ڕووبەڕووی "زولفیلە" بووە، بەلاّم دوای دروستکردنی بەنداوی بۆكان، لەگـەڵ "گەرمــەك" ژێــر ئــاو كــەوتوون. ئێــستا نزیكــەی نیــو ســەعاتێك لــە "قوڕەبەراز"ەوە دوورە.(٣٦): ئێستا "جەوانمـەرد"، "جامـەرد"یـشی پـێ دەڵێن.(٣٧): مەبەست لە سەیفەدین خـانی كوڕی عـەزیز خـانی سـەرداری بۆكانـە.(٣٨): مەلاّلـەر: گوندێكــە لــە نێــوان "بۆكــان" و "میانــدواو"؛ واتــە: لــە نێــوان "داشــبەند" و "قەرەمووسالی"یانە.(٣٩): قەلاّ: مەبەست لە قەلاّی بۆكانە، كە لـەو كاتـەدا گـەورە و قایم بـووە و ئێـستاش شـوێنەواری مـاوە.(٤٠): غـەدیری خـوم: جێگەیەكـە لـە نێـوان "مەككە" و "مەدینە" و هاوكـات لـە نێـوان دوو مزگـەوتی پێغەمبـەر (د. خ) دایـە و دوو میلێــك لــە "مەحجەفــە"وە دوور دەبــێ و ناویــشی لــە فــەرموودەی حــەزرەتی محەمەدا هاتووە. ئەم جێگەیە لای موسڵمانان بەگشتی و لای شیعەیان بەتایبەتی پلە و پایەیەكی خۆشەویست و تایبەتی هەیە؛ چونكە لە گەڕانەوەی محەمـەد (د. خ) لـە "حجـە الـوداع"دا، لـەو جێگەیـە قۆنـاغی گرتـووە و وتـارێكی گرنگـی خوێندۆتـەوە و تیایدا حەزرەتی "عەلی" بەجێگری خۆی دەستنیشان كـردووە و فەرموویـەتی: "مـن كُنتُ مولاه فهڑا علي مولاه"، ئیتر لەوێوە كۆچی بـۆ "مەدینـە" كـردووە. بـەگوێرەی قسەی "ابـن الاثـیر"، سەرچاوەی ئـاوێكی سـوێریش لـەم جێگەیـە هەیـە. (بـۆ زیـاتر زانیــاریی، بنــوارە: دهخــدا.(٤١): مەبەســت لــە سوپاســالار: مــیرزا حــسین خــان (موشیردەولە)یە.(٤٢) مەبەسـت لـە: هـەمزە مـیرزای مـامی ناسـرەدین شـایە، كـە لـەم شۆڕشەی شێخ عوبەیدوڵڵادا، وەك سوپاسـالاری دەوڵـەتی ئێـران، بـۆ دامركاندنـەوە و سەركوتی شۆڕشگێڕانی كـورد دەستنیـشان كرابـوو، بـەلاّم وەك پێـشتر وتـرا، هـەر لـە سـەرەتای هاتنیـدا بـۆ كوردسـتان، لـە ناوچـەی "بیجـاڕ" مـرد.(٣٤): مەبەسـت لـە: حەسەن عەلی خانی گەڕووسە، كە لە پێش ئەم هاتنەیدا و لەسەر خواستی خۆی بـۆ دامركاندنەوەی شۆڕشی كوردان، وەزیری دارایی بووە و لە ناو دانیشتووانی سابلاّخدا بـە: وەزیـرە چرچـە بـەناوبانگ بـووە.(٤٤): مەبەسـت لـە: كتێبەكـەی "ئەسـكەندەر غۆریانس"ی ئەرمەنییە، كـە ئـەویش یادداشـتی ڕۆژانـەی نـاوبراوە و لایـەنێكی تـری

ڕووداوەکانی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٨٠ز) لە دیدی نەیارێکەوە بۆ "ناسرەدین شا" دەگێڕێتەوە و پوختەیەکیمان لە پاشکۆی کتێبی: شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا لە بەڵگەنامەی قاجاریدا، لاپەڕەکانی (٥٤٩ - ٦٠١)دا بڵاوکردۆتەوە و بەهیواین لە داهاتوویەکی نزیکدا وەك کتێبێکی سەربەخۆ بەچاپی بگەیەنین. بەڵام ئەم کتێبەی "ئەسکەندەر غۆریانس" بەزمانی فارسی نووسراوە و نەبیستراوە بەزمانی فەرەنسایی بێت.

## ملخص البحث

## الكُرد في الوثائق القاجارية

### "ثورة الشيخ عبيدالله النهري: ١٨٨٠"

### ترجمة: محمد حمه باقى

تحتفظ مراكز جمع الوثائق في ايران بأعداد كبيرة من الوثائق المتعلقة بثورة الشيخ عبيدالله النهري، اذ بلغت هذه الثورة مرحلة كبيرة من النضج الثوري من جانب، واهتم بها الكتاب والباحثون الكرد والاجانب من جانب اخر. لما لخطط الشيخ في قيامه واتباعه الاساليب الجديدة لثورته من دور متميز في ذلك الاهتمام.

كان الشعب الكردي بقيادة الشيخ عبيدالله النهري وبدعوته للجهاد يساندون الدولة العثمانية، بينما الارمن كانوا يساندون الروس. ولدى انتهاء الحرب ارادت الدول الاوربية مكافأة الارمن على دعمه لروسيا في الحرب بمنحه الحكم الذاتي في الاراضي التي يقطنها، وعدَت الدولة العثمانية ذلك تدخلاً في شؤنها. وعندما ارادت الانتقام من الارمن لم تجد افضل من ان تحرك الكرد ضدهم لتتخلص من الاثنين معاً.

وتداول الشيخ هذه المستجدات مع وجهاء والرؤساء وتوصلوا الى:

١ـ البدء بالعمل السياسي وتعريف العالم بالشعب الكردي وعدالة قضيته واستطاعة الشعب الكردي ادارة نفسه بنفسه.

٢ـ تأسيس اول منظمة كردية باسم (جمعية الاكراد).

٣ـ البدء بالنضال الثوري والتحرر من الاستعمار العثماني والقاجاري وتأسيس دولة كردستان في الجزأين.

ولتحقيق هذا الغرض بدأت ثورة الشيخ عبيدالله في ايران لتمتد لتحرير كردستان توركيا. وتم خلال فترة وجيزة بقيادة الشيخ عبدالقادر وهمزة آغا منگور تحرير مناطق شاسعة من ايران، مثل شنو، ونغده، وميانداواو، ونصب اشخاصاً لادارة المناطق المحررة بغية تأسيس دولة كردية.

وقاد الشيخ عبيدالله العمليات في منطقة ورمى، وبعد حرب مريرة لم يتمكن الشيخ من تحقيق اهدافه المرجوة من الثورة، واصيبت قواته بنكسة تراجع على اثرها الى منطقة (مەرگەوەر) ثم الى (نهري).

وجمع العجم جيوشه وحشد سكان المناطق المتاخمة مثل مراغه وميانـدواو و ورمي في سرعة كبيرة، ووجه هذه الحشود لقمع الثورة الكردية، فحاربوا الكرد بكل ما اتوا من حقد وكراهية. هذا اضافة الى بذل جهود دبلوماسية حثيثة لحمل روسيا وانكلترا لمساندة القوات الايرانية على تخوم الحدود الايرانية التركية، ولكي تضغط روسيا وانكلترا على تركيا لقمع الثورة من جانبها.

لم تمتد ثورة الشيخ عبيدالله لمناطق اردلان، وكرمانشاه، وهورامان، ولم تعم كردستان ايران، اذ القاجاريون كانوا يعيدون المناطق المحررة الى سلطتهم بسرعة فائقة. بيد ان هذه الثورة احدثت من الناحية السياسية:

١ـ انعطافة جديدة على المستويات السياسية والثقافية والاجتماعية في مسار الحركة التحررية الكردية. اذ من الممكن ان نعَد ثورة الشيخ عبيدالله عصارة آلام لحقت الشعب الكردي في تأريخه القديم، ومن ثم ولدت الاحساس بالظلم والحيف، وهيجَت الشعور للسعي للخروج من سيطرة الاحتلال الاجنبي وسطوة الطامعين في بلادهم.

غير ان عدم تهيىء المناخ الملائم للثورة، وعدم توفر شروط نجاحها حال دون بلوغ الثورة اهدافها المرجوة منها.

٢ـ كان برنامج الشيخ عبيدالله لثورته تحدَياً لمصالح الدول العظمى في المنطقة عن طريق بعث الوعي القومي لا لدى الكرد فقط بل لدى العرب والاقوام الاخرى كي ينهضوا وينتفضوا. مما دفع القوى العظمى للوقوف بوجه الثورة واجهاضها.

٣ـ كانت ثورة الشيخ عبيدالله بعد هوء الوضعي الكردي، جراء اخماد ثورتها المتلاحقة، بمثابة رجَة قوية ايقظت القاجاريين والعثمانيين وجعلتهم يفكرون في امر الكرد واستمالة ذوي النفوذ منهم بالاطماع المادية وغيرها، وهذا ولد بدوره وعيا

عكسيا لدى مفكري الكرد الذين نشطوا لتوعية الجماهير الكردية عبر الوسائل الثقافية من الجرائد والكتب وغيرهما.

٤ـ احبط الشيخ عبيدالله النهري بثورته وحكمته محاولة استخدام الكرد للانتقام من الارمن. لكن القادة العثمانيين افلتوا في تحقيق شيء من هذه المآرب عن طريق الفرسان الحميدية والقوات الاخرى.

ان مبادرة الدبلوماسية للشيخ النهري لفتت انتباه اعداء الكرد ـ والاصدقاء ان وجدوا ـ وجعلتهم يفكرون بجدية في شأن الكرد وثورة الشيخ بالذات، فجمعوا كل مايتعلق بشخصية الشيخ وثورته، وما قيل وكتب حتى الآن يعد بداية معرفة تأريخ لانتفاضة ١٨٨٠ وقائدها. فأصبح ماجمع حول الثورة مصادر قيمة عن الثورة وقائدها تناول الباحثون اجزاء منها على شكل كتب ورسالات، غير ان هذه الوثائق لم تنظم ولم ترتب حسب تسلسل الاحداث مع ان كثيرا من هذه الوثائق لم تر النور حتى الآن ولم تصل الى يد الباحثين.

وهذه الوثائق نوعان:

الوثائق القاجارية المتمثلة في:

١ـ الرسائل والمذكرات والتلغرافات الرسمية المتبادلة بين الجهات ذات العلاقة بالموضوع.

٢ـ الكتب والمذكرات والسير الذاتية للاشخاص والقادة المشاركين في احداث واخماد الانتفاضة.

وكانت هذه الوثائق مبعثرة ومتفرقة بذلت الكثير من الجهد في سبيل جمعها خلال ٨ ـ ٩سنوات لجمعها وتبويبها ومن ثم قراءة نصوصها وترجمتها، ومع ان الوثائق لم تكتب بروح ودية للكرد او حتى الحيادية بل الغالب عليها الطابع العدائي فإنها تلقى اضواء ساطعة على على حقائق كنا نجهلها ولا نجد لها ذكرا في اماكن اخرى.

## Qajarian Documents
## Concerning Kurd
## Ubaidullah Nahris' Revolution1880

### Translated by: Muhemmed Hama Baqi

Iranian centres for documents preserves a lot of documents concerning Shaik A.Nahris' Revolution. For that Revolution went as far as that drew the attention of many Kurd and foreign researchers.

Kurds led by U. N. stood by Utman Empire, while the Arminians aided the Russians, so when the war ended, the Europeans wanted to award the Arminians by granting them autonomy. The Utman Empire considered it an intervention so tried to arouse Kurds against Arminians, by that, it can get rid of both.

Shaik N. met with the leading personalities and concluded to:

1/ to give precedence to political process to a quaint the world with equity of Kurdish cause.

2/ Starting for the first time a Kurdish Organization by the name (Kurdish Assembly).

3/ initiate revolutionary struggle against the Utman Empire and the Qajars in order to establish a united Kurdistan, to achieve that, the revolution started in Iran to liberate the whole Kurdistan, but in Wirme, the force led by himself could not achieve its goals so retreated to Margawar then to Nahri.

The Iranians gathered their forces and brutally attacked the Kurds along with diplomatic efforts to induce Russia and England support the Iranians and make Turkey to crush the revolution.

Although the revolution did not expand to territories such as Ardalan, Kirmanshah, and Hawraman, but it gave rise to:

1/ Political, cultural and social maturity.

2/ National consciousness, not only through Kurds but through other nations also which impelled the big powers to stand against it.

3/ After unceasing suppression of Kurd revolts, it enlighted the Kurdish leaders and intelltuals.

4/ It defeated the efforts to employ Kurds against Arminians.

Shaik Nahris' Revolution drew the enemies and friends attention and made them think deeply about Kurd and their cause, so they tried to collect all that have any connection to Shaikh and his revolution.

What have been compilated is significant but they have not been systematized and some are still unknown to the researchers.

There are tow kinds of documents:

1/ Formal Messages, diaries, telegraphs exchanged between anthorotive personels.

2/ Books, diaries written by those who participated in revolting and suppressing.

These documents have been scattered, so I have tried my best for more than eight years to arrange and classify them and then translated them. Although those documents have been written in an unfriendly way, but they have their significance and shed light on some truths we ignore.

# هۆزانا ئایینی د بەرهەمێ پەرتوییێ[*] هەکاریدا

د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی

## پوختە

هۆزانا ئایینی ئێکە ژ بابەتێن هەرە گرنگ د ئەدەبێ کلاسیکێ کوردیدا. پرانیا هۆزانڤانێن کلاسیکی ئەڤ بابەتە د هۆزانێن خۆدا بکارئانینە. چونکە گوزارشت و دەربرین ژ هەست و هزر و بیرێن وان دکر. بەلێ دگەل هندێدا، ئەڤ بابەتە ژ لایێ ڤەکولەر و شەهرەزادا وەکی پێدڤی گرنگی و پویتە پێ نەهاتیە دان، ژ بەرڤێ چەندێ، ئەڤ بابەت و بیرۆکە من هەلبژارد،تاکورۆناهییێ بەردەمە سەر جۆر و ناڤەروکێن ڤی رەنگێ هۆزانێ لدەف هۆزانڤان پەرتوییێ هەکاریدا و هەمی لایەنێن وێ ب نموونە ڤە بەرچاڤ و خویا بکەم.

<u>پشکا ئێکێ</u>

## پێشەکی

دەمێ ئیسلام ل کزیرتا عەرەبی پەیدابووی، باروکاودانێن نوی هاتنە پێش و گەلەک تیتال و رەوشتێن جاهلی هاتنە پویچکرن و هندەک ژی وەکی خۆ هێلانەڤە و هندەک ژی دەستکاری تێدا کر و وەلێ کرن کو دگەل پرۆگرامێ ئیسلامێدا بگونجێن.

ئێك ژوان گوهرانکاریا هۆزان و هۆزانڤان ڤەگرتن، چونکە دوی سەردەمیدا هۆزان هەریا باوبوو ل گەرم و گوریا خۆ نەکەفتبوو. ئەو بوو تاقمەك ژ هۆزانڤانا ل سەر ڤەهاندنا هۆزانێن خۆ بەردەوام بوون و پەیامداری ب وی توخیبی کر ئەڤێ قورئانا پیرۆز بۆ هۆزانڤانا دیاریکری و بوونە قەلغان و مەتال ژ بو پاراستنا وان بیر و باوەران.

---

[*] دناڤ کوردستانا باشوور و جڤاکا عوسمانیدا ئەڤ پەیڤە (پرتەو Pirtew) و، هندەك جاریش ب شێوێ (پورتەو Purtew) دهێتە بکارئانین.

ئەدەبێ کوردی ژی، نەمازە (هۆزان) کەفتە ژێر ڤێ کارتێکرنێ هەر وەکی هەمی مللەتێن رۆژهەلاتێ، ئەڤێن باوەری ب ئاییێنا ئیسلامێ ئینای. ئەوبوو هەر ل چەرخێن ناڤین دەمێ ئەدەبێ کوردی سەرهلدای بە ئەدەبێ ئاییینی و مەزهەبی و گیانێ سۆفینزمێ دەست پێکر.

ڤێجا ژ بەرڤی چەندێ یا غەریب نینە کو بێژین: ئەدەبی پەرتوییێ هەکاری، ئەدەبەکێ ئیسلامیەیە ژ سەدێ سەد دگەل بیروبۆچوونائیسلامێ دکونجێن و دکەڤیتە رێ. ژ بەر ڤێ ئێکێ من ئەڤ هۆزانڤانە هەلبژارد دا تیشك و رۆناهییێ بەردەمە سەر ژیان و بابەتێن هۆزانا وی ب تایبەتی هۆزانا ئایینی، چونکی هەتانهو بارا پتر ژ خەلکێ مە ئەڤی هۆزانڤانی باش نانیاسن و وەکی پێدڤی ڤەکولین لسەر نەهاتینە کرن.

## کورتییەك ژ ژیاننامە وی

دراستیدا گەلەك تەم و مژ دەربارەی ژیانا هەکاری هەنە، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی دزڤریتەڤە بۆ وان ژێدەرا ئەڤێن بێ بەلگە و دیکۆمێنت بەحسێ ژیان و سەربورا وی کری.

بەلێ دگەل هندێ ژی یاخویایە کو (پەرتو) نازناڤێ هۆزانڤانییە، و ناڤێ وی (مستەفا کورێ عەبدوللا کورێ ئیبراهیم کورێ عیزەدین شێرێ سیێی کورێ شەرەفخان کورێ زەکەریا کورێ زەینەلییە)، رۆژا ژ دایك بوونا وی یادیار نینە، بەلێ باهرا پتر ل سەر ڤێ باوەرێنە، کو ل ( جولەمێرکێ) جهێ میرنشینا وی ژ دایك بوویە ل نیڤا دووێ ژ سەدێ دوانزدێ کوچی، و رەنگە هەر ل جولەمێرگێ ژی چوو بیتە بەر دلۆڤانیا خودێ)[1]

بەلێ دگەل ڤێ چەندێ دبینین هندەك ژێدەر پتر رۆناهییێ بەردەنە سەر ژیانا وی، وەسا ل قەلەم ددەن کو"ناڤبری ـ پەرتوییێ هەکاری ل سالا (١١٧٠) کوچی بەرامبەر (١٧٥٦ز)یێ هاتیە سەر دونیاییێ ئەوژی ژڤێ هۆزانا خوارێ دیارە:ـ

دڤیٚ بەیتێدا تشتیٚ گرنگ ئەوە (١١ و ٧٠)یٚ دەمیٚ پێکڤە بهێنە نڤیسین دبیتە (١١٧٠) کو ئەڤ ژمارەیە سالا ژ دایك بوونا وی دیار دبیت) [٢].

مێژوویا چوونا بـەر دلۆڤانیـا خـودیٚ یـا پـەرتوییٚ هـەکاری دەسـت نیـشان کریـە کـو هۆزانڤان هەتا پشتی سالا ١٢٢٥ك بەرامبەر ١٨١٠ز مایە. دیسان پڕانیـا ژێـدەرێن ئامـاژە بۆ هەکاری کری وەسا خویا دکـەن کـو (مرنـا وی د کەڤیتـە بـەری سـالا ١٨٣٤ن)[٣] ئـەڤ چەندە ژی وەسا دیاردکەت کو ناڤبری هەتا نێزێکی ویٚ سالیٚ ژی ژیایە و مایە.

هەژی گوتنێیە کو، د سەریٚ سەدیٚ نازدیٚ دیوانەکا ((دروست ب سـەروبەر و شـەنگ، پڕ رەنگ و قەشەنگ ل سەرێز و رەوشتێت هۆزانڤانێت کەڤن بێت بەریخونڤیسیێیە، کـو ژرێڤە ناڤیٚ خودیٚ و پێغەمبەرا ئینایە وەکی هۆزانڤانێن ژ خودی تـرس و سـوفی، ئـانکو هەلبەست پیٚ ڤەهاندینە پاشی ب پێترین جورێت هوزانیٚ هەلبەسـت ل دوی ئـەلیف بـیٚ یا عەرەبی و ل سەر زانستیٚ عەروزا عەرەبی، وەکی دەریا درێژ و کـورت. پێـنج مـالکی، چار مالکی و جوریٚ ب ناڤیٚ (مـستزاد) ب نـاڤ دکـەن هـۆزان ڤەهاندینـە))[٤]. هەروەسـا هۆزانێن خۆ لدویڤ کێشا عەروزا عەرەبی دانانە و چاڤلێکەریٚ جزیری بوو دوی باریدا.

## پێناسا هۆزانا ئایینی

هەروەکو یاخویایە، هۆزان لایەنەکیٚ بلند و بەرزە دناڤ لایەنێن دیـێن ئەدەبیـدا، وەکـو چیرۆك، رۆمان، شانۆگەری ... هتد هۆزان ژی ژهەمی بەرهەمێن دیێن ئەدەبی کەڤنترە و پتر ژ هەمیان ژی رۆلی خۆ دنـاڤ مللـەت و کۆمەلگـەهێن مروڤایەتیێدا دیتییـە، هۆزانـا ئایینی ژی هەر لدەستپێکا هـەبوونا مرۆڤـی لـسەر ڤـی گـویٚ زەمـین پەیدابوویـە. لـەوما پێناسا ڤیٚ جۆرە هۆزانیٚ هەر دکەڤندا ئاماژە پیٚ هاتیە کرن و هەر مللەتەکی لدویڤ وان بیر و باوەرێن وان باوەری پـیٚ ئینـای، پێناسـە کریـە، بـەلیٚ مەبەسـتا مـە دڤێـرەدا ئـەو هۆزانێن ئایینینە ئەڤێن راستەوخۆ گوزارشت ژ هزر و بیرێـن ئیـسلامەتییٚ دکـەن و لپـەی

وێ چەندێ پێناسە بکەین و بێژین ئەو هۆزانن، کو ناڤەرۆکێ وێ یاگرێدای بیت ب بابەتەکی ژ بابەتێن ئاییندیڤە. کو پەسنا خودێ و پێغەمبەری (س.خ) بکەت، یان بەحسێ جوانیا خودێ دکەت و هەر تشتەکێ جوانیا وی کارتێکرن لێ کری. هەروەسا پەسنا بەحەشت و دۆزەخێ تێدا بهێت و شیرەتێن ئایینی ژی بخۆڤە بگریت و بەحسێ گەلەك تشتێن دیێن پەرستن و باوەری پێ ئینانێ بکەت.

## هەڤپشکی دناڤبەرا ئایین و هۆزانێدا

نابیت وێ چەندێ ژبیر بکەین، کو هۆزان ب گشتی خودیکا سەردەمێ خۆیە و چ دناڤ جڤاکێدا دقەومیت ژ رییێ ڤێ خودیکێڤە رەنگددەتەڤە. لسەر ڤی بنیادی ئایین ژی وەکی بابەتەکێ سەرەکی کو رۆلێ خۆ دناڤ جڤاکێدا ژ هەمی لایەکیڤە ددیت و ب ئەگەرا هزر و بیرێن ئایینی گەلەك گوهرینێن مەزن کەفتنە د شێوازێ ژیان و رەوشتێن خەلکێدا، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرا هندێ ((کو هۆزانا ئایینی ل هەمی سەردەمەکی ژ سەردەمێن ئیسلامێدا ( سەردەمێ پێغەمبەری, راشدین، ئەمەوی، عەباسی) وێنێ گەلەك رویدانێن گرنگ کێشابوویە و لدویڤ پێچێ بوونا خۆ تومار کرینە، هەر ژ بەر هندێیە کو د ئەدەبێ عەرەبی و فارسی و کوردی ... هتد بێدەرەکا مەزن ژوێ جۆرە هۆزانێ بەرچاڤ دکەڤیت و ڤەکولەر سوود و مفای ژێ دبینن).(٥)

ژ تشتێن باوەری پێکری و خویایە د مەیدانا رەخنا ئەدەبیدا کو پێوەندییەکا موکم ((دناڤبەرا هەر ئەدیبەکی و نڤیسنیا ویدا هەیە. لەو دبێژن: (ئەدەب خۆ دیکا خودانێ خۆیە، و ئەگەر ئەدەب خۆدیکا خودانی بیت، خودان (ئەدیب) خۆدیکا وی چاخییە یێ تێدا دژیت، بەرکو تەعبیرێ ژ واقعێ خۆددەت، و کارتێکرنا ڤی واقعی ژی دگیان و دل و هندرێ ویدا بەرچاڤ و ئاشکرا دبیت))(٦).

هەروەکو خەلك هەمی دزانن کو ئایین مرۆڤان هشیار دکەن، کو خودێ تاك و تەنیا بپەرێسن و رێکێن راست و دروست بگرنە بەر و شول و کارێن باش و چاك ئەنجام بدەن، و خۆ لادەن و ڤەدەرکەن ژهەمی کار و کریارەکا بەد و بەدرەوشت و خودێ بنیاسن و باوەری ب هەمی تشتا هەبیت ئەڤێت خودێ و پێغەمبەری (س.خ) لسەر خەلکی

فەرزکرین ژ پێخەمەت هندێ کو، ب بەحەشتا خودێ بۆ وان بەرهەڤکری شادبن، ئەڤ تەشریعێن پیرۆز ئەڤێن ئیسلام پێ هاتیە خوارێ و لسەر مللەتان هاتینە بەلاڤکرن. بەرامبەر ڤان هەمی ئیجابیاتێن ئیسلامێ، هۆزان و هۆزانڤان نەشان دەست وەستان راوەستن و پشتا خۆ ب دەنە پیرۆزترین بهالجەم مرۆڤی ئەوژی ئایینە و وەکی تشتەکێ چارەنووس ملا نەدەنە بەرو و ژ هەمی لایەکیڤە وێ رۆناهیا نورانی دهۆزانێن خۆدا بەلاڤ نەکەن. ئێدی ئەڤ پێوەندییە دناڤبەرا ئایین و هۆزانێدا، پێوەندییەکا موکوم و بهێزە ب هیچ شێوەیەکی ژ ئێك و دوو ناهێنە بزداندن و ڤەقەتاندن. چونکە بەحسێ پیرۆزترین بیروباوەر و هەست و نەستا مرۆڤی دکەن بەرامبەر وان تشتێن روحانی یێن بووینە پارچەکا سەرەکی ژ هەلس و کەوت و رەفتارێن ویدا.

## پشکا دووێ

## بابەتێن ئایینی د هۆزانا هەکاریدا

هەر ژ دەسپێکا مێژووا ئەدەبێ کوردی هەتا دەسپێکا جەنگێ جیهانی ئێکێ، شیعرێن شاعیرێن کورد پشکەکا گرنگ بریتی بوون ژ هندك شیعرێن لاهوت و تەسووف و ستایشا ئایینی دگەل پشکەکا دی ژ پەند و ئامۆژگارێن ئایینی وییێن ئەڤینی و دلداری و جوانیا سروشتی.

ئەگەر بچاڤێ سەرێ تەماشای دیوانا پەرتوییێ هەکاری بکەین، دێ بۆمە خویا بیت، کو ناڤبری سەر ل رێچا جزیری د ڤەهاندنا هۆزانادا چوویە. لسەر ڤی بناغەی ئەگەر سەحکەینە دیوانا پەرتوییێ هەکاری دێ بینین وەکی هەمی شاعرێن کلاسیکی بناڤێ خودێ ئینان (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ دکەت و ئەڤە نیشانا هندێیە کو هەر لدەسپێکا ڤەهاندنا هۆزانا بابەتێن ئایینی سەر ژهەمی بابەتێن دی ستاندییە و ئەم دشێین وێ چەندێ رۆهن کەین، کو سێ پشکێن هۆزانێن وی ئەڤێن د دیواناویدا هاتین، هەمی لسەر ئایینا ئیسلامێنە، چونکە مرۆڤەکێ دیندار بوو ژ مالباتەکا بەرنیاس و هەژی بوو ل دەڤەرا هەکاریادا. ئەڤ چەندە ژی ب تێروتەسەلی دێ ئاماژە بۆ هێنەکرن دەمێ بابەتێن ئایینی لجەم ویدا بەرچاڤ و شرۆڤە دکەین:-

***أ ـ هۆزانێن باوەرئینانێ (العقائد):***

مێــژوویا پەیــدابوونا هــۆزانێن باوەرئینــانێ د زڤریتەڤــە وی ســەردەمی، وەختــێ هۆزانڤــانێن پەیامــدار هەســت کــری کــو پێدڤییــە بــەرەڤانی و بــەرگریێ ژ بیروبــاوەرێن ئیـسلامێ بکـەن و هـزر و بیرێـن جـاهلی ئـەڤێن دنـاڤ خەلکێـدا لـسەردەمێ پەیـدابوونا ئیـسلامێ ل کزیرتـا عەرەبیـدا بـەلاڤ بـبن، بەرامبـەری راوەسـتن و وان هـزروبیرێن کـەڤن ئەڤێن دگەل ئایینا ئیسلاما پیرۆز نەگونجێن د هۆزانێن خۆدا بەحس بکەن و پویچ بکەن. پێغەمبــەر ژی هانــا هۆزانڤانــا ددا و ژ ڤــی لایڤــە فەرموویــە ((المــؤمن یجاهــد بــسیفە و لسانە))[٧].

بێگومان ڤی رەنگێ هۆزانێ گورانکاری ئێخستە د جیهانا هۆزانا مللـەتێن موسـلمان و قەبارەکێ مەزن د بەرهەمێن گەلەك هۆزانڤانێن کوردا ڤـەگرت. کـو ئێـك ژوانـا پـەرتوییێ هەکاری بوو. کو دەست بۆ هۆزانا ئایینی برییە و دوی بیاڤیدا دەست رەنگینی نواندییـە و پشتی ئەم بدیوانا ویدا چووینە خوارێ ئەڤ بابەت و مژارێن ئایینی یێن خوارێ د دیوانـا ویدا پێش چاڤ دکەڤن و پارڤە دکەینە سەرڤان جۆرێن دیار کری.

١ـ هۆزانێن یەزدانان (الاهیات)

ئەڤ جۆرە هۆزانە د بەرهەمێن هەکاریدا پانتایەکا مەزن ڤەگرتییە، چونکە ئـەڤ بابەتـە گەلەکێ بەرفرەهە و گەلەك مژارا بخۆڤە دگریت و ژ ڤان تشتان خەبەر ددەن.

أـ خودێ خودێ

مەبەستا سەرەکی دڤان جۆرە هۆزانـادا ئـەوە، کـو هۆزانڤـان ئێکسەر بەحـسێ ذاتـێ خودێ بکەت، و ئامـاژێ ب وێ چـەندێ دکـەت ژ بـو نیـشاندانا خۆیاتیـا خـودێ مـەزن د هەبوونێدا. پەرتوی ژی ئەڤ بابەتە بەرچاڤ وەرگرتییە و د چـەند پارچـە هۆزانـەکادا، وێ چەندێ ب ئاشکرایی بەحس دکەت. پەرتو دڤێ پارچە هۆزانا خوارێدا، وێ چـەندێ دیـار دکەت، کو خودێ تەعالا ئەو بتنێ هەیە، یێ بێ هـەڤال و بـێ شـەریك و بـێ بەڤلـە، ئـەو نهێنییێن هەر تشەکی دزانیت و ددەستێ ویدانە. واتە چ تشت وەکی وی نینـە و ناگەهنـە ئاستێ وی.

(الا) ئـــــەی پادشــــــاهێ فــــــەردێ واحــــــد
ژ هـەمتــــــاو و شـــــریکانی مـــــــه بـــــــەڕا
تـــــــویی عـــــالم ب ســـــڕا ســـــڕێ ســـــڕان
ب رازی راز راری راز بـیـنـــــــــــــــــــــا[٨]

دویر نینە ژێدەرێ ڤێ هۆزانا وی ژ ئایەتا "قل هـو الله احـد" هاتبیتـە وەرگـرتن. دیـسان مەبەستا پـەرتوی ئەوە کو نابیت مرۆڤ بۆ خودێ تعـالا هـەڤال و شـریکا دروسـت بکـەت. چونکە ئەڤ چەندە دویر کەفتنە ژ ئایینا ئیسلامێ و هندیکە شرکیشە کارەکێ مـەرفوزەد ئایینا ئیسلامێدا.

## ب ـ سیفەتەکانی خودێ

مەبەست ژ ڤان جۆرە هۆزانـا ئـەوە کـو بـەحس و نـاڤ ئینانـا (نـاڤێن خـودێ) بکـەن، گەلـەك جـارا گوزارشـت ل سـیفاتێن خـودێ ژی دکـەن. لـەوما هەسـت دکـەین کـو هـەڤ پشکیەك دناڤ هەردوو بابەتادا هەیە، چونکە د راستیدا "چ تـشت وەکـی وی نینـە دگـەل هندێ ئەو کۆمکەرێ هەمی پەسنانە کـودوی ب تنێـدا هەنـە"[٩] هـەروەکو دڤـێ نموونـا ژێریدا خویا دبیت.

ئـــــــەی خـــــــالقێ ئـــــــەرد و ئاسمانـــــــان
ئـــــــەی راحمـــــــێ پیـرونـــــــو جوانـــــــان
ئـــــــەی رازقـــــــێ مؤمنـــــــان و کـــــــافر
حوســـــــناتە ت جوملـــــــە یـــــــان بـــــــاهر
گـــــــەر ئـــــــنس و ئەجنـــــــە و نـــــــەباتات
ز بـــــــروح طیـــــــور یـــــــا جـــــــەمادات
یەکـــــسەر هـــــەمی مـــــەظهـــــەرێ صـــــفاتن

مرئـــــاتی صـــــفات پـــــاکی ذاتـــــن [10]

ئەگەر ب هویری دڤێ هۆزانێدامێز بکەین، بۆ مە ئەو چەندە دێ دیار بیت، کو خودێ خالقێ ئەرد و ئاسمان و هەمی تشتێن دناڤ دا هەین. هەر ئەوە رەحم و دلوڤانییێ ب پیر و کال و گەنج و لاوان دبەت. ئەوە رازقێ هەمی کەسەکییە د جیهانێدا. جوانی و رندیاوی دوان هەمیاندا هەیە. هەروەسا هندی مرۆڤ و ئەجنە و داروبار و گیاندار و تەیر و تەوال و بێ گیان. ئەڤ تشتە هەمی نیشاندەرێن سیفاتێن خودێنە. چونکە سیفاتێن خودێ دڤێت د بوونەوەردا دەربکەڤن.

**پ - کریارێن خودێ**

ئەڤ رەنگێ هۆزانێ گەلەك لایەنا بخۆڤە دگریت، چونکە هەروەکی یا زانایە کو خودێ وی کاری دکەت ئەوێ وی بڤێت، هەمی تشتەك لسەر روییێ عەردی و ل ئاسمانا و دبنێ دەریادا، هەمی ب فەرمان و ئەمرێ خودێ لکارن و کار دکەن. هەروەکو دڤێ نموونا ژێریدا ئەڤ چەندە دیار دبیت.

ئـــــەڤ خرگـــــە ئاسمـــــان بـــــالا
ئـــــەڤ أنجـــــم و کەوکـــــەبێت موجـــــەلا
ئـــــەڤ ســـــەبعێ ســـــەیارە رۆژ و مـــــەهتاب
ئـــــەڤ گـــــەردش و چـــــەرخ و شـــــبتی لـــــولاب
بـــــەحر و چـــــەم و روبـــــار و کـــــانی
بـــــێ ســـــکنە مـــــرورن ئـــــەو زەمـــــانی
بالجملـــــە ب ئـــــەمرێ تـــــە ل کـــــارن [11]

دڤێرەدا چاڤ ل خانی کرییە، بتایبەتی د پێشەکیا (مەم و زین)ێ دا.

**ت - ناڤێن خودێ**

لە چەند دێرەکادا پەرتو هندەك ژ ناڤێن خودێ پەروەردگار نیشان ددەت. ئاماژێ بۆ هندێ دکەت. کو خودێ (دلوڤانە و بەخشندەیە، لێبوردەیە، پەناهە، دلۆڤانە، کەریمە،

لەتیفە، پارێزگارە، غەففارە، کەسە بۆ بێ کەسان، مالکێ هەردوو دنیایە،... هتد) ئەگەر ئەڤ چەندە لدەڤ نەبیت مادێ بەند و ئینسانێ گونەهکار چ دەستدا هەیە. ئەگەر تو ب رەحم و دلوڤانیا خۆ رەفتارێ دگەل گونەهـ و خراپێن وی نەکەی

ژ بـــو ئـــەهلێ گونـــەهـ تـــو خـــۆش رەحمیـــی
ژ بـــــو حـــــال ت بـــــە تـــــو خـــــۆش کـــــەریمی
رەحمـــــا تەیـــــە ســـــەبقی یـــــا عقـــــابێ
لوطفـــــا تەیـــــە مـــــەعفی عـــــەزابێ
ب رەحماتـــــە گوناهکـــــارێ ســـــەرخۆش
ب عـــــەفوا تـــــە وە نامـــــەئێ دکـــــەت رەش
شـــــەرمندە و نـــــادم ژ عـــــصیان
هاتیمـــــە دەرێ تـــــە پـــــڕ پەشـــــیمان
ئـــــەی پادشـــــەهێ کـــــەریم و (ســـــتارّ)
ئـــــەی راحـــــم و ذو الجـــــلال غفّـــــار
ئـــەی تـــویی کـــەس بـــو بێکـــەس و غـــەریبان[١٢]

خودێ پەروەردکار تۆ ژ بوو مروڤ و ئینسانێ گونەهکار خۆش دلوڤانی، واتە تۆ ب دلوڤانیا خۆ گونەهێن خراپکاران ژێ دبەی هەر دلوڤانیا تە دهێتە پێش بەری دەست ب سزادان و حیسابێ بکەی، ئەڤە ژی ئاماژەیە بۆ وێ ئایەتا پیرۆز (و رحمتی وسعت کل شيء)[١٣].

هەروەسا نەرم نیانیاتەیە ئینسانان ژ ئاگرێ دۆزەخێ و عەزابا قەبری ددەتە پاش. ب بەزەیی و دلوڤانیا خۆ گونەهکارێ سەربەخۆش و پڕ گونەهـ پەیام و نامەیا وی یارەش ژ گوتەها دێ ژ بوویت و بۆ سپی کەتن. ئەز واتە پەرتو دڤێرە دا ئاماژێ بخۆ دکەت، کو پەشیمان و شەرمنم ژوان کریارێن من ئەنجامداین من خۆ هاڤێتیە بەردەرێ تە دلێ شکەستی و پەشیمانم تۆ ئەی خودێ پەروەردکار کەریمی و ستاری ئەی دلۆڤانێ

شکومەند و غەففار. هەر تۆی خودان و هەر د هەمان پارچا هۆزانێدا، پەرتو پتر ناڤ و سیفاتێن خودێ پەروەردکار رۆهن و خویا دکەت. دەمێ دبێژیت:-

تـــویی پـــشت و پـــەناهێ بـــێ پـــەناهان
تــــویی (مبـــــیض) رویــــی روســـــیاهان
نیــــنن مــــە ژ قـــــەنجیان چـــو اعمـــــال
ســــەر تــــا ب قـــــەدەم قەباحــــەت ئــــەفعال
لوطفـــا تــــە ل مـــە گـــەر نـــەکت عنایـــەت
نیــــنن مــــەجوابا یـــــەك جنایـــــەت[١٤]

ژ لایەکێ دیڤە پەرتو جەختێ لسەر هندێ دکەت، کو د دەسپێکا هەر نڤیسینەکێدا پێدڤییە مرۆڤ، ب ناڤێ خودێ دەست پێ بکەت. چونکە بکارئینانا ناڤێ خودێ، دبێتە ئەگەرا هندێ کو کلیلێن هەمی دەرگەهێن ئەرد و ئاسمان ل پێشیا مرۆڤی ڤەبن هەروەکو دبێژیت:

سەر لەوحێ دیوانا ئەزەل ئـەول چـییە اسمـێ خـودا
فەرزە کو ئەم هەر صەفحەکێ ناڤێ خودێ کـین ابتـدا
ئەو أسمێ زیبا صـەفحەیان ئارایـشیا هـەر نوسـخەیان
فەتحا کلیدا دەرگەیان ب وی قائمن ئەرد و سـەما [١٥]

د هۆزانەکا دیدا پەرتو بەردەوام دبیت ل سەر وی هەلویستی و دهێتە سەر هنـدێ کـو هەر تـشتەکێ کـو بنـاڤێ خـوێ مـەزن دەسـت پێـك نەکـەت. بـێ گومـان ئـەو تـشت دێ کارەکێ سەقەت و پڕ کێما سیبیت. ئەڤە ژی ئاماژێ بۆ فەرموودەکا پێغەمبەری دکـەت، دەما دبێژیت "کل امر ذي بال لم يبدأ باسم الله فهو آبتر" [١٦] هەروەکو ئەڤ چـەندە دڤـێ هۆزانێدا خویا دبیت.

(ســـــەر نامـــــەئی فــــتح ایـــن مناجـــات)
چــــێکر مــــە ژ بــــو قــــەضــــایی حاجــــات
دیباجـــــــــە ب نــــــــــاڤێ اسمـــــــــێ الله
و انـــــی مــــەژ بــــو رجــــائی (دلخــــواه) [١٧]

ژ بلی ڤان ناڤێن مە ئاماژە پێکری، خودێ پەروەردگار گەلەك ناڤێن دی هەنە. کو دبێژنێ ( اسماء الحسنی) کو ژمارا وان (٩٩) ناڤن، مە هندەك ژێ بەحس کرن.

**ج - پارانەوە**

وەکو داب و نەریتێك، هەمی هۆزانڤانێن کلاسیکی، ئەڤێت بابەتێن ئایینی د بەرهەمێن خودا بەحس کرین. ژ خودێ پەروەردگار و بێ هەڤال د پارێنەڤە و داخازا لێبورین و بەخشینێ ژێ دکەن هەروەکو دڤی هۆزانێدا هاتی:-

یارەب ژ غەیری شوك کینە بێ حەد و بێ حسێب
ئینانــــــە پرتــــویی ب دەرێ (بــــاب کبریـــــا)
یــارەب نــە ب ئــەمر و ب نەصــا کــەلامێ تــە
ت بخـــشی ژ غـــەیری شـــرك گناهـــان و حرمهـــا
ئینایــە چ مــە فعــل و عەمــەل جملــە حاضــرن
قـــەولێ کـــریم لـــوطفی ئـــیلاه بکـــە عـــەطـــا[١٨]

بڤێ چەندێ بۆ مە خویا دبیت، کو پەرتو پڕ گونەه و گونەهکار هەنە. لەوما دکەڤیتە لاڤەلاڤ و داخازێ ژ خودێ مەزن دکەت. کو ل وی نەگریت و بهێتە عەفو کرن ژ هەر گونەه و تاوانەکا کری. ژ بلی هندێ ئەگەر هەڤال و هەپشك ژ بۆ خودێ دانا بن. لەوما ب دلوڤانی و بەزەیا خۆ کەی. تۆ لدویڤ کار و کریارێن مە دگەل مەدا نەکەی، بەلکی تو "انك عفو تحب العفو فعفو عني"[١٩] دیسان د کوپلەکا دیدا. وێ چەندێ خویا دکەت، کو

خودێ وان ژ هەر پیساتیەك و تاوانەكا كری. كو ئەو ب ئاڤا رەحمەتێ بێهنە شوشتن. هەروەسا وێ چەندێ دبێژیت. یا خودێ تۆ ب رەحم و دلوڤانیا خۆكەی. ئەو گونەهێن پەرتوی كرین و ئەنجامداین. هەمیان بۆ ژێ بەیوو لێ نەگری و ژێ بهێتە پاقژكرن.

یـــــارەب مــــە ژ (لـــــوث جــــورم زەحمــــەت)

یەكـــــسەر تــــو بـــــشو ب ئاڤـــــا رەحمــــەت

یـــــــارەب گونـــــــەهان مـــــــەگر ل پــــــەرتو

رەحمـــا خــــوە ل حـــالێ وی كـــە پـــــەرتو[٢٠]

ل چەند چوار مالكەیەكادا، پەرتو دكەڤیتە لاڤەلاڤێ و داخاز و هیڤیێ ژ خودێ مەزن دكەت. كو وی عەفو بكەت ئاماژێ ب هندێ دكەت، كو یاخودێ ل هەمی وەخت و دەمەكیدا هەر تو هیڤی و داخازا داخازكارا بجهـ دئینی، یا خودێ ژناڤ ئەڤیندارادا هەر تو ئەڤینداری منی و بەس. رۆژا خێر و شەرێت هەمی مرۆڤان دكێشی و دیار دكەی. من وێ رۆژێ عەفو بكە و توبكریار و كردەوێن من دگەل مندا نكە، چونكە ئەز دزانم بارێ من ژ گونەهـ و كریارێن خراپ پڕن، لەوما داخازا هندێ دكەم، كو وێ پرسیارێ ئاراستەی من نەكەی و نەبێژی پەرتو چ كەس و مرۆڤەكە هەروەكو دبێژیت:ـ

یـــارەب ت هـــەمی دەمـــان تـــو فریـــاد رەســـی

تــــەنها ژ ئـــــەڤینان هــــەر مـــن تـــویی بەســـی

رۆژا كــو بكێــشی خێـــر و شـــەڕا جملـــە ب هـــەڤ

مـــن عـــەفو بكـــە نەبێـــژە پـــەرتو چ كەســـی [٢١]

هەر د چوارینەكا دیدا پەرتو داخازێ ژ خودێ دكـەتن، كـو ب حـەقێ نـاڤێ زاتـێ خـو دەمێ روح و گیان ژ قالبێ من دهێتە كێشان، وێ هێزێ بدە من كو دەڤ و دل و عـەقل و زمانێ من هەمی پێكڤە، بشێن بێژن گوتنا "لااله الا الله". چـونكە یاخویایـە هـەر كەسـێ دوماهیی ئاخڤتنا وی، ئەڤا سەرێ بیت و بـەری روح ژێ بهێتـە كێـشان. موحەقـەق ئـەو

کەس دێ ژ هەمی گونەهان هێتە عەفو کرن و دێ ب بەحشەتا خودێ بۆ موسلمانا دانای شادبیت، هەروەکو دبێژیت:ـ

یـارەب تـو ب حـەقێ اسمـێ زاتـێ تـە ئـیلاه
گاڤـا ت کـتن نـەزعێ ل مـن حـالێ تـەباه
تـەوفیقێ بـدە دەڤ و دل و عـەقل زبـان
نوطقـام ببیتـە "لاالـە الاّ الله"(٢٢)

یا هەژی گوتنێیە گەلەك نموونە ژڤـی بابـەتی و بابـەتێن بـەری وی دنـاڤ دیوانـا ویـدا دەست دکەڤن، بەلێ مە ئاماژە ب هندەك نموونەیێن کێم کر، داکو بابەت درێژ نەبیت.

**ب ـ هۆزانێن باوەرێن گشتی**

ئەڤ جـۆرە هۆزانـە، گەلـەك دنـاڤ هـۆزانێن ویـدا رەنـگ ڤەداینـە، چـونکی دەربرینـێ ژ بیروباوەرێن موسلمانێن سونی دکەت، و پەرتو گەلەك داخبار بوویـە ب بـاوەرێن گـشتی. پەرتو د پارچەکا هۆزانێدا، ئاماژە ب ئەحکامێن ئیسلامێ دکـەت و کارتێکرنـا وان لـسەر بەشەر و مرۆڤان، چاك و باشان، خراب و موشرکان دکەت. هەروەسا لـسەر شـوینەوارێن پەرسـتنێن کـەڤن یـێن بـەری ئیـسلامەتیێ دئاخڤیـت و ئـەوێ خویـا دکـەت کـو پـشتی ئیسلامەتی هاتی و بەرقەرار بووی، ئێدی پەیکەرێن بت و سەنەما ژ ناڤـچوون و نەشـیان خۆ راکرن بەرامبەر بوونا ئیسلامەتیێ، هەر چەندە گومـانرا و کـافرا هـەول و بـزاڤێن زۆر کرن، کو وان شوینەوارێن خۆبپارێزن، بەلێ رەنج و کەدا وان سەر نەگرت. هەروەکو دڤـێ نموونێدا ئەو چەندە دیارکری.

(احکـام) و (وعـظ) و (ضـرب) و مثـل فقـە و دوعـا
عالـەم هـەمی ت حـەیرت و عالـەم (تعجـز)
کـافر هـەمی ت مـرن و ت (مـشرك) هـەمی (عنـا)

بت و (صنم) (تكسر) و پوڕ هەمن هـەمی ژ غیرەتـیێ [٢٣]

هەرد هەمان پارچێدا پەرتو جوداهی و جیاوازی دناڤبـەرا موسـلمان و سەرداچـوویی و کافراندا پێش چاڤ دکەتن، نەخاسمە پشتی پشتا کـافران هاتیـە شـکاندن و دل رەقـی و کـەرب و کینـاوان بەرامبـەر ئیـسلامەتییێ سـەرنەگرتی، ئێـدی رێکـا زولم و زۆرداریـێ و قرکرنێ نەما و موسلمان کەفتنە د قوناغەکا راست و دروسـتدا و سوپاسـی و پارانەڤـە و حەمد و ثـەنا د گۆتن. چونکی باوەریا وان ب ئایینا ئیسلامەتییێ ب هێز و موکوم ببوو.

دل رەش سـسـیاه روت طـــەریقا (ظلـــم و فنـــا)
صادق هەمی ت شوکر و ثـــەنا خـوان و حەمـد گـو
طـــالبێ (تعـــزم) و رەغبـــەت و مـــەرغوب ئاشـــنا
(انــصار مەســت شــوق مهــاجر ژ زوق مــست)[٢٤]

د کوپلەکا دیدا پەرتو داخوازێ ژ باری تعالا دکەت، کو ب حەقیێ شەریعەت و یاسـاییێن پاك و خاوێن یێن وی بو هەمی مرۆڤان هنارتین. وی ب پارێزیـت و قورتـال بکـەت ژ هـەر گومان و سەرداچوونەکێ. چونکە هندیکە دەروون و هنـاڤن سـەرگەردان و مەسـتن دڤـیێ دنێـدا و شــەیتان ژی پــشتەڤان و پــشکدارێ وانــە کــو ســەردابیەن و نــەهێلن راســتیا باوەرئینانێ دناڤدا جهێ خۆ بکـەن، ئەڤـەژی ئاماژەیـە بـۆ وێ ئایـەتا پـیرۆز (أن الـنفس لأمارة بالسوء) [٢٥] لەوما داخوازا خۆ بلند دکەت کو خودێ مەزن هاریکاریا وی بکەت کو ژهەر دوو بەدەنا (دل وهناڤ) و دگەل هەبوونا شەیتانێ خراپکار بپارێزیت و ئێدی دەلیڤە بو وان نەهێتە رەخساندن، کو هزر و بیرێـن وی یـێن ئیـسلامەتییێ سـست و خـاڤ بکـەن. چونکە ئەگەر ب هاریکاریا وی نەبیت، بەندێ رەبەن و ژار ما چ ددەستدا هەیە، بەرامبەر هەردوو تشتا راوەستیت کو هەمی موسلمان پێڤە موبتەلا بووینە.

یــارەب ب حـــەقی شـــرع و قـــوانینی پـــاکی وی
پـــەرتو نـــەگێرە ضـــال ژوی (ســـوی) بدعەتـــە
لـەورا کـو نـەفس (سرکـشە) شـەیطـان شـریك وی
هـــەر دو بـــەدەن (خبیـــث) و فەســـادی جبلەتـــە
توفیـــق یـــــارەبی ژ دائـــــم دکـــــەم رجـــــا
بـــێ تـــەنهن مـــە طـــاقـــەت ویـــا حـــول و قووەتـــە
دائـم ژ دەسـتێ وان دو خـەبیثـا ب رۆژ و شـەڤ [٢٦]

د هندەك هۆزانێن دیدا پەرتو وەك باوەری پێ ئینانەکا موکوم ب ئایینا ئیسلامێ، وێ چەندێ دیار دکەت، کو پێدڤییە سەر مرۆڤێ موسلمان سـەبر و هـەدارێ سـەر رویـدانا و ئارێشا بکەت و خـۆ ژوێ نیعمـەتێ بـێ بـەهر نەکـەت، ئـەڤا خـودێ مـەزن بـۆ موسـلمانا دەستنیشانکری. چونکە هندیکە بەرگـە گـرتن و خـۆ راگرتنـە بەرامبـەر دەسـت و دارێ دنیـایێ، بـەرێ وێ گەلـەکێ جـوان و سـوود بەخـشە، بـۆ هـەر کەسـەکێ موسـلمان یـێ پێگیریێ پێ بکەت و لدویڤ وێ چەندێ هـەلس و کـەوت رەفتـارا بکـەت، لـەوما پـەرتو دبێژیت:

بەســـــە هنـــــدە ت کـــــی شـــــەکوا دلێ کـــــول
بکـــــــت بەلکـــــــە دەوا رەبـــــــێ مبـــــــارەك
وەکـــــی گـــــۆتی کـــــو " الـــــصبر جمـــــیلا"
موخـــــالف نـــــاکتن قـــــەولێ موبـــــارەك[٢٧]

تێبینی دکەین دڤان دێرێن سـەرێدا، کـو پـەرتوی ئامـاژە بـۆ ئایەتـەکا قورئانـا پـیرۆز بریيە و تـێ هـەلکێش کریـە دنـاڤ هـۆزانێن خـۆدا، ئـەو ژی ئەڤەیـە "فـصبر جمیـل و الله المستعان علی ماتصفون"[٢٨]. هەر ددیڤدا پەرتو وێ چەندێ د ئـایینێ ئیـسلامێدا خویـا دکەت، کو پشتی هەر تەنگاڤییەکێ خۆشییەك لدویڤ دا دهێت. ئەڤ چەندە یابییـە پەنـد و گۆتنەکا مەزنا دناڤ جڤاکێ کوردیدا بەلاڤ بووی، دەمێ دبێژن (تەنگاڤی دیـڤ کـورتن).

رەنگە ژێدەرێ ڤێ پەندێ ژ ئایەتا قورئانا پیرۆز ((فـأن مـع العسر يـسرا))[٢٩] هاتبیتـە وەرگرتن. ئەوا پەرتوی دڤێ هۆزانا خۆدا تێ هەلکێش کری، دەمێ دبێژیت:ـ

ژ شـــــوکرا (( ان بعـــــد العـــــسر يـــــسرا))
نەکـــەی ئێـــدی ژ غـــەیرێ حەمـــدێ کـــارەك[٣٠]

ئەڤە وەکی عەقیدە و باوەری، پێدڤییە لسەر هـەر موسلمانەکی پـەنایێ بـو ببـەت و ملکەچی وێ بیرۆکێ بیت و هـەمی کـار و کریارێن خـۆ هەلبسێریتە خـودێ و ژ غـەیری سوپاس و حەمدێ ژ خودێ مەزن هیچ کارەکێ ژوان گرنگتر و ب بهاترنینە.

هەر دبەر دەوامیا ڤان هزراندا. پەرتو دزڤریتە ڤـە سـەرخۆ وێ چـەندێ دیـار دکـەت، بـۆ موسلمانا کو دەمێ وی ئایەتا "لاتقنطـوا مـن رحمـة الله ان الله يغفـر الـذنوب جميعـا"[٣١] خواندی و باش دراماناوێ گەهشتی، کو نابیت مرۆڤـێ موسـلمان خـۆ بـێ بـەهر بکـەت ژ رەحمەت و دلوڤانیا خودێ، چونکە هەر ئەوە هەمی گونـەهان لسەر مرۆڤـان رادکـەت و پویچ دکەت. ل پەرتوی هەمی نەخوشی و کول و کوڤان نـەمان و سـڤك بـوون و سـینگێ وی ئارامی تێدا بەرقەرا بـوو، ئـەڤ چـەندە ژی بـۆ ئەگـەرا هنـدێ کـو پـتر باوەریـا وی ب عەقیدە و شەریعەتێ ئیسلامێ موکوم بیت لەوما دبێژیت:ـ

دەمـــــا مـــــن ئایـــــەتا "لاتقنطـــــوا" دیـــــت
ل مـــن غـــەم بـــون ســـڤك ل وێ مانـــە بـــارەك
موســـەما چـــۆن ب اسمـــێ (مـــصطفی) بـــوی
ببێـــــژە "ســـــلموا صـــــلوا و بـــــارك" [٣٢]

ئەڤ رەوشت و ئاکار و ژیرە، هەمی دز ڤرنەڤە بۆ باوەری پێ ئینانـا مرۆڤـێ موسـلمان ب وان کار و کریار و کردەوا ئەڤێن خودێ تعالا بۆ هنـارتین و لسەر هاتینـە فـەرز کـرن. لەوما پەرتوی ب وی شێوە و شێوازێ د سەرێدا هاتی ئاماژە پێ کریە.

هەر دهەمان روانگەدا. پەرتو کویرتر خۆ دهاڤێتە دناڤ مەسئەلا باوەری پێ ئینانێ، د چەند دێرەکا کاکلك و نیڤشکێ (وحدة الوجود - ئێکەتیا بوونێ) لدویڤ هزر و بیرێن خۆ ب راشکاوی ئەڤێ چەندێ تاوتو دکەت و رەنگە دگەل هندەك کەسا ئێك نەگرن، بەلێ یاددلێ خۆدا دەردکەت و دبێژیت:-

ئێـــــك مایـــــــه وەحـــــــدەتێ (تحـــــــیر)
ئێـــــك مایـــــــەت شـــــــرکەتێ (تکفـــــــر)
ئێـــــك ب عەقیـــــــدە هـــــــەق شوناســـــــە
ئێـــــك بەنـــــدە ب مەســـــئەل و قیاســـــە (٣٣)

ئێك د ئێکەتیا بوونێ دا مایە سەرگەردان و دوودل، ئێکێ دی ژی بۆ خودێ تعالا هەڤال و هەڤکر و شریکا دروست دکەت، و ئەو سەر داچوو و بوونە کافر و ژ دین و ئایینی دەرکەفت. ئێك دی بباش د باوەری و رێیا راستدا هاتە ناسین و راستەرێ گرتە بەر و بسەرکەفت. ئێك ژی بەند و کویلەکێ دلمایە و پەریشانە چونکە دکەڤیتە بەر پرسیاریێ و پێوانەیێ درۆژا حەشرێدا، رەنگە مەخسەدا وی د دێرا کوپلا دوماهیکێدا ئەو بخۆ بیت، کو ئەو سەخلت و رەوشت لدەف هەنە.

هندیکە زاراڤێ (قیاس)ە دڤێرەدا مەبەست پێ ئەو مەسەلە و کێشەنە، کو چ تێکست و دەقێن شەرعی پێ نەهاتبنە خوارێ. بەلکی دەمینیتە سەر زانایێن ئایینی، کو ئەو ب کوشش و رەنجا خۆیا زانستی رەئیەکێ ل سەر بدەن.

جوداهیا (پەرتوی) دگەل گەلەك هۆزانڤانێن بەریخۆ و سەردەمێ خۆ نەخاسمە دگەل جزیریدا ئەوە کو (یەکێتی بوون) واتە (یەکێتیەکا رەها) هەیە رۆناهیەکە د هەر دلەکیدا. پەرتو دگەل ڤێ چەندێ نەبوو، بەلکی ددیت ئەڤ رێبازە ئەگەرێ سەرگێژیی و دویرکەفتن ژ راستیێ دروست دکەت. هەر وەکو ئاماژە بۆ هاتیەگرن.

## پ ـ هۆزانێن بەحسکرنا پێغەمبەری (س.خ)

ئەڤ جۆرە هۆزانە ل سەدێ حەفتێ کۆچیدا، پەیدابوون، هۆزانا ئایینی ل پشتی وی دەمی باهرا پتر بەرف بەحسکرنا پێغەمبەری ڤەچوو ژ هەمی لایەکیڤە، ژ بەر ڤێ چەندێ دبینین دوی سەردەمیدا و پێدا ئەڤ جۆرە هۆزانە گەلەك بەلاڤبوون.
پەرتو ژی ئێکەژوان هۆزانڤانا کو دەستێ خۆ بۆ هۆزانا ئایینی برییە و دوێ مەیدانێدا هەسپێ خۆ لنك دایە. ئەڤ رەنگێ هۆزانا لجەم پەرتوی ڤان بابەتێن ژێری ڤە دگرن:ـ

### ١ـ ستایشا پێغەمبەری

ئەڤ جۆرە هۆزانە لجەم هەکاری گەلەك لایەنێت ژیانا پێغەمبەری (س. خ) بەحس دکەن و پانتایەکا مەزن و بە فرەهـ د هۆزانێن وی یێن ئایینیدا بخۆڤە دگرن. ژ بەرڤێ زۆریا هۆزانێن وی دڤی بواریدا ئەم د کارین لسەر ڤان بابەتا پارڤە بکەین.
شانازی و ستایشکرنا پێغەمبەری (س.خ) دڤێ هۆزانێدا دیار دکەت. ستایشەکا کێم وێنە و دەگمەنە، ب چاڤەکێ بلند بەرێخودایە پێغەمبەرێ خودێ دەماکو دبێژیت:ـ

مەفخەرێ عالەم (محمد) ئەی شەهی عالی جەناب
ئەی پەناهێ عاصیا ئەی صەدرێ دیوانا حیساب
سەروەرێ ئەولادێ ئادەم سەیدێ (خیر الانام)
با دبەر جانێ ت هەردەم سەد صەلات و سەد سەلام(٣٤)

شرۆڤە کرنا ڤان بەیتێ د سەرێدا هاتین بڤی شێوێ خوارێ نە شانازیکەرێ جیهانێ ئەی رێبەر و سەروەرێ پایە بلند، ئەی پەناه و قەرارگەهێ سەرداچوویا و رۆژا دوامایی هەر تۆی ل پێشوازیا ئومەتا خۆی، سەروەر و هێژاییێن سەرجەمێ کورێن ئادەمی، ل سەر تەبن هەردەم و هەر گاڤ سەدان سەلات و سەلام.

پەرتو نەبتنێ ستایشا پێغەمبەری (س. خ) دکەت، بەلکی رۆلی هەر چوار نشینێن وی ژی پشت گوه ڤە ناهاڤێت و گەلەك ب تێرو تەسەلی خو بەر دەتە دناڤ مەیدانا خەباتا وان هەر چوار قارەمانا ژ پێخەمەت پێش ڤەبرنا کاروبارێن ئایینێ ئیسلامێ و موسلمانا ژ هەمی لایەکیڤە. هەروەکو پەرتو دڤان هۆزانێن خوارێدا ئاماژێ ب وێ چەندێ دکەت.

پەرتوو گەلەك ب باشی رۆلی جێنشینێن پێغەمبەری (ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی) ل ماوێ سیه سالیا حوکمرانیا واندا دکەت، کو هەر ئێکی لدویڤ زیرەك و چالاکیا وی پەسن و رەوشتێن وی خویا دکەت. کو تێدا ئایینا ئیسلامێ ژ هەمی لایەکیڤە پێش ڤەچوو و دادوەری و یەکسانی و تەبایی دناڤبەرا موسلمانادا پەیدابوو. هەر چوار باشترین پشتەڤان بوون بۆ بەلاڤکرنا ئایینا ئیسلامێ، چونکە ئەڤ هەر چوارە دناڤ باشترین و چاکترین خەلکیدا هاتبوونە هەلبژارتن. هەروەکو دبێژیت:-

هەر یەك ت عزم و رەزم وەکی شێر ئەژدەها
(صدیق) روکنێ اول ثانی ب حق عمر
عثمان روکنێ ثالث و رابرکی مرتضا
چار عونصرێت قائم و روکنێت دین (پناه)
ئەڤ چارە نەگوزیدەئی (اصحاب جمها)
سی سالە بۆ خەلافەت ئیسلام ب وان عەدیل
یەکسەر جهان ژ (عدل) ئەوان روشەن و ضیا[٣٥]

بەلێ پەرتوو هەر د هەمان پارچێدا، ئاماژێ ب هندێ دکەت کو پشتی ئەو هەر چوار جێنشین چووینە بەر دلوڤانیا خودێ مەزن ئێدێ جیهانا ئیسلامی کەفتە د بن بارێن سەخت و دژوار و دووبەرەکی و هەڤرکی و شەڕوشۆڕ زێدە بوون و گەلەك کارەساتێن نەخۆش و دلتەزین موسلمان ڤە گرتن.

پەرتوو هەر چوار جێنشینا ب رۆناهی و ژێدەروسەرچاوێن زانست و زانیاریێ د زانیت، وان وەکی رێ پیشاندەرێن چرایێن ئایینی راست و دروست د قەلەم ددەت و کو د بەر رۆناهیا بۆ چوونێن وان موسلمان پێگیری پێ دکر، چونکه ئەو وەکی رۆژەکا گەش بوون ژ بۆ پاراستنا سەروەریا ئایینی. کو ل سەردەمێ وان باوەریا موسلمانا ب ئایینی ڤەگەلەك یاموکوم بوو. وان چ گومان و گومراهـ نەهێلابوون و هەمی تشتەك وەکی ئاوێنێ ل بەردەم موسلمان خویا و ئاشکرا کربوون.

هەریەك ب نور مەعرفەت و نص وا رادەت
هەلکر چراغ مذهب و مصباح اقتدا
ئەو ژی چهار ئمامێ ب حەقن تراهی دین
باسست و جماعەت و بـا أمرو بانها
شەمسا سامای دین تازە نوبخشی
ایمان ژگرد شبهە چو مرآت کر جەلا(٣٦)

ئابڤی رەنگێ سەرنج راکێش و بالکێش پەرتو شانازی و ستایشێ ب پێغەمبەری (س.خ) و هەر چوار جێنشینێ وی دکەتن.

## ٢ـ شەفاعەت خواستن ژ پێغەمبەری

پەرتو داخازا شەفاعەتێ ژ پێغەمبەری (س.خ) دکەت هەروەکی هەمی هۆزانڤانێن دیندار. وێ چەندێ خویا دکەت، کو ئەو دراستیدا خۆ دزانیت موستەحقی هندێیە کو پاڤێژنە دناڤ ئاگریدا وی چاخیدا هەر هاوار و گازی دێ ژێ هێن دناڤ وان هەمی رەنگێن ئازار و نەخۆشیاندا. لەوما هیڤیدارە ژ خالقێ دنیا و جیهان چێگری (خودێ مەزن)، بەندێ خۆ پەرتویێ کو تەمەن و ژیێ خۆ هەمی دناڤ گوناهادا دەربازکری، ئەو ب حورمەت و قەدر و بهایێ ناڤێ پێغەمبەری، وی خلاس و رزگار بکەت ژ ئاگری. هەر چەندە بەرامبەر وان گونەهێن گەلەك ئەڤێن وی ئەنجامدابن هیچ بەرسڤ و ئاخفتنەك نینە. چونکه (نەفسا) وی بێ حەمدی وی سەر داچوو لدویڤ ئارەزوویا خۆ کەفت و

لدوما پەرتو تووشی گونەهاکر و دویر ئێخست ژ هـەمی هیڤـی و داخازیـەکا کـو وی حـەز دکر بگەهیتێ. هەروەکی دڤێ پارچا هۆزانێدا هاتی:

(فی الحقیقـــه) ئـــەز دزانم موســـتەحەقی ئـــاگرم
دل ب گـــاز و پـــڕ فغـــانم (بـــین الـــوان العـــذاب)
ئـــەز دکـم هیڤـــی ژ خـــەللاقێ کـــو عالـــەم چـــێکری
بەنـدەئێ عاسـێ کـو عـومرێ خـو د گوناهانـدا بـری
ب حورمـەتا نـاڤێ محمـد دێ خـلاس کـی ژ ئـاگری
گـەر چ بـو هنـدە گوناهـان نینـە وی گفتـەك جـەواب
نەفسی شیطانم ب کەیفا خو ل من دور کر ئەمـەل [٣٧]

وەکو رێرەوەك لنك هەمی هۆزانڤانێن دیندار. داخازا شەفاعەت خواستێ ژ پێغەمبـەری و یاوەرێن وی دکەن.

**٣ـ ئیسراء و میعراج**

ئیسرا و میعراج ژ دوو پەیڤێن زمـانێ عـەرەبی پێکهاتینـە. ((ئیـسرا ب رامانـا ب شـەڤ چوون، مەبەست پێ ئەوە کو ئەو شەڤا پێغەمبەر لە مەککەهێ سـواری بـوراقی بـووی و قەستا مزگەفتا ئەقسا ل قودسـێ کـری. هندیکـە میعراجـە. ب رامانـا چـوونە عـەسمانی دهێـت)) [٣٨]. ئـەڤ روویدانـە ل سـالا دەهـێ ژ پێغەمبەریـەتیا محەمـەدی (س.خ) هاتـە روویدان. بارا پتر ژ زانایێن موسڵمانا دویێ باوەرێدانـە. کـو ئـەڤ گەشـتە ب گیـان نـەبوو، بەڵکی ب لەش و گیان بوو.

پەرتوی گرنگیەکا ئێکجار زۆردایە ڤـی بابـەتی و د گەلـەك هـۆزانێن خـۆدا، ئامـاژە بـو کریـە و ب تێروتەسـەلی خـۆ بەردایـە دنـاڤ ڤـێ روویدانێـدا و ژ هـەمی لایەکیڤـە رۆنـاهی بەردایە سەر. هەروەکو دڤێ پارچا هۆزانێدا خویا دبیت:ـ

(قـرآن) ب (أمـر) و (نهـی) و ب ئـهحكام دل پزيـر
هەلكـــــر ژ (نــور لطــف) شـــەمالا رێيـــا هـــەدا
تەسليمى دەستى (روح القدس) كر بو جهىٚ (وحى)
كـر ئـەر مغـان حـب حـەبيبىٚ خـوە (مـصطفى)[٣٩]

د ڤێرەدا پەرتو ئاماژێ بو وێ چەندێ دكەت، كو هنديكە قورئانە ب فەرمان و خۆدانە پاش ژ كرياریێن خراپ و ئەو ئەحكامێن تێدا هاتين دلێ مرۆڤـێ موسـلمان حـەژێت كـەت و پەسەند دكەت. ل پەی وان ئەحكامان رێك رۆهن و ديار كرن و خۆشتڤيێ خۆ (پێغەمبـەر س. خ) ژ مەككەهێ بەرەف مزكەفتا قودسێ بر. ئينجا ژوێرێ پشتى پێغەمبەرى (س.خ) دوو ركعەت سونەت كرين. بەرەف جهێ هنارتنا وەحيێ بركـو ل ئاسمانـان ل بارەگـايێ پەروەردگارێ مەزن.

ئەڤ چەندە ژى وەكى موعجيزەكێ بوو، خودێ تعالا كريە ديـارى بـۆ ڤيانـا خۆشـتڤيێ خۆ مستەفاى. هەر د بەردەواميا هۆزانێدا هەكارى دبێژيت:-

گاڤـا گەهـشتە سـەروەرێ عالـەم ژ رويـێ (صـدق)
بوســـى وەلێ ژ رهـــشت بـــێ هـــۆش بـــو و مـــا
هـــشيار بـــو ب عـــەينێ عـــەليمى تەماشـــە كـــر
وى بەحرگـــە و ژ رەمــز نـــە ئـــاخر نـــە (انتهـا)[٤٠]

دەمێ پێغەمبەر (س.خ) ل قودسێ بەرەف ئاسمـانێ ئێكـێ و دووێ و سـيێى چـوو تـا گەهشتيە قوناغا دوماهيكێ (سدره المنتهى) كو ئەڤ پەندە لدويڤ دەقين قورئانـا پـيرۆز و فەرموودێن پێغەمبەرى هاتيـە ئەنجامـدان و بـاوەرى پـێ هاتيـە كـرن و ل وێـرێ ئـەو تشتێن بەرچـاڤى پێغەمبـەرى (س.خ) كـەفتين، جهـێ سەرسـورمان و هەيبـەتێى بـوون. پشتى هەيامەكێنەشيا خۆ لبەر وێ چەندێ بگريت. بـەلێ دومـاهيكێ هـەمى تـشتەك بـۆ هاتە رۆهن و شرۆڤە كرن.

د پارچەکا دیدا، پەرتو بەحسێ زڤرینەڤێ دکەت ل ئاسمانی بۆ سەر عەردی هەروەکو دبێژیت:ـ

وەکـــــی ژێ دەرنەکـــــەڤتی دورا جـــــلا
ســـــبێ گۆتـــــە صـــــاحبان حـــــالێ معـــــراج
ژ جـــــان بالجملـــــە کـــــو صـــــدق نبیـــــا
وەرە پرتـــــو بگـــــر دامـــــانی رەحمـــــەت
کلبـــــدا (گـــــنج مطلبهـــــا در انجـــــا)(٤١)

دەمێ پێغەمبەر زڤرییەڤە ژ عەسمانا، ئەو چەنداوی دیتی بچاڤێ سەرێ خۆ، سپیدێ هەمی ب مرید و هەڤال و یاوەرێن خورا گۆت و ئەو سەرهاتی بو وان ڤەگێرا. هەمیان راستەوخو ژێ باوەرکر. چونکە پێغەمبەر ناڤدار بوو ب هندێ کو مرۆڤەکی راستگۆ و ئەمینە. جهێ باوەریا خەلکێ مەککەهی بوو. ئەوجا پەرتو دێ تۆژی وەرە خۆ ب دەهمانا دلۆڤانیێ ڤەکەو خۆ نێزیکی رەحما خودێ بکە. چونکە کلیلا چارەسەریا هەمی کێشا و گرفتا یاد هەندێدا کو مرۆڤ هەر خۆ نێزیکی رەحما خودێ بکەت و خۆ ژ رحماوی بێ بەهر نەکەت. چونکی کلیلا خەزینا هەمی تشتان یال وێرێ و مرۆڤێ موسلمان دڤێت باوەریەکا موکوم ب ئیسرا و میعراجێ هەبیت و ئەو چەندە مرۆڤی دێ سەرفیراز و سەربلند کەتن ل دین و دنیایێدا.

**ئەنجام**

ل دوماهیا ڤێ ڤەکولینێ، پشتی مە ناڤەرۆکێ ئایینی د هۆزانێن پەرتویێ هەکاریدا، لدویڤ زانیاری و پێزانینێن خۆ شرۆڤەکرین و رۆناهیی بەردایە سەر هندەك لایەنێن هۆزانێن وی ئەڤێن هزرا ئایینی تێدا هاتین. ئەز گەهشتمە ڤان ئەنجامێن خارێ:

١ــ ناڤێ هۆزانڤانی (مستەفا بەگێ هەکارییە) و (پەرتو) نازناڤێ وییە، ل سالا (١٧٥٦ز)یێ هاتیە سەر دونیایێ ل جولەمێرگی جهێ میرنیشیناوی، بەلی مرناوی نەیا دیارە، لێ هەتا سالا (١٨١٠ز) مایە و بەری سالا (١٨٣٤ز) مرییە.

٢ـ ناڤـەرۆكێ هۆزانـا وی، گەلـەك بابـەت بخۆڤـە ڤەگرتینـە، بـەلێ بابـەتێ ئـایینی و سۆفیگەری ژ هەمیا پترن و گرنگیەك و پویتەیەكا مـەزن پـێ دایـە و گەلـەك ب جـوانی و راشكاوی هزروبیرێن خۆ دباركرینە.

٣ـ بۆ مە خویا دبیت كو هۆزانڤان ژ ڤی لایڤە كەفتیە لبن كارتێكرنا هۆزانڤانێن بەری خۆ، نەمازە مەلایێ جزیری، و ئەڤ چەندە ژی یادیارە د هۆزانێن ویدا.

٤ـ پتریا هۆزانڤانێن كلاسیكی، هۆزان بڤی بابەتی ڤەهاندینە و گەلەك لسەر راوەستیاینە. چونكە پرانیا وان مەلا بوون و گەلەك ب ئایینەڤە نوسیابوون.

٥ـ ئەو هۆزانێن ئایینی ئەڤێن من ئاماژە پـێ كـری پتریـا وان، لبـەر تیروشـك و رۆناهیـا. ئایەتێن قورئان پیرۆز و فەرمودەیێن پێغەمبەری (س.خ) هاتینە ڤەهاندن.

٦ـ بۆ مە خویا بوو، كو پەرتوییێ هەكاری، شارەزایی د زمانێن دەوروبەرادا هەبووە مینـا زمانێ عەرەبی و فارسی و تركی. چونكە گەلەك زانیاری ب وان زمـان تێهـەلكێش كرینـە دناڤ هۆزانێن خۆدا. نەخاسمە زمانێ عەرەبی.

٧ـ ئەو پارڤەكرنا من دەستنیشانكری بۆ هۆزانێن وی یـێن ئـایینی، لجـەم مـن راسـترە ژ گەلەك پارڤەكرنێن دی ئەڤێن د هەمان بواردا ڤەكولین لسەر وی بابەتی كرین.

٨ـ ئێك ژ سەخلەت و موركێن هۆزانا ئایینی ئـەوە، كـو پـڕن ژ ئایـەتێن قورئانـا پـیرۆز و فرمـودەیێن پێغەمبـەری (س.خ)، دگـەل بكارئینانـا گەلـەك پـەیڤێن عـەرەبی د هـۆزانێن خۆدا، چونكە بەرامبەری هندەكا هێشتا زاراڤە نەهاتینە دانان. ئەڤ دیاردە ژی دهـۆزانێن ویدا كارەكێ بەرچاڤ و ئاشكرایە.

**ژێدەر و سەرچاوە:**


١- تحسين ابراهيم دوسكى، المدخل لدراسة الادب الكردي، الجزء الثاني، ١٩٣٣، ص٣٨-٣٩.

٢- رشيد فندى، من ينابيع الشعر الكلاسيكى الكردى، الجزء الاول، مطبعة وزارة الثقافة - اربيل، من منشورات المجمع العلمي الكردستانى، ٢٠٠٤، ص١١٤ــ ص١١٥. هەروەسا بڕوانە مەسعوود حوسێن بۆتانی، جزیری و کارتێکرنا وی ل سەر پەرتوییێ هەکار، گۆڤارا ڤەژین، ژ١٥، ١٩٩٩، ل٣٥-٣٦.

٣- تحسين ابراهيم الدوسكى، المدخل لدراسه الادب الكردى، ص٤١.

٤- دیوانا پەرتوییێ هەکاری، بەرهەڤکرن و تویژاندنا صادق بهاءالدین ئامێدی، دەزگەها روشەنبیری و بەلاڤکرنا کوردی ژ(٣٤)، ل١٤-١٥.

٥- د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، سۆفیگەری، شیعری ئایینی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحویدا، دەزگای چاپ و بلأوکردنەوەی موکریانی، کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی/ هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠، ل١٩٥.

٦- گوڤارا ڤەژین، ژ(٥)، ل٦٣.

٧- شعر العقيدة في عصر صدر الاسلام حتى سنة ٢٣هـ، ايهم عباس حمودي، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، ١٩٨٠، ص٣٠. هەروەها بڕوانە د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، سۆفیگەری، ل١٩٣.

٨- دیوانا پەرتوییێ هەکاری، صادق بهاءالدین ئامێدی، ل ٢٩.

٩- شعر الصوفي - عدنان حسين العوادي - وزارة الثقافة والاعلام، دار الرشيد للنشر، سلسلة دراسات (١٩١)، دار الحرية للطباعة والنشر، ص١٤٣.

١٠- دیوانا پەرتوییێ هەکاری، ل٤٥.

١١- ژێدەرێ بەرێ، ل٤٦.

١٢- ژێدەرێ بەرێ، ل٤٢.

١٣- القرآن الكريم/ سورة الاعراف، الاية١٥٦.

١٤ـ ديوانا پەرتويێ هەكاری، ل٤٣.

١٥ـ صادق بهاءالدين ئاميێدی، هۆزاڤانێن كورد، چاپخانەی كۆڕی زانياری كور، بەغدا، ١٩٨٠، ل٣٦٣. هەروەسا بڕوانه ديوانا پەرتوی، ل٨٢.

١٦ـ مسند الامام احمد بن حنبل، الجزء الثاني، طبعة القاهرة، ١٣١٣ه، ص٣٥٩.

١٧ـ ديوانا پەرتويێ هەكاری، ل٤٥.

١٨ـ ژێدەرێ بەرێ، ل٢٢.

١٩ـ حديث شريف.

٢٠ـ ژێدەرێ بەرێ، ل٥٦.

٢١ـ ديوانا پەرتويێ هەكاری، ل٧٦.

٢٢ـ ديوانا پەرتويێ هەكاری، ل٧٦.

٢٣ـ ژێدەرێ بەرێ، ل٢٠.

٢٤ـ ژێدەرێ بەرێ، ل٢٠.

٢٥ـ القرآن الكريم، سورة يوسف، الاية ٥٣.

٢٦ـ ديوانا پەرتويێ، ل٣٦.

٢٧ـ ژێدەرێ بەرێ، ل١٥٢.

٢٨ـ القرآن الكريم، سورة يوسف، الاية ١٨.

٢٩ـ القرآن الكريم، سورة الشرح، الاية ٥.

٣٠ـ ديوانا پەرتويێ، ل١٥٢.

٣١ـ القرآن الكريم، سورة الزمر، الاية ٥٣.

٣٢ـ ديوانا پەرتويێ هەكاری، ل ١٥٢ و ١٥٣.

٣٣ـ ژێدەرێ بەرێ، ل ٤٧.

٣٤ـ ژێدەرێ بەرێ، ل ٤٣.

٣٥ـ ژێدەرێ بەرێ، ل ٢١.

٣٦ـ ژێدەرێ بەرێ، ل ل٢١.

٣٧ـ ژێدەرێ بەرێ، ل ٤٤.

٣٨- د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، سوفیگەری، ل٢٥٦.

٣٩- دیوانا پەرتویێ، ل١٩.

٤٠- ژێدەرێ بەرێ، ل ١٩.

٤١- ژێدەرێ بەرێ، ل ٢٩.

# ملخص البحث

## المحتوى الديني في شعر پرتو الهكاري

د. عبدالله ياسين ئاميدي

المحتوى الديني يعد من الاغراض الشعرية المهمة في الادب الكلاسيكي الكُـردي. لأن معظـم شعراء الكُرد الكلاسيكيين تطرقوا الى ذكر هذا الغرض في اشعارهم معبرين بذلك عـن ارائهـم وافكارهم في هذا المجال. غير ان هذا الموضوع لم يلق اهتمـام البـاحثين والمهـتمين في هـذا المضمار، ولهذا اخترت هذا الموضوع لكي اسلط الضوء على جوانب و مفاهيم هـذا الـنمط الشعري لدى الشاعر پرتو الهكاري مستشهداً بنماذج رائعة من شعره بهذا الصدد.

## Religious Purport in Pirto Hakari's Poetry

Dr. A.Y. Amedi

Religious purport has been a very significant purpose of Kurdish classic literature for most of Kurdish poets expressed their views and motifs by including their poety with religious purports. I have chosen this subject to shed light upon it because none of the researchers have felt concern about this subject, I concluded my study with some marvelous poetry of Pirto Hakari.

# هۆزی گۆران
## رۆڵی سیاسی و رۆشنبیریی لەسەدەکانی ناوەراستدا

**د. زرار سدیق تۆفیق**

**کۆلیجی ئاداب/ زانکۆی دهوك**

**- پوختە**

گۆران یان جۆرە قان (الجورقان) هۆزێکی مەزن وکەونارو دێرینی کوردە، لە سەدەکانی ناوەراستدا لە ناوچەکانی پاوە، دەرتەنگ، کرماشان، ماهیدەشت، بەرزاییەکانی حەلوان و خانەقین و دەڤەرە شاخاوییەکانی خوارووی شارەزوور شان بە شان چەند هۆزێکی تری کورد ئاکنجی بووە و بەشێك لە نەتەوەی کورد پێکدەهێنێت - ئەم هۆزە لە چەرخی ئیسلامیدا رۆلی سیاسی و سەربازی و ژیاری و رۆشنبیری خۆی گێراوە، خاوەن دەسەڵاتی سیاسی خێڵەکی بووە، دەیان ناودار لە زانا و مامۆستا و فەقێ و دانەرو صوفی و پیاوی ئایینی پێگەیاندوە .

ئەم توێژینەوەیەدا، لە مێژووی سیاسی و رۆشنبیری هۆزی گۆران دەکۆڵرێتەوە و روڵیسیاسی و سەربازی نیوچە میرنشینی گۆران و ژیاننامەی میر و ناودارانی لە سەدەکانی چوارەم تا سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سەدی دەهەم تا سەدەی سیزدە هەمی زایینی دەخاتە روو، واتە لە دەستپێکی دەرکەوتنی هۆزی گۆران وەك هێزێکی خێڵەکی لە کوردستان تا رۆژگاری مەغول، بێئەوەی بچێتە سەر باسی نەژادو بنەرەتی پەیڤی گۆران و مەبەست و واتا جور بەجورەکانی چەمکی گۆران و ئەو گۆرانانەی بە درێژایی مێژوو بەسەریدا هاتووە.

**یەکەم: ناساندنی هۆزی گۆران**

أ- کوردبوونی هوزی گوران

رۆژهەلاتناس و کوردناسی ناودار ڤلادمیر ڤیودورڤیچ مینورسکی (١٨٧٧ – ١٩٦٦) تۆژینەوەیەکی لەسەر کوردی گۆران بلاوکردۆتەوە[١] بە پشت بەستن بە گەلێك بەلگەو سەرچاوەی کۆن و نۆی، لە بنەماو نەژادی گۆرانی کۆلیوەتەوە و ویستویەتی بناغەیەکی مێژووی بۆ پەیڤی ((گۆران)) بدۆزێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە لە گەڵ چەند ناو و دەستەواژەی کۆن و مێژوویی بەراوردی کردوەو بە هەندێ ئەنجام گەیشتوە و رای خۆی لە مەر نەژادی کوردی گۆران دەربریوە[٢] .

مینورسکی بەم کارەی خزمەتێکی مەزنی دیرۆکی کوردی کردوەو یەکەم تۆژینەوەی قوولی سەبارەت بە هۆزی گۆران ئەنجامداوە کە دەبێتە بەردی بناغە بۆ هەر نوسینێك لە مەر ئەم هۆزە دێرینەی کوردەوە.

هەرچەند بەووردی مامەڵەی لەگەڵ سەرچاوەکاندا کردوە و تاووتۆی کەرەسەی بابەتەکەی کردوە و بە بەلگەوە سەلماندویەتی کە (الجورقان)ی ناو سەرچاوە عەرەبیەکان هەر گۆرانن، بەلام مخابن لە هەندێ بواردا راستی نە پێکاوە و کەوتۆتە نێو هەڵەی زەقەوە، وەك ناجی عەباس وەرگێری بابەتەکە دەڵێت ((وە نەبێ هەموو قسەکانی ئەم زانایە لە گەل حەقیقەت و تاریخدا رێك بکەوێ، هەڵەی وای کردوە و نظرییەی وای داناوە کە قبوڵیان آسان نییە))[٣] .

مینورسکی لای وایە (الجابارقە) و (الجورقان) یەك هۆزن کەچی مەسعودی وەك باسکرا بە دوو هۆزی لێکجیا دایناون، لەمەش ترسناکتر لێ براوانە هەوڵی داوە گۆران لە کورد داببرێ و بەمیلەتێکی جیاوازی دابنێت، راشکاوانە دەڵێت ((لور و گۆران لە بابەت زمان و نەژادو بنچینەوە لە کورد بە جیاوازی دەمێننەوە))، گۆرانەکان ((بەزمانێك قسە دەکەن کە ئێرانیەیە بەلام کوردی نیەیە))[٤] .

لە شوێنێکی تری نوسینەکەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کـە گۆرانـەکان یـەکێکن لـە میللەتە ئێرانیەکانی نیشتەجێی هەرێمەکانی خوارووی دەریای خەزەر (قـەزوین) گوایـا لـەوێوە کوچیانکردوە بۆ کوردستان[٥] .

وا دیارە ئاگاداری ئەو راستیە نیـە یـان فەراموشـی کـردوە کـە سـەرجەم مێـژوونوس و گـەڕۆك جوگرافیەوانانی سەدەکانی ناوەراست ئەوانەی وا ناوی گۆرانیان هێناوە دوپاتیـان کردۆتـەوە کـە گۆران یەکێکە لە دەیان هۆز و ئێڵ و خێڵ و تیرە و تایفەی کورد و هیچ گومان و دوودلییـەکیان لەمبارەیەوە دەرنەبڕیوە[٦] .

لە راستیدا گۆران یان جورەقان (الجورقـان) وەك لەسەرچـاوە عەرەبیـەکانی سـەردەمی عەباسی (١٣٢–٦٥٦ك/ ٧٤٩–١٢٥٨ز) هاتووە، یەکێکە لە هۆزە کوردە ناسراو و بەناوبانگـەکان و لقێك پێکدەهێنێت لە چوار لقە سەرەکیەکەی نەتەوەی کورد[٧]، لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی چوارەمی کوچی/ دەیەمی زایینیەوە بەردەوام نـاو و هـەواڵ و دەنگوباسـی لـە چـەند ژێـدەر و کتێبی مێژوویدا تۆمارکراوە بەڵام ناویان بە جورەقان (الجورقان) یاداشت کـردوە کـە بێگومـان هەر بە عەرەبیکردنی (تعریب)ی گۆرانە، لـە هەنـدێ سەرچـاوەدا (الجورقـان) شـێوێندراوە بـۆ (الجوزقان)[٨] وەلێ هەموویان دووپاتیان کردۆتەوە کـە هـوزێکی کـوردە، هاوکـات لـە ژێـدەرێکی کۆنی فارسیدا کـە لـە دەوروبـەری سـاڵی (٥٢٠ك/ ١١٢٦ز) نوسـراوەتەوە نـاوی ئـەم هـۆزە بـە (گۆران) و (گۆرانان) هاتووە[٩]، ئەمـەش وەك ئاشـکرایە نـاوی راسـت و رەسـەن و دروسـتێتی، هـەروەها مێژوونوسـانی میـسر و شـام لەسـەر دەمـی مەملوکیـدا (٦٤٨–٩٢٣ك/١٢٥٠–١٥١٧ز) جەختیان لەسەر کوردبوونی هوزی گوران کـردوە وناویـان هـەر بـە گـۆران (الكورانيـة) تۆمـار کراوە، وەلی مـەقریزی بـە هەڵـەدا چـووە کاتێـك (الجورقـان) و (الكورانيـة)ی بـە دوو هـۆزی کوردی لێکجیا داناون[١٠].

مەسعودی دەلێت هور جورێك — واتا هەر هوزێك — لە کوردەکان زمانێکیـان هەیـە کـە کوردییە، شەرەفخانیش دەلێت میللەتی کورد لە چوار لقی گەورە پێکدێت کە یەکێکیان گورانـە ، لە روی زمان و ئەدەب وداب ونەریتدا لێکجیان[١١].

ب– پەیڤی گوران و دەرکەوتنی هوزی گوران لە مێژووی ئیسلامیدا:

(گۆران) پەیڤێکی دیرۆکی کۆنە و رەگێکی قوول و ریشەیەکی دووری لە مێژوودا هەیە، وا دیارە گۆران لە ( گەبران)ەوە داتاشراوە کە لە سەرەتای سەردەمی ئیسلامیدا واتای ئاگرپەرستان و پەیرەوانی ئایینی زەردەشتی دەگەیاند، چەمکی گەبران بە پێی بۆچوونی مینورسکی بەم پەیڤی شێوەیە گۆڕان و پێشکەوتنی بەسەردا هاتووە:

گەبران — گاوبارەکان — گاورەکان — گۆرەکان — گۆران[١٢] .

ئەوەی لێرە گرنگە و مەبەست و ئامانجی ئەم توژینەوەیەیە، (گۆران — الجورقان) ناوی هۆزێکی گەورە و ناسراوی کورد بووە لە سەدە ناوەنجییەکان، لێرە لەمیانەی ئەم لاپەرانەدا هەوڵدەدەین ئەم راستیە بسەلمێنین و تیشك بخەینە سەر مێژوو و بەسەرهاتی.

کۆنترین ناوهێنان و ئاماژەی راستەوخۆ و راشکاو بۆ گۆران (الجورقان) وەك هۆزێکی کورد دەگەرێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی[١٣].

بەر لەم مێژووە دوو گەرۆکی موسڵمان ئیبن خوردازیبە (ابن خرداذبە) (م٢٨٠ك/ ٨٩٣ز) و ئیبن فەقیە (ابن الفقیە) (م٣٤٠ك/ ٩٥٢ز) زۆربەی هەرێمە کوردنشینەکان گەڕاون، یەکەمیان ئاماژە بۆ هۆزێکی کورد دەکات بە نێوی (الجابارقە) کە لە دەوروبەری حەلوان دەژیان دووەمیشیان باسی هۆزێکی کورد دەکات بەهەمان ناو کە دانیشتووی دەڤەرێکی سەر بە شاری هەمەدان بوون[١٤]، وەلی مەسعودی (م٣٤٦ك/٩٥٧ز) کە هەرێمی چیا (اقلیم الجبال)ی کوردنشین گەڕاوە و چاوی بە سەردارو سەرۆك هۆزە کوردەکان کەوتووە و ناوی ژمارەیەك هۆز و خێل و تیرە و تایفەی کوردی دانیشتووی هەرێمەکەی هێناوە، جیاوازی دەکات لە نێوان (الجابارقە) و (الجورقان) وبە دوو هۆزی سەربەخۆیان دەژمێرێت[١٥].

جـ- نیشتیمانی گورانەکان:

سەبارەت بە زێدو نیشتمانی گۆرانەکان لە سەدە ناوەنجییەکان، هەر چەند بەووردی ناتوانرێت دەستنیشان بکرێت، بەڵام دەشێین بڵێین لە دەرتەنگی حەلوان (عقبة حلوان)، پاوە، کرماشان (قرماسین)، ماهیدەشت، کەنگاوەر، شاپورخواست، بەرزاییەکانی حەلوان - خانەقین، ناوچە شاخاوییەکانی خوارووی رۆژهەڵاتی شارەزور ئاکەنجیبوو بوون[١٦]، وا دیارە ئەم دەڤەرانە بە (وەڵاتی گۆران)[١٧] ، و (چیاکانی گۆران)[١٨] ناسرابوون .

نیشتمانی گۆران له رووی جیوپوله‌تیکییه‌وه شوێنێکی گرنگ و ستراتیجی بـوو و بایـه‌خ و تایبه‌تمه‌ندی خوی هه‌بوو، رێگه‌ی بازرگانی و سه‌ربازی (به‌غدا — خوراسان)ی پێـدا تێده‌پـه‌ری که به (طريق خراسان العظيم) ده‌ناسرا، له‌سـه‌ره‌تادا و تـا ده‌سـتپێکی سـه‌ده‌ی شه‌شـه‌می کۆچی هۆزی شازنجان (الشاذنجان) کۆنترۆلی ئه‌م رێگه‌یه‌ی کردبوو، پاشان هۆزی گـۆران ئـه‌م رۆڵه‌ی گێرا .

له ساڵی ٤٠٥ك/ ١٠١٤ز چه‌کداره گۆرانه‌کانی نێو سوپای میرنـشینی حه‌سـنه‌وی (٣٤٨ – ٤٠٦ك/ ٩٥٩ – ١٠١٥ز) پڕیاندایه سه‌ر مـیر بـه‌دری کـوڕی حه‌سـنه‌وه‌ییه (٣٦٩ — ٤٠٥ك/ ٩٧٩ — ١٠١٤ز) و کوشـتیان و له‌ترسـی تۆله‌سـه‌ندنه‌وه وڵات و مڵـك و ماڵیـان بـه جێهـشت و پـه‌نایان بـرده بـه مـیر (شمس الدولـة) (٣٧٨ — ٤١٢ك/ ٩٨٨ —١٠١٢ز)ی کـوڕی (فخـر الدولة)ی بوه‌یهی، فه‌رمانڕه‌وای شاری هه‌مه‌دان، وا دیاره له‌وێ به یـه‌کجاری گیرسـاونه‌ته‌وه‌و نه‌گه‌راونه‌ته‌وه وڵاتی خۆیان، ته‌نانه‌ت گوند و ده‌ڤه‌رێکی نزیك هه‌مـه‌دان تـا ئیـشتاش هـه‌ر بـه جۆره‌قان یان جۆزقان ناسراوه[١٩] له‌مباره‌یه‌وه مـه‌لا محه‌مـه‌د جـه‌میل رۆژبـه‌یانی ده‌ڵێـت ((بـه‌م قسانه‌ی [ابن الاثیر] بۆمـان ده‌رده‌کـه‌وێ ناوچـه‌ی (جورقـان)ی ئێـسته‌ی لای هه‌مـه‌دان لـه بنه‌ڕه‌تا (جورقان)ه‌کانی هه‌ڵاتووی (کوسجه‌د) ئاوه‌دانیان کردوتـه‌وه کـه پاشـی کوشـتنی (بـه‌در) هه‌ڵاتوون و له‌وێ ماونه‌وه))[٢٠] .

سه‌ره‌ڕای ئه‌م ده‌ڤه‌رانه هۆزێکی کورد بـه نێـوی گـۆران لـه سـه‌ده‌ی چـواره‌می کۆچـی/ ده‌هه‌می زایینی له هه‌ندێك شوینی ناوچه شاخاوییه‌کانی رۆژهه‌ڵاتی موسڵ و ده‌وروبه‌ری ئـاکرێ (العقر) ده‌ژیا، به‌پێی ئاخافتنی مه‌سعودی ئه‌مانه له‌سه‌ر ئایینی مه‌سـیحی بـوون[٢١] ، جێگـه‌ی ئاماژه‌یه گۆرانه‌کانی ئاکرێ حاڵی حازر هۆزێکی گه‌وره‌ی کـوردی موسـڵمانه ودابه‌شـیوه به‌سـه‌ر چه‌ند خێل و تیره‌یه‌کدا به (العشائر السبعة) ناسراون له ناحیه‌ی بـه‌رده‌ڕه‌ش سـه‌ر بـه قـه‌زای ئاکرێ و گونده‌کانی نیشته‌جێن .

هه‌روه‌ها له سه‌ده‌ی حه‌وته‌می کۆچی/ سێزده‌هه‌می زایینی لـه‌رۆژگاری هێرشـه‌کانی مـه‌غول بـۆ سه‌ر وه‌لاتی هه‌ولێر، جارێکی تر ناوی کورده گورانه‌کان هاتووه که لـه ده‌وروبـه‌ری هـه‌ولێر یـان ووردتر له ده‌ڤه‌ره‌کانی نێوان ئازه‌ربایجان – هه‌ولێر نیشته‌جێبوون[٢٢]، که وادیاره مه‌به‌ست هـه‌ر

گۆرانەکانی دەڤەری ئاکریێ بن، چونکە لەو دەمانە ئاکریێ پتر بەهەولێرەوە پەیوەست بـوو، وەك زانراوە سەرچاوەکان لە مەڕ ناوچـە کـورد نـشینەکان بـە شـێوەیەکی گـشتی دەدوێـن، کـەمجار بەلای دەستنیشانکردنی ووردو دروستی شوێنەکانەوە دەچن.

ژێدەرە مێژوویـیـەکان روونیـان نەکردۆتـەوە چ پەیوەندییـەك و خزمایەتیـەك گۆرانـەکانی ئاکریێ و هەولێر بە هۆزی گۆرانی گەورە دەبەستێتەوە؟ ئایە لەبنەڕەتدا چەند خێـل و تیرەیـەکن لە ئەو و بەهۆی روداوێکی سیاسی، ئابوری، کۆمەلاّیەتی، یان هەر ئەگەرێکی دی بەدەسـتوری گۆرانە ئاوارە بووەکانی هەمـەدان، ئـەمانیش لـە نیـشتمانی خۆیـان لـە دەڤـەرەکانی حـەلوان و کرماشان وشارەزور پەراگەندەو ئاوارە بوونە؟ یان هۆزێکی سەربەخۆن و جگە لـە هاونـاوی هـیچ پەیوەندییەك و نزیکایەتیەك گرێیان نادات بە هۆزی گۆرانەوە .

د- تیرە و خێڵەکانی گۆران

بێگومان گۆران هەر لە کۆنەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆ هۆزێکی مەزن و فرەلق و بـەربلاّو بـووە لە روبەرێکی شاخاوی و نیوچەشاخاوی بەرفرە بلاّوبوتەوە، ژمارەیەك شار و شارۆچـکە و قـەلاّو سەدان گوندی هەبوون و بەسەر دەیان لق وخێل و تیرە و بـەرەباب و بنەماڵـەدا دابـەش بـووە، تەنانەت شەرەفخان هەموو هوزە کوردەکانی ئێرانـی بـەگوران دانـاوە ودەڵێـت ژمارەیـان هێنـدە زوربووە — بـیێ ئـەوەی رۆلی ئـەوتویان گێرابێـت — تـا ئـەو رادەیـەی ناچـار بـووە ناوهێنانیـان پشتگویێ بخات[٢٣] وەلیێ ناوی زۆربەیان نەزانراوە، تەنها ناوی دوو تیرەیان بـۆ ئێمـە ئاشـکرایە -:

١- بابونی، کە وادیارە لە گەنگاوەرو دەوروبەری بووە[٢٤].

٢- قوهییان کوهی لە کرماشان[٢٥].

٣- هەروەها ئیبن فەزلۆلای عومەری (ابن فضل الله العمري) (م ٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز) ئاماژە بۆ دوو تیرەی هۆزی گۆران دەکات بیێ ئەوەی ناویان بهێنێت[٢٦].

٤- لەلایەکی ترەوە بە پێی یەکێك لەو دوو ریوایەتەی وا لە شەرفنامە هاتووە، ئێلەکانی سیامەنسوری، چەنگنی، زەنگەنە بە نەژاد لە هۆزی گۆرانن[٢٧].

**- دووەم: مێژووی سیاسی گۆران**

**أ- هوزی گوران لەسەردەمی بوەیهیدا (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٦-١٠٥٥ز):**

زانیاری و دەنگوباس دەربارەی هۆزی گۆران و سەرجەم هۆزەکانی کورد لە سەدەکانی ناوەراستدا یەکجار کەمە، لەبەر ئەوەی لە بنەرەتدا ژێدەرێکی تایبەت نیە روداو و بەسەرهاتی کوردو کوردستان بگێرێتەوە، سەرچاوە گشتیەکانی جیهانی ئیسلامیش تاك و تەرا و ناو بەناو و سەرپێیانە ئاماژەیان بۆ هۆزەکانی کورد کردوە، بۆیە چەند ئەڵقە ولایەنێکی مێژووی کورد بە شاراوەیی و نەزانراوی دەمێنێتەوە .

وەك ئاشکرایە لەسەر دەمی بوەیهی و لە ئەنجامی ئەو گۆرانکاری و ئالۆگورە سیاسی و ئابوری و کۆمەلأیەتیانەی دەولەتی عەباسی گرتەوە و بارو دۆخێکی نوێی هێنایە ئاراوە، ژمارەیەك میرنشینی نیوچە سەر بەخۆ و دەسەلأتدارێتی خێلەکی و قەلأدارانی کورد دەرکەوتن و زۆربەی ناوچەکانی کوردستانیان تەنیەوە، تەنها لە هەرێمی چیا (اقلیم الجبال) — پارێزگاکانی سلێمانی و سنە و کرماشانی ئێستا – ئەم بنەماڵەو کەسایەتیە دەسەلاتدارانە پەیدابوون :-

١- بنەماڵەی حەسنەویە لە هۆزی بەرزەکان .

٢- بنەماڵەی بەنوعەناز لە هۆزی شازنجان .

٣- بنەماڵەی وەرام لە هۆزی گاوان (الجاوانية) .

٤- بنەماڵەی زوهمانی کوری هیندی.

٥- میر سەهلانی کوریمسافری کورد (عصمة الدولة) کە بە میری هەرێمی چیا (امیر الجبل) ناودەبرا.

٦- میر حوسین (خۆشین) کوری مەسعودی کورد خودانی قەلأی کۆسجەد .

٧- میر هیندی کوری سەعدی .

٨- میر ئەبو عیسا شادی کوری محەمەد[٢٨].

بێگومان هۆزێکی گەورەو بە دەسەلأتی وەك گۆران لەم دیاردەیە بێ بەهرە نەبوو، ڤەکۆلەرێك دەلێت ((لەوانەیە میر ئەبو عیسا شادی لە سەرانی هۆزی گۆران بێت))[٢٩]، بوچوونەکەی لە جێگەی خویەتی و دوور نیە وابێت، چۆنکە وەك لە روداوەکانی ساڵەکانی

٣٩٧ك/ ١٠٠٧ز، ٤٠٠ك/١٠١٠ز دەردەکەوێت، میر ئـەبو عیـسا شـادی سـەردارێکی خێڵـەکی دەڤەرەکانی حەلوان، شاپورخواست، ئەسەدئابادی نزیك هەمەدان بـووە سـەر بـە مـیر بـەدری کـوڕی حەسـنەوەیە (٣٦٩ — ٤٠٥ك/ ٣٨٠ — ١٠١٤ز) بـوو، ئـەم ناوچـانەش وەك زانـراوە گۆراننشین بوون[٣٠] .

بەگوێرەی ئەو زانیاری و کەرستە کەمەی لەبەر دەستدایە لـە توانـادا هەیـە بڵـێین کـە گـۆرانیش دەستڕۆیـشتووی ناوچـەکەی خـۆی بـوو، سـەرۆکەکانی فـەرمانڕەواو و بەڕێوبـەری پارچەیەکی ناوچە شـاخاوییەکانی نێـوان سێگۆشـەی حـەلوان – شـارەزور – کرماشـان بـوون و دەسەڵاتدارییەکی خێڵەکی نیوچە سەربەخۆ و سنورداریان پێکەوە نابوو، کاروباری سـەربازیی و کارگێڕی شارۆچکەو قەڵا و باژێر و گوندەکانی ژێر دەسەڵاتیان بەڕێوە دەبرد و بـاژێری دەرتـەنگ یان دەربەندی حەلوان[٣١] یان کردە بارەگـاو پایتـەخت، تەنانـەت هەنـدێك لـە میرانـی گـۆران بەخودانی دەرتەنگ یان دەربەند (صاحب الدربند) دەناسران[٣٢] .

لەسەرەتادا و کاتێك میرنشینی حەسنەوی بەرزیکانی (٣٤٨ – ٤٠٦ك/ ٩٥٩ – ١٠١٥ز) دامەزراو زۆربەی دەڤەرەکانی هەرێمی چیای کۆنترۆڵ کـرد، چـەکدارانی گـۆران چـوونە ڕیـزی سوپای حەسنەوی، هەر بەدەستی ئەمانیش میر بەدری کوڕی حەسنەوی ساڵی ٤٠٥ك/ ١٠١٤ز بەکوشت چوو[٣٣] .

بە پشتبەستن بەو پێزانینەکەمەی لەبەردەست دایە، دەشێت بلێین هـوزی گـوران لـە دوو شـوێن دەستڕویشتوو بوون:

**١– لە باژێری شاپورخواست و دەوروبەری**

دوای کـــەوتن و لـــەناو چـــوونی دەســـەڵاتی بنەماڵـــەی حەســـنەوی بـــەرزیکانی لـــە (٤٠٦ك/١٠١٥ز)، بەشـێك لـە زێـد و نیـشتمانی هـۆزی گـۆران کەوتـە ژێـر رکێڤـی میرنـشینی کاکەوییـەوە (٣٩٨ — ٥١٣ك/ ١٠٠٨ — ١١١٩ز)، علاء الدولة کاکـەویی (٣٩٨ — ٤٣٣ك/ ١٠٠٨ — ١٠٤١ز) لـە سـاڵی ٤١٧ك/ ١٠٢٦ز، کـوڕە مـامێکی بـە نێـوی ئـەبو جەعفـەر کـردە بەرپرسی شاپورخواست وولاتی گـۆران، حـسێبی بـۆ هـۆزی گـۆرانیش کـردو لـە خـۆی نزیکـی خستنەوەو دەیزانی بێ رازیکردنی ئەوان ئاشتی بەرقەرار نابێـت و ناوچـەکە کـۆنترول ناکرێـت

بۆیه ئەبو فەرەجی بابونی بە میر و نوێنەری گۆران دەستنیشانکرد لەگەڵ ئەبو جەعفەری ئاموزای داینا، ئەبو فەرەج یەکەم میرە کە دڵنیاین لە هۆزی گۆرانە و ناوی لەسەرچاوەکان هاتبێتت، وا دیارە لە دەستپێکی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینیەوە تا رۆژی کوژرانی سەرداری گۆران بووە .

وەلێ زۆری نەبرد گرژی و ئاڵوزی کەوتە نێوان ئەبو جەعفەر ئەبو فەرەجەوە، هەر چەند میر علاء الدولة کەوتە بەینیانەوەو پێکی هێنانەوە، بەلام تەناهی درێژەی نەکێشا و ناو بژییەکەی علاء الدولة سەری نەگرت،کار بەوە گەیشت ئەبو فەرەج بەدەستی ئەبو جەعفەر کوژرا[٣٤] .

پیاوان و چەکدارانی گۆران کاتێك بەمەیان زانی، کەوتنەخۆ و دەستیان گرت بەسەر ناوچەکەدا و هەڵیان کوتایە سەر دامودەزگاکانی میرنشینی کاکەویی و تالانیان کرد، علاء الدولة بەمەبەستی قەلا چۆکردنی راپەرینی گۆران سوپایەکی ناردە سەریان بە سەرکردایەتی ئەبو مەنسوری برای ئەبو جەعفەرو فەرهادی کوڕی مەرداویج و عەلی کوڕی عومران، پیاوماقولانی گۆران کە لەم لەشکرکێشیە ئاگادار بوونەوە بەنێردەیەکە داوایان لە عەلی کوڕی عومران کرد هەوڵبدات پێکیان بهێنێتەوە لەگەل علاء الدولةدا، بۆ ئەم نیازە کۆمەڵی سەردار و پیاوماقول و دەمڕاست چوونەلای، ئەمیش ویستی بەم کارە رابێت، وەختێك ئەبو جەعفەر و فەردهاد بەم کارەیان زانی داوایان لە عەلی کوڕی عومران کرد نوێنەرانی گۆرانیان تەسلیم بکات، دەنا بەزۆر و بەزەبری هێز لە دەستی دەریان دەهێنن، عەلی ئەو داوا کارییەی رەتکردەوەو پەیوەندی بەگۆرانەکانەوە کردو بووە هاوپەیمانیان، لە نێوان ئەمان و سوپای علاء الدولة شەڕو لێکدان بەرپابوو و بە بەرژەوەندی عەلی کوڕی عومران و هۆزی گۆران کۆتایی هات و لە تۆڵەی ئەبو فەرەجی سەرداریان، ئەبو جەعفەریان کوشت و ئەبو مەنسوری برایشیان زیندانی کرد[٣٥] .

لە ساڵی ٤١٨ك/ ١٠٢٧ز علاء الدولة هێرشێکی تری هێنایە سەر وڵاتی گۆران بۆ شەڕی عەلی کوڕی عومران و هاوپەیمانەکانی و توانی نێوانی لەگەڵ بەشێکی هۆزی گۆران هێوربکاتەوە و بۆلای خۆی رایکێشان، هەر لە درێژەی ئەم ناکۆکیەدا علاء الدولة عەلی کوڕی

عومران و گۆرانەکانی هاوپەیمانی لە قەلاّی کەنگاوەری گۆراننشین بـە تونـدی گـەمارۆدا، عـەلی پاش ماوەیەك خۆقایم کردن و بەرگری، ناچار داوای رێککـەوتن و پێکهـاتنی لـە عـلاء الدولـة کـرد، ئـەویش بەدەسـتەوەدانی بکـوژانی ئـەبو جەعفـەری پـسمامی کـردە مـەرجی بنـەڕەتی رێککەوتن، ئەوە بوو مەرجەکەی سەری گـرت، بکـوژانی ئـەبو جەعفـەری لـە پیـاوانی گـۆران تەسلیم کرا و بێ سێودوو لە ملی دان و قەلاّی کەنگاوەری داگیر کرد[٣٦] .

وا دیارە ئالۆزی و دوژمنداری نێوان هۆزی گۆران و علاء الدولةی کاکـەویی رەویوەتـەوە و پەیوەندییان باری ئاسایی خۆی وەرگرتۆتەوە، بەڵکو جۆرە هاودەنگیەك لە نێوانیاندا کەوتۆتـە ئاراوە، تەنانەت کاتێك علاء الدولـة لە سـاڵی ٤٢٣ك/ ١٠٣٢ز رویکـردە شـاری شاپورخواسـت بووە میوانی سەردارانی گۆران، هەروەها فەرهادی کوڕی مەرداویج سەرکردە لە سوپای کاکەویی بە نامـە پەیوەنـدی کـرد بـەو سـەردارو چـەکدارانەی گـۆران کـە لەگـەڵ عـەلی کـوڕی عـومران مابوونەوەو قەناعەتی پێکردن واز لە عەلی بهێنن و بگەڕێنەوە نێو ریزەکانی سوپای کاکەوی[٣٧] .

**٢- لە شاری کرماشان (قرمسین) و قەلاکانی دەوروبەری**

بێجگـە لـە ماڵبـاتی ئـەبو فـەرەج لـە خێڵـی بـابونی، ماڵبـاتێکی تـر لـە خێڵـی کـوهی (القوهیة) سەربە هۆزی گۆران دەسەلاّتدارو فەرمانڕەوا بوون، وەك لە ئاخـافتنی (ابـن الاثیـر) دیارە دوو مـیری بـرا لـەم خێڵـەی گـۆران کـە ناویـان نازانرێـت، خـودان سـوپاو دامودەزگـای سەربازی خۆیان بوون و هەردوو شاری کرماشان و خولنجان و قەلاّی ئەرنەبە (أرنبه)[٣٨] یان تـا ساڵی ٤٣٠ك/ ١٠٣٨ز بە دەستەوە بوو[٣٩] ، تەنانەت یەکێکیان بە خودانی کرماشـان (صـاحب قرمسین) ناو دەبات، ئەوە بوو لەو ساڵەدا ناوچەو مڵك و ماڵی ئەم بنەماڵەیە کەوتە بەر هێرشـی میر فارسی کوڕی محەمەد کوڕی عەنازی شازەنجانی ناسراو بە (أبـو الـشوك) (٤٠١ – ٤٣٧ك/ ١٠١١ – ١٠٤٦ز) و هەمووی لێ زەوت کردن[٤٠] .

هۆزی گۆران بە درێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەهەمی زایینـی، هێزێکی خێڵـەکی نـاوخۆیی دەستڕویـشتووی پێکـدەهێنا، بۆیـە کاتێـك سـوڵتان تـوغرل بـەگی سـەلجوقی (٤٢٩ – ٤٥٥ك/ ١٠٣٨ – ١٠٦٣ز) لـە سـاڵی ٤٣٧ك/ ١٠٤٦ز ئیـبراهیم یـەنالی دایکبرای بە سۆپایەکەوە ڕەوانـەی هـەرێمی چـیاکردو داگـیری کـرد، کرشاسـفی کـوڕی عـلاء

الدولـةی کاکەوی لە شاری هەمەدان کشایەوەو پـەنای بـردە بـەر هـۆزی گـۆران و داڵدەیانـدا، ئیبراهیم یەنالیش درێـژەی بـە پێـشرەوی خـۆی داو بـەبیانوی داڵـدەدانی کرشاسـف پـەلاماری نیشتمانی هۆزی گۆرانیدا لەگەڵیانا جەنگا و بەزاندنی و تالاّنیکردن[41].

**ب– هوزی گوران و هێرشە فراوانخوازیەکانی سەلاجیقە**

شالاّوی توندوتیـژ و یـەك لەدوایـەکی تورکـە سـەلجوقێکان بـۆ سـەر زێـدی گـۆران و سەرپاکی هەرێمە کوردنـشینەکان لـە سـەدەی پێنجـەمی کۆچـی/ یازدەهـەمی زایینـی کـارێکی خراپی کردە سەر میرنشین و هۆزە کوردە خانەدانەکان بە گۆرانەوە و بووە ئەگەری لە ناوچـوون و فەوتانی زۆربەی میرنشینەکانی کوردستان کزبوونی ئـەوانیتر و لاوازکـردن و سـنووردارکردنی دەسەلاّتی سیاسی سەردارو سەرۆك هۆزو قەلاّدارانی کورد، سەرەرای ئەم راستیە وەك ئاشـکرایە یەکێك لە ئەنجامەکانی شالاّوە بەردەوامەکانی تورکە سەلجوقێکان بریتی بـوو لـە بـلاّو بوونـەوە نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی زۆری ئێلّ و گروپ و بنەماڵەی تورك و تورکمان لە ناوچە جـۆر بـە جۆرەکانی کوردستان[42] ، سەبارەت بە ولاّتی گـۆران، هـەردوو بنەماڵـەی بـورجم (بـرجم) لـە هـۆزی ئـەیواقی یـان ئـەیوائی لـە ناوچـەکانی حـەلوان و دەرتـەنگ و قەسرشـرین و کرماشـان وبنەمالەی قەفجاقی هەر لـە هـوزی ئـەیواقی لەشـارەزور و کـەرخینی (کـەرکوك) دەسـتەلاّتیان گرتەدەسـت و چـەند بـاژێرو قـەلاّیان بـۆ خۆیـان پـاوەنکرد و دەسـتیانگرت بەسـەر روبـەرێکی بەرفراوانی زەویوزاری گۆران و هۆزەکانی تری کورد، حوکمێکی سەربازیان تیایـدا دامەزرانـد، ئیبراهیمی کوری بورجم، سلێمانی کـوری بـورجم، بورجـوم کـوری مـەحمودی کـوری بورجـوم لەسەرکردە سەربازییە ناودارەکانی بنەماڵەی بورجمین و هەروەها قەفجاقی کوری ئەرسەلانتاشی تورکمانی و عیززە دین حەسەنی کورەزای لە میرە ناودارەکـانی بنەمالـەی قـەفجاقین[43]، بۆیـە هیچ سەیر نییە ئەگـەر لـە ژێـدەرە مێژووییەکانـدا بـاس و خواسـی گـۆران و میرەکـانی بەرچـاو نەکەون، ئەم خامۆشییەش تا نیوەی دووەمی سـەدەی شەشـەمی کۆچـی/ دوازدەهـەمی زایینـی خایاند، واتە ئەو ساتەی سەر لە نوێ دەنگوباسی چالاکی و جموجۆلی میرانی گـۆران بـەر چـاو دەکەنەوە.

**جـ– سەرهەلدانی نیوچەمیرنشینی گوران**

دوای لاواز بوون و پارچەپارچەبوونی دەولەتی سەلجوقی لەگەلێك ناوچەی كوردستان میر و سەروك هوزە كوردەكان توانیان دەستەلاتی وراسی هوز و بنەمالەكانیان وەربگرنەوە و ژمارەیەك نیوچەمیرنشین و دەسەلاتداریتی خێلەكی دابمەزرینن.

بەمردنی سولتان مەسعودی سەلجوقی لەسالی ٥٤٧ك/١١٥٢ز لەشاری هەمەدان ، سەلجوقیەكان پتر لاواز و بێدەسەلات بوون، وهەڤركی و كێشە ناوخوییەكان قولتربونەوە و بەمرنی "كامەرانی دەولەتی سەلجوقیش مرد و ئالایەك نەما تا لە دەوری كوببنەوە"[٤٤].

یەكێك لەو هوزانە گۆران بوو كە شیا دەسەلات بگریتە دەست و كاروباری سەربازی و كارگێری وولاتی خۆی بەریوە ببات، ونیوچەمیرنشینێك دابمەزرێنێت.

لەنێو میر و سەرەك هۆزو سەردار و دەسەلاتداری نیوچە میرنشینی گۆران تەنها ئەمانەیان بۆ ئێمە ئاشكران:-

### ١- میر عیزەدین خەسرەو كوڕی بورجم كوڕی خەسرەوی كورد

تەنها (ابن الفوطي) (م ٧٢٣ك/١٣٢٣ز) ئاماژەی بو ئەم میرەی گۆران كردوە و بەخودانی دەربەند (صاحب الدربند) — واتە دەربەندی حەلوان — بە یەكێك لەسوارچاكە ناودارەكان و جوامێرە ناسراوەكان وەسفی كردوە، لە مەڕ ژیان و سەردەمی ئەم میرە زانیاری لەبەردەستدا نییە[٤٥].

### ٢- میر مەكلوا كوڕی خەسرەو (؟ - ٥٩٥ك/ ١١٩٨ز)

ئەگەر ناو بكرێتە پێوەر ئەوا دەشێت مەكلوا كوڕی میر خەسرەو بێت، زیاد لەمەش وەك میر خەسرەو هەر بە خودانی دەربەند دەناسرا، ئەم میرە گەلێك بە هێزو توانا بوو، توانی قەلاكانی دەڤەری دەربەند و حەلوان بخاتە ژێر ركێفی خۆیەوە و كۆنترۆلی ئەو رێگە بازرگانی و سەربازی كرد كە بە دەربەندا تێدەپەڕی و وای لە قەلادارو میرو فەرمانڕەواكانی دەرهاوسێی كرد دان بە دەسەلاتی دا بنێن و خەلات و دیاری پێشكەش بكەن و ناچاری كردن خۆیان لە گێچەل و ئاژاوەی بپارێزن، تەنانەت لەو سەردەمانەدا دەربەند بە ناوی ئەوەوە دەناسرا، تا لە مانگی رەجەبی سالی ٥٩٥ك/١١٩٨ز كۆچی دوایی كرد[٤٦] .

**٣- میر موبارزەدین کەش تەغان کوڕی عەبدوڵڵای کورد (مبارز الدین ابو حرب کش طغان بن عبدالله الکردي الامیر)**

کەش تەغان میرێکی تری نە ناسراوی کوردە، ئێمە بە دووری نازانین لە هۆزی گۆران بێت هەر چەند نازانرێت چ پەیوەندی و خزمایەتیەکی بە بنەماڵەی خەسرەووەوە هەیە، (ابن الفوطي) لە بارەیەوە دەڵێت ((فەرمانڕەوای سەرجەم کوردەکانی هەرێمی چیا بوو، لە بنەماڵەیەکی دێرین و شکۆدار بوو، شانازی و چاکەی بەسەر خەڵکی هەرێمەکەوە هەبوو، هەموو گوێڕایەڵی و پابەندی بوون))، کە چی ئەم میرە لە تافی لاوی لە تەمەنی سەرەوەی سی ساڵ سەری نایەوە[٤٧] .

(ابن الفوطي) ناو و نازناوی ژمارەیەکی زۆری میران و زانایان و کەسانی پلەو پایەداری کوردی لە کتێبەکەیدا یاداشت کردوە، بەلاّم زانیارییەکی ئەوتۆ دەربارەیان نادابەدەستەوە، تەنها ناو و نازناو و ستایش و پیاهەڵدانی تومارکردوە[٤٨] .

**٤- میر حوسامە دین عەکە (حسام الدین عکە[٤٩]) فەرمانڕەوای دەرتەنگ و شالأوەکانی مەغۆل (؟ - ٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز)**

کوردستان و سەرپاکی هەرێمەکانی خیلافەی عەباسی لە رۆژهەلاّت، هەر لە ساڵی ٦١٧ك/ ١٢٢٠ز یەوە تا کۆتایی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سێزدەهەمی زایینی رووبەرووی زنجیرەیەك پەلامارو هێرشی ترسناکی مەغول بوونەوە، لە ساڵەکانی ٦٢٨ك/١٢٣١ز، ٦٢٩ك/١٢٣٢ز، ٦٣٥ك/١٢٣٨ز، ٦٤٧ك/ ١٢٤٩ز، ٦٥٠ك/ ١٢٥٢ز، ٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز، هەرێمی چیاو شارەزور و حەلوان و دەرتەنگ بوونە ئامانجی لەشکرکێشیکانی مەغول[٥٠] .

لە ساڵی ٦٢٨ك/ ١٢٣١ز سوپایەکی مەغول لە ئازەربایجانەوە ئاوەدیوی دەڤەری هەولێر بوون و کەوتنە گیانی خەڵکی بێتاوان و سڤیل و دەستیان لە هیچ کەسیَ و لە هیچ شتیَ نەپاراست، بەدەم رێگاوە ژمارەیەك تورکمانی ئەیواقی و کوردی گۆرانیان کوشت[٥١] .

لە ساڵی ٦٥٠ك/ ١٢٥٢ز جارێکی تر گرووپێکی زەبەلاحی مەغول پەلاماری هەرێمی چیایاندا و دەستیان کرد بە کوشتن و برین و رەشبگیری و تالاّنکردنی کوردەکانی هەرێمەکە[٥٢] .

له دەستپێکی ساڵی ٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز هۆلاکۆ بـه سـوپایەکی بـێ شـومارەوە و بـەیاوەری گەورە بەرپرسان و سەرکردەکانی سوپا بەرەو کرماشان و حەلوان کشا و له رۆژی (٢٧)ی شەوالی ٦٥٥ك/١٢٥٧ز له کرماشان مۆڵیدا[٥٣] . لەودەمانەدا حوسامەدین عەکه بـەرپرس و فـەرمانڕەوای دەرتەنگ بوو، خەلیفەی (المستعصم) (٦٤٠ – ٦٥٦ك/ ١٢٤٢ – ١٢٥٨ز) دانـی بـه شـەرعییەتی دانا بوو و به حـاکمی دەرتـەنگ و دەوروبـەری دایمەزرانـدبوو و رایـسپاردبوو بەرگـەی هێـرش و پێشرەوی مەغول بگرێ[٥٤] .

دەبێت حوسامەدین رۆڵێکی بەرچاوی گێڕابێت له پێشگرتن و بەرپەچدانەوەی لەشکرکێـشێکانی مەغول، بۆیە هۆلاکۆ وەك رەشیدەدین هەمەدانی (٦٤٥ –٧١٨ك/ ١٢٤٧ – ١٣١٨ز) مێژوونوسی دەرباری مەغول دەڵێت داخ له دڵ بوو لێی و کەوتە ترساندن و هەڕە شـەلێکردنی و نـاردی بـه شوێنیدا تا خۆیبدات به دەستەوە، ئەمیش ناچار چـووە خزمـەتی و سـەعدی کـوڕی لەجێگـەی خۆی بەجێهێشت و پابەندی و گوێڕایەڵی و تاعەتی خۆی بۆ هۆلاکۆ راگەیاند، هۆلاکـۆش لێـی خۆشبوو و له سۆزی و مەرحەمـەتی خـۆی بەقـسەی رەشـیدەدین – بێبەشـی نـەکردو رێگەیـدا بگەڕێتـەوە بارەگـای خـۆی، بگـرە هـەردوو شـورای (حـصن)ی (وروده) و (مـورج)[٥٥] و چـەند قەلایەکی پێبەخشی، حوسامەدین که له دەرباری هۆلاکۆ گەڕایەوە لەشکری نـاردە سـەرقەلا و شورا و پێگاکانی ناوچەکه و هەمووی گرتن و خستنیە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە[٥٦] .

سەرەڕای ئەم هەڵوێستەی هۆلاکۆ و ئەوچاکەیەی وا نواندی بەرامبەر میر حوسـامەدین، بەلاّم میری دەرتەنگ له نیاز و مەبەستی هۆلاکۆ دڵنیانەبوو و دەیزانی جێی متمانەو باوەڕ نیە و ناکرێت پشتی پێببە سترێت، هەروەها نەیدەویست دڵی خەلیفەی لێبرەنجێـت و لـە پەیوەنـدی کردنی به هۆلاکۆوە زویرو دڵگیرببێت، بۆیە هاوکات نامـەی بـو (ابـن صـلایا العلـوي) حـاکمی هەولێر نارد تـا لـە گـەڵ خەلیفـە پێکیبهێنێتـەوە و داوای لێکـرد بـەزمانی ئـەوەوە بـه خەلیفـە رابگەهێنێت کە :

((تواناو لێهاتوویی هۆلاکـۆم مەزەنـدەکردوە، هەرچـی توندوتیـژی و هەڕەشەوگوڕەشـەی هەیە لای من بـەهیچ ناچـێت، ئەگـەر خەلیفـە خـاترم بخـوازێ و دڵنیـام بکـات، لەشـکرێکی سوارەم بۆ بنێرێت، ئەوا من لەلای خۆمـەوە نزیکـەی سـەد هـەزار پیـادەم لـە کـوردو تورکمـان

کۆدەکردەوە و هەموو ڕێگە و کەلێنێکم بە ڕووی هۆلاکۆدا دەگرت ونەمدەهێشت یەك مەغۆلی توخنی بەغدا بکەوێت وبچێتە ناو شارەوە))[٥٧] .

میر حوسامەدین بەم کارەی خۆی خستە نێو هەلۆیستێکی ئالۆز وترسناکەوەو گران لە سەری کەوت وبووە مایەی کوژرانی خۆی و لەناوچوونی ماڵ وملْك و سامان و دەسەلاتی، لەلایەك خەلیفە هیچ پیتەیەکی بە داوا کارییەکەی نەداو پشتگۆیی خست و لەلایەکیترەوە بووە ئەگەری تورەیی‌و دوردۆنگی هۆلاکۆ و وروژاندنی رق و کینەی کۆنی بەرامبەری و یەکسەر فەرماندەیەکی بە نێوی کیتوبوقا راسپاردو بە سێ هەزار چەکداری مەغۆلەوە ناردیە سەر میر حوسامەدین، لە ئەنجامدا میرو هەموو چەکداران و ولایەنگران و دارودەستەی بە فرمانی هۆلاکۆ بە کوشتچوون و زۆربەی باژێر و قەلاو شورا و پێگاکانی کاولکران[٥٨]، تەنانەت شاری مەزن ودێرینی حەلوانیش لە وێرانکردن وخرابکاری دەرباز نەبوو[٥٩] .

**٥- میر سەعد کوڕی حوسامەدین (٦٥٥ – ٦٥٦ك/ ١٢٥٧ – ١٢٥٨ز)**

میر سەعد پاش کوژرانی باوکی و کاولکردن و روخاندنی قەلاکانی دەرتەنگ، خۆی نەدا بە دەستەوەو لە قەلایەك لەگەڵ چەکداران ویاوەرانی خۆی تونـد قایم کرد، بە پێچەوانەی باوکی بە پەیمانی ساختە و بەلێنی درۆی هۆلاکۆ و فەرماندەکانی، چارەنووسی خۆی تەسلیم نەکردن و بەفرۆفێل و تەلەکەبازیان فریوی نەخوارد و لە چیاکان درێژەی بە بەرهەلستیدا، چەند ترساندیان و هەڕەشەیان لێکرد تا دەسخەرۆی بکەن وبیخەنە داوەوە و قەلاکەیان تەسلیم بکات، کەچی پێی دەگوتن ((پەیمان و بەلێنتان درۆیە و باوەڕی پێناکەم))[٦٠] .

میرسەعد ماوەیەك لە چیاکانی حەلوان و دەرتەنگ مایەوە و پاشان رویکردە بەغدا و خەلیفە بەگەرمی پێشوازی لێکرد و ڕێزی لێگرت و لە جێگەی باوکی داینا، تا لە سالی ٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز لە سەروبەندی داگیرکردنی بەغدا بەدەستی مەغۆلەکان کوژرا[٦١] .

**٦- میر محەمەد (نزیکەی سالی ٧٠٠ك/ ١٣٠٠ز)**

دەسەلاتی خێلەکی گۆران لە دەرتەنگ و حەلوان وماهیدەشت تا پاش داگیرکردنی بەغدا و لە ناوچوونی خیلافەی عەباسی هەر بەردەوام بوو، پەلامارو شالاوە کوشندەکانی مەغولْ بۆ سەر دەڤەرەکە هەر چەند جەرگبڕ زیانبەخش و خۆیناوی بوون و زیانی گیانی و مالی زۆریان

لێکەوتەوە و وزەو توانـاو نفـووزی هـۆزە کوردەکـانی کـزو سـنووردارکرد، وەڵ سـەرانی گـۆران و هۆزەکانی تری کوردستان لەو نسکۆیە هەڵسانەوە دەستیان گرتەوە بەسەر قـەلاًو بارەگاکانیانـدا، عومەری (العمري) لە میانی ئاخافتنی لە مەڕ هۆزەکـانی کوردستان (جبـال الاکـراد) ئامـاژە بـۆ دوو خێڵی دەسەلاًتداری هۆزی گۆران دەکات :

– خێڵێك لە (دیاوەشت — ئەندەشت — رەندەشـت)[٦٢] ی مـیر محـەمـەد لـە چـیاکانی هەمەدان و شارەزور، کەمیرێکی تایبەت بە خۆیان هەیە ((لهم امیر یخصهم)) .

– خێڵێکی دی لە دەرتەنگ، ئەمانیش میرێکی تایبەت بە خۆیان هەیـەو نـاوی ئـەمیش هەر میر محەمەدە، چەکدارانی هەردوو خێڵەکە پتر لە پێنج هەزار کەس بوون[٦٣] .

هیچ هەواڵ سۆراخێکی میر محەمەد لە سەرچاوەکاندا بـەدی ناکرێـت، نازانرێـت ئایـا هەر لە بنەماڵەی میر حوسامەدین عەکەیە یان نـا؟ وکـەی دەسـت بـەکار بـووە و کـەی کۆچـی دوایی کردەوە وکێ جێگەی گرتۆتەوە؟ لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین جەخت لـە سـەر ئـەوە بکـەین کە دەرتەنگ بە هەموو قەلاًو شورایەکانیەوە هەردەم لەلایەن پیاوانی گۆرانـەوە بـەڕیوە دەبـرا کـە تەنها ناوی یەکێکیان بۆ ئێمە ئاشکرایە ئەویش:

٧– میر عەبدولاًی کوڕی حوسامەدین سالارە (رسلان) کە پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتی مەمملوکی لە میسر گرێدا بوو و لەلایەن سوڵتانی مەملوکیەوە بـە خـودانی مایيدەشـت (صـاحب رندشت) دەناسراوو مامەڵەی لەگەڵ دەکرا[٦٤]. ماوەتەو بلێین لەوانەیە میر عەبـدولاً نـەوەی مـیر حوسـامەدین عەکـە بێـت، بـە واتـای لـەوە دەچـێت پەیوەندییـەکی خزمایـەتی لـە نێـوان حوسامەدینی باوکی میر عەبدوللاو حوسامەدین عەکە هەبێت.

هەرچەند میرانی گوران پەیوەندییان نەکرد بە پادشاکانی ئەیوبیەوە بە بەڵگـەی ئـەوەی دەنگ ورەنگیان لە مێژووی ئەیوبیدا نادیارە، بەلاًم لە ئاکامی پەلامار و لەشکرکێشێکانی مەغولدا هندێکیان دەربەدەری شـام و میـسر بـوون و لەسـەر دەمـی مەملوکیـدا رول و پـشکداری خویـان هەبوو، لەنێو میرە کوردەکانی سەرەتای دەولەتی مەملوکی ناوی میر عززەدینی گـورانی بەرچـاو دەکەویت[٦٥].

له لایەکی ترەوە، لە دوماهیکی سەردەمی عەباسی و سەرەتای رۆژگاری مەغۆل، لە پاڵ سەرداریێتی خێڵەکی گۆران، مەشێخەیەکی ئایینی لە ناوچەکە دەرکەوت و رەگی داکوتا، شێخ فەخرەدین ئیبراهیم کوڕی میکائیل کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی (فخرالدين ابو محمد ابراهيم بن ميكائيل بن اسماعيل بن علي العثماني شيخ الجبال) کە خۆی بەنەوەی خەلیفەی راشیدی سێهەم عوسمانی کوڕی عەفان دادەنا، توانی جێگەی خۆی لە ناو دانیشتوانی حەلوان و دەرتەنگ و پاوە بکاتەوە و نفوزێکی روحی بەهێزو بەربڵاو لە ناو خێل وتیرەکانی گۆران پەیدابکات و خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبونەوە و بڕوایان بەکەشف کەراماتی هێنا، گەلێ موریدو تۆبەکارو دەروێش و خەرقەپۆشی لە ناوچەکە هەبوو، پاش شێخ فەخرەدین کوڕەکەی قوتبەدین میکائیل بووە جێنشینیو درێژەی بەرێبازەکەیدا، شێخ قوتبەدین لە ساڵی ٧١٠ك/ ١٣١٠ز سەردانی بەغدای کرد و چاوی بە مێژوونوس (ابن الفوطي) کەوت، ئەمیش شەچەرەی بنەماڵەکەیانی بۆ نوسییەوە[٦٦].

**سێهەم: رۆڵی زانستی وروشنبیری گۆران**

**أ- لەوڵاتی چیا وعیراق (بلاد الجبال و العراق العربي)**

سەرەڕای رۆڵی سیاسی و سەربازی هۆزی گۆران لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە بواری روشەنبیری و زانستی ئایینیدا رۆڵ و بایەخی کەم نییە و ژمارەیەك کەسایەتی ناودار و زانای ئایینی تیادا هەڵکەوتووە لە مامۆستا و فەقێ و خوتبەخوێن و صۆفی و خواپەرست و زاهیدو شارەزایانی زانستەکانی قورئان و حەدیث کە جێ پەنجەیان دیارە لە خزمەتکردنی ئایین و رۆشنبیری ئیسلامیدا[٦٧] .

پێویستە بڵێین کە زانیارییەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە سەبارەت بە بزاڤی زانستی و رۆشنبیری گۆرانەکان و هیچ دەنگوباسێك لە سەرچاوەکاندا بەرچاو ناکەوێت دەربارەی مزگەوت و قوتابخانە و خوێندنگا لە وڵاتی گۆراندا، بویە ئێمە لێرە تەنها لە مەڕ ئەر ناودارانە دەدوێن وا لەو سەردەمە ژیاون کە ئەم تۆژینەوەیە دەیگرێتەوە.

**١– ئەبو عەبدولاّ حوسێن كوڕی ئیبراهیم كوڕی حوسێن كوڕی جەعفەری جۆرەقانی (گـۆرانی) (؟ – ٥٤٣ك/ ١١٤٨ز)**

زانای ئایینی و موحەدیث و قورئانخوێن و فەقیهی حەنـەفی ئـەبو عەبـدولاّی گـۆرانی یەكێكـە لـە شـارەزا بـە ناوبانگـەكانی زانـستەكانی حـەدیث لەسـەدەی شەشـەمی كۆچـی/ دوازدەهەمی زایینی، ناو و ناودەنگی هۆزی گۆران لەم سـەدەیەدا تـا ڕادەیـەكی دوور پەیوەسـتە بەم زانا مەزنەوە، تەنانەت (ابن الاثیر) و (یاقوت الحموي) بەهۆی ئەمەوە پێناسەی هۆزی گۆرانیان كردوە[٦٨]، مێژوونوس (الذهبي) بـە ((ئیمـام وحـافزی قورئـان و ڕەخنـەگر)) وەسـفی كردوە، وەلێ بەهەڵەدا چووە لەوەی كە بەخەڵكی گوند یان ناحیـەی جورەقـانی لای هەمـەدانی داناوە[٦٩].

ئـەبو عەبـدولاّی گـۆرانی لـە سەردەسـتی ژمارەیـەك مامۆسـتاو زانـا و موحـەدیث زانستەكانی حەدیثی خوێندوە و حەدیثی گێڕاوەتەوە لەوانە:–

١– عبدالرحمن بن حمد الدوني، كە مەزنترین و ناودارترین مامۆستای بووە .
٢– یحیى بن احمد الغضائري .
٣- محمد بن طاهر المقدسي .
٤- اسماعیل بن أبي صالح المؤذن .
٥- شیرویه بن شهردار الدیلمي .
٦- أحمد بن عباد البروجردي .
٧- ابو زكریا یحیى بن منده .
٨- عبدالملك بن بنجیر .
٩- حمد بن نصر[٧٠] .

ئـەبو عەبـدولاّی گـۆرانی كتێبێكـی بـەنێوی (الاباطیل) یـان (الموضـوعات مـن الاحادیث المرفوعات) داناوە دەربارەی حەدیسە هەڵبەسـتراوەكان (الاحادیث الموضـوعة) وتیایدا بە بەڵگەو ئیـسنادەوە و بـە بـەراورد لەگـەڵ حەدیـسە ڕاسـتەقینەكان، حەدیـسە هەڵبـە ستراوەكانی دەستنیشانكردوە و ناوەڕۆكیانی ڕەتكردۆتەوە، هەندێك شارەزا دەربارەی ئـەم كتێبـە گوتویانە ئەبو عەبدولاّ ((باشی بۆ چووە))، هەروەها (ابـن الجـوزي) (٥١٠ – ٥٩٨ك/ ١١١٦ – ١٢٠١ز) لەسـەر بنـەمای ئـەم كتێبـە كتێبێكـی بـە نێونیـشانی (الموضـوعات)ەوە دانـاوە و

مێـژوونوس (الـذهبي) خوێندویەتـەوە و سـودی لێبینیـوە، هـەر چـەند لەگـەڵ هـەموو را و بۆچوونەکانی ئەبو عەبدولاّی گۆرانی کۆك نییە[٧١].

دانەیەك لەم کتێبە هەیە لـە نامەخانـەی شیـستەربتی بـە ژمـارە (٥٠٧٩) و دانەیـەکی تریش لە پەرتوکخانەی ئەزهەریە پارێزراوە[٧٢]، جگـە لـەم کتێبـە کتێبێکـی تـری بەناونیـشانی (التكليف في الفـروع) دانـاوە [٧٣] ئـەبو عەبـدولاّی گـۆرانی لـە هـەیڤی رەجـەبی سـاڵی ٥٤٣ك/ ١١٤٨ز کۆچی دوایی کردوە [٧٤] .

**ب– لە ولاتی شام و میسر**

بـە ئەگـەری پـەلامارو شـالاّوە کوشـندەکانی مـەغول و ئـەو کوشـتوبڕ و تالاّنکردنـەی ئەنجامیاندا، چەندین هۆز و تیرە و بنەماڵەی کـورد ولاّتیـان بـە جێهێـشت و خۆیـان گەیانـدە پاشاکانی ماڵباتی ئەیوبیەوە لە شام و میسر[٧٥]، پێـشتریش هـەر لەگـەڵ دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئـەیوبی لەلایـەن سـوڵتان سـەلاحەدینەوە، پـەیتا پـەیتا مـەلا و فـەقێ و مـیرزا و قوتـابی و خوێندەوانی کورد لە شار و بـاژێر و گونـد و دێهاتـەکانی کوردسـتانەوە بـۆ خوێنـدن و فێربـوون رێگەی ولاّتی شام و میسریان گرتەبەر و لە شارەکانی حەلەب، دیمەشـق، قـاهیرە و شـارەکانی تر جێگیربوون و لـە بەردەسـتی گـەورە مامۆسـتایان و زانایـان، درێـژەیان بەخوێندنـدا، پاشـان ژمارەیەکیان بوون بە پێشنوێژو ئیمام و مامۆسـتا و خوتبـەخوێن و لـە مزگـەوت و قوتابخانـەکان دادەمزران[٧٦]، دەبێ ئەوەش بڵێین کە هەندێ لەو مزگەوت و قوتابخانەو خوێندنگایانـە لەلایـەن پادشاکانی ئەیوبیو میرو سەرکردە کوردەکانی نێو سوپای ئەیوبییـەوە بنیـاتنرابوون[٧٧]، بێگومـان رێژەیەکی ئاوارەو پەراگەندەکان و ژمارەیەك لەو قوتابیانەی بۆ خوێندن روویانکردبوە ولاّتی شـام و میسر لە هۆزی گۆران بوون، بۆیە دەبینین چەندین ناوداری ئەم هۆزە بەرچاو دەکەون :

**١- شێخ ئیسماعیل کوڕی عەلی گۆرانی (؟ – ٦٤٤ك/ ١٢٤٦ز)**

شێخ ئیسماعیلی گۆرانی صۆفی و زاهیدو پیاوچاکێکی کوردی پەرێوەی ولاّتی شام بـوو، نیشتەجێی شـاری دیمەشـق بـوو، بەخواناسـی و لـەخۆ بـوردوویی و هەقبەرسـتی وراسـتگۆیی ناودەنگی رۆیشتبوو، لەلایەن هەموانەوە رێزی لێدەگیرا وقسەی دەبیسترا، پادشایان و مـیران و

وەزیران سەردانیان دەکرد، ئـەمیش هـەردەم ئامۆژگـاری دەکـردن کـە ئیمانـدار و دادپـەروەر و لەخواترس بن و لەکاتی پێویستدا سەرزەنشتی دەکردن[٧٨].

جارێکیان (ابو الحسن المتطبب السامري) وەزیری مەلیك سالحێ ئـەیوبی (٦٣٧ – ٦٤٧ك/ ١٢٣٩ – ١٢٤٩ز) کە جوولەکە بوو و بڕوای بە ئـاییینی ئیسلام هێنـابوو سـەری لـە شێخ ئیسماعیل گۆرانیدا، شێخ پێی گوت ((تۆ ئەگەر لەسەر ئاییینی خۆت مابای چـاکتر بـوو، چـۆنکە دەبـوو پـەیڕەوی بکـەیت، کەچـی ئێـستا لـە هـەردوولا بویـت، نەجولەکـەی نـە موسلمان))[٧٩].

شێخ ئیسماعیلی گۆرانی لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٤٤ك/ ١٢٤٦ز لـە دیمەشـق کۆچـی دوایی کرد و لە گۆرستانی صۆفییەکان نێژرا[٨٠].

**٣- عیمادەدین ئەبو بەکر کوڕی محەمەد کوڕی حەسەنی گۆرانی ( ؟ – ٦٥٨ك/ ١٢٦٠ز)**

زانیـاری لەسـەر ژیـان وپلـەی زانـستی عیمـادەدین زۆر کەمـە، ئەوەنـدە دەزانرێـت لـە سەرەتای ساڵی ٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز بە مامۆستا دامەزرا لە قوتابخانەی (الرواحية) [٨١] لـە شـاری حەلەب و لەسەر کارەکەی بەردەوامبوو تا لە کارەساتی داگیر کردنی حەلەب لەلایەن مەغۆلەوە لە ساڵی ٦٥٨ك/ ١٢٥٨ز کوژرا[٨٢].

**٤- شێخ ئیسماعیل کوڕی محەمەد کوڕی خەسرەوی گۆرانی (؟ – ٦٦٥ك/ ١٢٦٧ز)**

شێخ ئیسماعیلی گۆرانی پیاوێکی لە خواترس و ئیمانداربوو، لە ژیانی دنیایی دابڕابوو و خۆی تەرخانکردبوو بۆ خواپەرستی و عیبادەت و دینداری، سەرجەمی ژیـانی لـە خەلۆەتگـەدا دەگوزەراند، زاهیدو پیاوچـاکێکی ناسـراو بـوو لـە میـسرو شـام، لـە جـل پۆشـین و خـواردن و خواردنەوەدا پابەندی و پەیڕەوی شەریعەتی دەکرد و لەمبارەیەوە هەرگاڤ پرسیاری لـە زانایـانی ئاییینی دەکرد، مێژوونوس یونینی (اليونيني) لە بارەیەوە دەڵێت ((لە سەردەمی خۆیدا نموونـەی کەمبوو))[٨٣] .

شێخ ئیسماعیلی گۆرانی لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦٦٥ك/١٢٦٧ز لە شاری غەزە کوچـی داوایی کرد، کاتێك لـە میـسرەوە دەگەڕایـەوە بـەرەو شـاری قـودس، هـەر لـە غـەزە بـە خـاك سپێردرا[٨٤].

ئەوەندە ماوەتەوە بلێین دوور نییە شێخ ئیسماعیلی کوڕی محەمەد کوڕی خەسرەو هەر لە بنەماڵەی میر مەکلوای کوڕی خەسرەو بێت .

**٥- محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی بەهرامی گۆڕانی (٦٢٥ - ٧٠٥ك/ ١٢٢٨ - ١٣٠٥ز)**

فەقیهی شافعی و خوتبەخوێن و قورئانخوێن و قازی و پێشنوێژ و مامۆستا و موفتی ناسراو محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی بەهرامی گۆڕانی لە ساڵی ٦٢٥ك/ ١٢٢٨ز لە دایکبووە، بۆ خوێندن و خۆپێگەیاندن چۆتە مەدینە و حەلەب و دیمەشق و زۆربەی شارەکانی حیجاز و شام ومیسر گەڕاوە و لە قوتابخانەکان و مزگەوتەکانی ئەم هەرێمانە خوێندویەتی، شارەزایەکی تەواوی مەزهەبی شافیعی بوو، ماوەیەك لە قوتابخانەکانی دیمەشق دەرسی دەگوتەوە، پاشان سەردەمانێکی درێژ قازی شاری حەلەب بوو، تەنها بەهۆی ناکۆکییەوە لەگەڵ قەراسەنقەری حاکمی حەلەب لە قازێتی خراوە، کەچی تامردنی لە ساڵی ٧٠٥ك/ ١٣٠٥ز هەر خوتبەخوێن و موفتی حەلەب بوو، هەروەها محەمەدی گۆڕانی کتێبی (مختصر في الخلاف)ی داناوە [٨٥] .

**٦- شەهابەدین داود کوڕی سلیمان کوڕی داودی گۆڕانی (؟ - ٧٣٠ك/ ١٣٣٠ز)**

شێخ شەهابەدین گۆڕانی پیاوێکی خواناس و زانست پەروەرو ئەدەبدۆست و فەقێهێکی شارەزا بوو لە فیقهی شافیعی، ماوەیەك لە قوتابخانەی (الشامیة البرانیة) لە دیمەشق کاریکردوە، پاشان روویکردۆتە شاری سەڵت و تیایدا جێگیربووە و لە قوتابخانەی (السیفیة) دەرسی گوتۆتەوە، لەگەڵ هۆزی کوردی قەیمەری خزمایەتی کردوەو هاوژینەکەی خوشکی میر جەمالەدین یوسف کوڕی عیسای قەیمەری بوو، لە مانگی (جمادي الاخرە) ساڵی ٧٣٠ك/ ١٣٢٩ز لە شاری سەڵت کۆچیدواییکرد و لە مزگەوتی شارەکە پاش خوتبەی رۆژی هەینی نوێژی لەسەر کراو بە خاك سپێردرا [٨٦] .

## ئەنجام

١- گۆران لە سەدەکانی ناوەراستدا، یەکێك بوو لە هۆزە مەزن ودێرینەکانی کورد، هەر لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچییەوە بەردەوام ناو و دەنگوباسی تۆمارکراوەو شایەنی ئەوەیە بکرێتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی .

٢- لە نیوەی دووهەمی سەدەی شەشەمی کۆچییەوە سەردارانی گۆران بە دەستوری هۆزە مەزن وبەهێزەکانی تری کوردستان دەسەلاتێکی خێڵەکییان دامەزراندو کاروباری سیاسی و کارگیری و دارایی چەندین باژێرو شارۆچکە و قەلاو گوندیان بەڕیوەدەبردو باژێری دەرتەنگیان کردە پایتەخت و بارەگای خۆیان و هەندێکیان وەك میرێکی سەربەخۆ هەڵسوکەوتیان دەکرد .

٣- شالاوو پەلامارەکانی مەغول کە ولاتی شارەزورو وزێد و ناوچەی گۆران و هەموو هەرێمەکانی کوردستانی گرتەوە و بوە ئەگەری هەڵکەندن و دەربەدەربوونی دەیان ئێل و ماڵبات و ینەماڵەی کورد بە گۆرانەوە و ئاوارە بوونیان بۆ ولاتی شام و میسر، بەلام لەگەڵ ئەم راستیەشدا دوو خێڵی گۆران لە دەڤەرەکانی دەرتەنگ و ماهیدەشت درێژیان بە دەسەلاتی سیاسی خۆیاندا .

٤- پاش دامەزراندنی دەولەتی ئەیوبی و دواتریش بەهۆی هێرش و پەلامارەکانی مەغول ژمارەیەکی بەرچاو لە قوتابیو خویندەوارو روشنبیرو مەلاو میرزای کورد کۆچیان کرد بۆ شام و میسر کەرێژەیەکیان لە هۆزی گۆران بوون و تیایاندا ژمارەیەك فەقیە و قازی و سۆفی و پیاوچاك هەڵکەوتن و ناو دەنگیان دەرکرد و ژیانی خۆیان تەرخانکرد بۆ خزمەتکردنی ئایین و زانست .

**– پەراوێزەکان**

1) V.V. Minorisky, The Guran, Bulletin of the School of Oriental and African Stadies, Vol.Xl 1934, PP75-103 .

٢) بەرێز ناجی عەباس ئەم لێکۆلینەوەیەی وەرگێراوەتە سەر کوردیو لە ژمارەکانی (٥–٩)ی ساڵی پێنجەم (١٩٤٤)ی گوڤاری گەلاوێژ بلاۆیکردۆتەوە، هەروەها رێزدار ئەنوەری سولتانی جارێکیتر وەریگێراوە و لە گەڵ چەند ڤەکولینێکیتری مینورسکی لە کتێبێکدا بلاویکردۆتەوە، بروانە :

مینۆرسکی و کورد (هەولیر ٢٠٠٢)، ل٨٣–١٥٦ .

٣) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٥) ساڵی ١٩٤٤، ل٢ .

٤) هەمان سەرچاوە، ل ٣–٤ .

٥) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٧) ل٤–٦ .

٦) بڕوانە پەراویزی (٨) و (١٠) .

٧) شرفخان البدليسي، شرفنامه، الترجمة العربية محمد جميل الروژبياني،ط٢ (اربيل ٢٠٠٢)، ص٥٠ .

٨) المسعودي، مروج الذهب (بيروت ١٩٧٣)، ١٢٤/٢، التنبية والاشراف (بيروت ١٩٨١)، ص٩٤، ياقوت الحموي، معجم البلدان (بيروت ١٩٧٧)، ١٨٤/٢، ابن الاثير، الكامل في التاريخ (بيروت ١٩٧٨)، ٢٧٣/٧، ٣٢٥، ٣٢٧، ٤١/٨، ٣٨٥/٩، اللباب في تهذيب الانساب (مكتبة المثنى، بغداد)، ٣٠٧/١، ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار بني ايوب (القاهرة ١٩٧٢)، ٣٢٨/٤ ، الذهبي، تذكرة الحفاظ (بيروت ١٩٥٦)، ١٣٠٨/٤، سير اعلام النبلاء (بيروت ١٩٩٧) ١٦/١٥.

٩) مجمل التواريخ والقصص، تصحيح ملك الشعراء محمد تقي بهار (تهران ١٣١٨هـ.ش)، ص٣٩٩-٤٠١، حسام الدين علي غالب النقشبندي، الكرد في الدينور وشهرزور (نامەی ماستەر)، جامعة بغداد (بغداد ١٩٧٥)، ص،١٦٧،٩٥ .

١٠) ابن فضل الله العمري، مسالك الابصار وممالك الامصار (دەستنوس)، ١٢٥/٣، القلقشندي، صبح الاعشى (بيروت ١٩٨٧)، ٣٧٣/٤، ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة (القاهرة ١٩٦٩ - ١٩٧٢)، ٣٥٧/٦، ٢١/٧، السخاوي، الضوء اللامع لاهل القرن التاسع (بيروت [د.ت]) ٢٤١/١، ٢١٣/٢، ٢٥٦/٣، السلوك لمعرفة دول الملوك، (القاهرة ١٩٥٦)، ٤/١ .

١١) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٥) ساڵی ١٩٤٤،ل٧–٨.

١٢) مروج الذهب ، ١٢٢/٢، شرفنامه، ص٥٠.

١٣) مروج الذهب، ١٢٤/٢، التنبيه والاشراف، ص٩٤ .

١٤) المسالك والممالك (بيروت ١٩٨٨)، ص٢٧،مختصر كتاب البلدان (بيروت ١٩٨٨)، ص٢٦٦، الجابارقة بۆتە الجابادق .

١٥) التنبيه والاشراف، ص٩٤، مروج الذهب، ١٢٤/٢ .

١٦) معجم البلدان، ١٨٤/٢، الكامل، ٣٢٥/٧، ٣٢٧، ٢١/٨، اللباب في تهذيب الانساب، ٣٧٠/١، مسالك الابصار، ١٢٥/٣ .

١٧) الضوء اللامع، ٢٤١/١ .

١٨) السلوك، ٤/١ .

١٩) السمعاني، الانساب (بيروت ١٩٩٨)، ١١٤/٢، معجم البلدان، ١٨٤/٢، الكامل ٢٧٣/٧، .

٢٠) حەلوان و فەرمانڕەوایانی لە مێژوودا، بەشی یەکەم، گۆڤاری کـاروان، ژمـارە (٢١)، حـوزەیران ١٩٨٦، ل١٨ .

٢١) مروج الذهب، ١٢٤/٢، دکتور حوسامەدین نەقشبەندی گومان لە راستی ئـەم ئاخافتنـەی مەسعودی دەکات و بـە هەڵـەی لـە قەڵـەم دەدات چـونکە کەسـیتر شـتی وای بـاس نـەکردووە، الكرد فـي الدينور، ص٩٥ .

٢٢) ابن الاثير، الكامل، ٣٨٥/٩، ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٢٨/٤ .

٢٣) شرفنامة، ل٤٤، ٥٥٢.

٢٤) الكامل، ٣٢٥/٧ .

٢٥) هەمان سەرچاوە، ١٨/٨ .

٢٦) مسالك الابصار، ١٢٥/٣ .

٢٧) شرفنامة، ص٥٥١ .

٢٨) دەربارەی هەموو ئەم بنەماڵەو کەسایەتیانە بڕوانـە: الکامـل، ٣٧/٧، ٢٣٢، ٢٧٢، النقـشبندي، الكرد في الدينوروشهرزور، ص١١٦–٢٢٨.

٢٩) الكرد في الدينور وشهرزور، ص٢٧٢ .

٣٠) الكامل، ٢٣٢/٧-٢٣٣، ٢٤٧ .

٣١) دەرتەنگ هەر لەسەدەمی مەغۆلەکانەوە بەو ولایەتە دەگوترا کە لەسەر دەمی ئیسلامی بە حـەلوان دەناسرا، پاش خراپ بوونی حەلوان، دەرتەنگ جێگەی گرتـەوە کـە دەکەوێتـە نزیـك شـاری زەهـاو و ڕوبـاری ئەلوەند پێیـدا دەڕوا، مەڵبەنـدی دەڤـەری دەرتـەنگ شارۆچـکەی (ڕێـژاوە). شـرفنامە، ص٥٣٧، ٤٣، محەمـەد جەمیل ڕۆژبەیانی، مێژوو حەلوان، گۆڤاری کاروان ژمارە (٢٢) تەمموز ١٩٨٤، ل١٤ .

٣٢) ابـن الـساعي الخـازن، الجـامع المختـصر،جـ٩ (بغـداد ١٩٣٤)، ص١٥، ابـن الفوطي، مجمع الآداب، ١٨١/١.

٣٣) مؤلف مجهول، مجمل التواريخ والقصص، ص٣٩٩-٤٠١، الكامل، ٢٧٣/٧ .

٣٤) الكامل، ٣٢٥/٧ .

٣٥) هەمان سەرچاوە، ٣٢٥/٧ .

٣٦) هەمان سەرچاوە، ٣٢٨/٧ .

٣٧) هەمان سەرچاوە، ٢/٨ .

٣٨) بەدروستی نازانرێت شارۆچکەی خولنجـان و قـەڵای ئەرنەبـە دەکەونـە کوێـوە، سـەبارەت بـە خولنجان سەرچاوە جوگرافیەکان زانیاری وورد نادەن بەدەستەوە ولەگەڵ یەکترا ناکۆکن، قەڵای ئەرنەبەش لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا ناوی نەهاتووە بڕوانە: النقشبندي، الكرد في الدينوروشهرزور، ص٢١٤.

٣٩) شەرەفخانی بەدلیسی دەگێڕێتەوە کە میر (ابو الشوك) توانی لە ساڵی ٤٢١ك/١٠٣٠ز دەستبگرێت بەسەر شاری (قوما)دا. شرفنامە،ص١٢٠. نەقشبەندی پیێ وایە مەبەست لە قوما (قرمسین)ە واتا کرماشان، الكرد في الدينور، ص٢١٢،کەچی ڕۆژبەیانی وەرگیری شەرفنامە پیێ وایە مەبەست لە قوما شاری (قومس)ە، شرفنامە،ص١٢٠، پەراویزی (٣٢).

٤٠) الكامل، ١٨/٨ .

٤١) هەمان سەرچاوە، ٤١/٨ .

٤٢) هەمان سەرچاوە ٣٦٨/٨، ٦٦/٩، ابن **الفوطي**، معجم الاداب، ١٥٤/١–١٥٥، ٥١٥/٢ . سەبارەت بەم بابەتە بڕوانە: نیشتمان بشیر محمد، الكرد والسلاجقة (نامەی دکتورا)، جامعە صلاح الدين (اربيل ٢٠٠٠)، ص ٥٠–٧٧،٦٠–٩٢، ١٨٦–١٨٧ .

٤٣) الكامل، ٣٦٨/٨، ٣٠٧/٩، ابن الساعي الخازن، الجامع المختصر، ١٣٠/٩، ٢٦٤، ابن الفوطي، مجمع الاداب، ١٥٤/١-١٥٥، ٥١٥/٢ .

٤٤) الكامل، ٣١/٩.

٤٥) مجمع الاداب، ١٨١/١ .

٤٦) الجامع المختصر، ١٥/٩ .

٤٧) مجمع الآداب، ٣٢٦/٤ .

٤٨) لە ناویاندا بەبۆچوونی ئیمە دوانیان وەك لە ناوەکانیانەوە دیارە لەوە دەچن لە میرانی گۆران بن :

١- میر عەلەمەدین وەردەسار کوڕی بەیامی کورد، کە یەکێك بوو لە میرە ناودار و کەسایەتیە سیاسیەکانی کورد، ناوبانگی بە چاکە و پیاوەتی و دلێری دەرکرد بوو (مجمع الاداب،٥٩٩/١) .

٢- میر عیمادەدین ئەسفەندیار کوڕی عەلی کوڕی جەنگەی کورد (مجمع الاداب، ٣٣/٢) .

٤٩) عەکە لەوانەیە عەلەکە بێت کە داتاشراوی ناوی (علي)ە لەلایەن ئەو کەسانەی کە کتێبی (جامع التواريخ) یان نوسیوەتەوە شێوێنرابێت .

٥٠) مؤلف مجهول، كتاب الحوادث (بيروت ١٩٩٧)، ص٤٨-٥١، ١٣٨-١٣٩، ٢٨٥-٢٨٦، ٣٠٤، رشيد الدين فضل الله الهمداني، جامع التواريخ (وەرگێڕاوی عەرەبی) (القاهرة ١٩٦٠)، ٢٧٧/١/٢- ٢٨٥.

٥١) ابن الاثير، الكامل، ٣٨٥/٩- ٣٨٦ .

٥٢) كتاب الحوادث، ص٣٠٤ .

٥٣) جامع التواريخ، ٢٨١/١/٢-٢٨٢ .

٥٤) هەمان سەرچاوە، ٢٧٧/١/٢، هەروەها بڕوانە: عباس العزاوي، العراق بين الاحتلالين (طهران ١٤١٠هـ)، ١٦٢/١-١٦٤ .

٥٥) مورج: دیاره مەبەست (مرج القلعة)یەکە قەلاّیەکی مەزنە و دەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوی سەخت و تووش لەسەر ڕێگەی حەلوان – کرماشان لە ناوچەیەکی مەترسیدار بەهۆی کوردەکانەوە .
ابن روستة، الاعلاق النفیسة (بیروت ١٩٨٨)، ص١٥٥ .
٥٦) جامع التواریخ، ٢٧٧/١/٢.
٥٧) هەمان سەرچاوە، ٢٧٨/١/٢ .
٥٨) هەمان سەرچاوە ٢٧٨/١/٢، العراق بین الاحتلالین، ١٦٣/١ .
٥٩) القزوینی، آثار البلاد واخبار العباد (بیروت ١٩٦٠)، ص٣٥٧، حمد الله المستوفي القزویني، نزهة القلوب (طهران ١٣٣٦هـ.ش)، ص٤٢ .
٦٠) جامع التواریخ، ٢٧٨/١/٢ .
٦١) هەمان سەرچاوە، ٢٧٨/١/٢، العراق بین الاحتلالین، ١٦٣/١ .
٦٢) ناوی ئەم شارە لە دەستنوسی سەرچاوە مەملوکیەکاندا بە شێوەی جیاواز هاتووە بەمجۆرە، لە (مسالك الابصار،١٢٥/٣)، دیاوشت، لە کتێبی (صبح الاعشی)بەم شێوانە هاتووە: دیاوشت (٣٧٣/٤)، اندشت (٣٧٩/٤)، رندشت (٣٠٩/٧)، بەرای ئێمە مەبەست باژیری ماهیدەشتە.
٦٣) مسالك الابصار، ١٢٥/٣، قەلقەشەندی کە هەموو زانیارییەکانی کتێبی (مسالك الابصار) سەبارەت بەکوردستان (جبال الاکراد) هێناوەتە نیو کتێبەکەی خۆیەوە و هەندێ دەستکاری ئاخافتنی عومەری (العمري) کردوە بۆ نمونە عومەری دەڵێت ((عدة القوم تزید علی خمسة الاف)) کە چی ئەم دەڵێت ((والطائفتان جمیعا لاتزید عدتهم علی خمسة الاف رجل))، صبح الاعشی، ٣٧٣/٤ .
٦٤) صبح الاعشی، ٣٠٩/٧ .
٦٥) المقریزي، السلوك، ٦٧٢/١، ٧٣٦.
٦٦) ابن الفوطي، مجمع الاداب، ٥٢٣/٢-٥٢٤، ٤٤٨/٣-٤٤٩ .
٦٧) کەسایەتیە زانستی وسیاسییە ناودارەکانی هۆزی گۆران لە ولاتی شام و میسر پتر لە سەدەکانی هەشتەم و نویەمی کوچی ودواتر دەرکەوتن، بڕوانە: السخاوي، الضوء اللامع لاهل القرن التاسع، ١٧٨/١، ٢٤١-٢٤٣، ٢١٣/٢، ٢٤٧، ٢٥٢، ٢٥٦/٣، ٢٧/٦-٢٨، ٣٢/٢٥٢،١٠-٣٣... هتد، خیرالدین الزرکلي، قاموس الاعلام (بیروت١٩٨٠)، ٢٤٠/٨ .
٦٨) اللباب في تهذیب الانساب، ٣٠٧/١، معجم البلدان، ١٨٤/٢ .
٦٩) تذکرة الحفاظ، ١٣٠٨/٤، سیر أعلام النبلاء، ١٦/١٥-١٧ .
٧٠) هەمان دوو سەرچاوە .
٧١) هەمان دوو سەرچاوە، اسماعیل باشا البغدادي البابانی، هدیة العارفین (بیروت١٩٩٠)، ٣١٣/١ .
٧٢) قاموس الاعلام، ٢٢٩/٢-٢٣٠ .
٧٣) هدیة العارفین، ٣١٣/١ .

٧٤) تذكرة الحفاظ، ١٣٠٨/٤، هدية العارفين، ٣١٣/١، قاموس الاعلام، ٢٢٩/٢-٢٣٠ .
٧٥) المقريزي، السلوك، ٤/١ .
٧٦) ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة،جـ١ (دمشق ١٩٩١) ص٢٤٦، ٢٥٠، ٢٥٤-٢٥٧، ٢٦١، ٢٧٧،٢٨٢ .
٧٧) هەمان سەرچاوە، ١٩٨/١-٢١٥، ٢٥٩-٢٦٠، ٢٦٢، المنذري، التكملة لوفيات النقلة (بيروت ١٩٨٨)، ٦٩٥/١، ١٦٢/٢-١٦٣ .
٧٨) الذهبي، العبر في خبر من غبر (بيروت د/ت)،٢٥١/٣، اليافعي، مرآة الجنان (بيروت ١٩٩٧)، ٨٧/٤ .
٧٩) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، جـ٨ (حيدر آباد الدكن ١٩٥١-١٩٥٢)، ص٧٨٤، ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٢١/٧-٢٢ .
٨٠) العبر في خبر من غبر، ٢٥١/٣، النجوم الزاهرة، ٣٥٧/٦ .
٨١) قوتابخانەی رەواحی (الرواحية) لە لایەن (زكي الدين ابو القاسم هبة الله بن محمد بن عبدالواحد الحموي)یەوە لە شاری حەلەب بنیاتنراوە ابن شداد، الاعلاق الخطيرة، ٢٥٥/١ .
٨٢) الاعلاق الخطيرة، ٢٥٦/١ .
٨٣) ذيل مرآة الزمان (حيدر آباد الدكن ١٩٥٤-١٩٥٥)، ٣٦٤/٢ .
٨٤) هەمان سەرچاوە، ٣٦٤/٢، العبر في خبر من غبر، ٣١٢/٣، مرآة الجنان، ١٢٤/٤.
٨٥) ابن قاضي شبهه، طبقات الشافعية (بيروت ١٩٨٧) ٢، ٨٩، ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة في اعيان المئة الثامنة (القاهرة ١٩٦٦)، ٢٨٩/٤، ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب (بيروت د/ت)، ١٣/٦ .
٨٦) الجزري، تاريخ حوادث الزمان وانبائه (بيروت ١٩٩٨)، ٧٠٤/٣ .

سەرچاوەكان

یەكەم: سەرچاوە بنەڕەتیەكان:

- ابن الاثير، عزالدين ابي الكرم علي بن محمد بن عبدالواحد الجزري (ت ٦٣٠هـ/ ١٢٣٣م)
  ١- الكامل في التأريخ، دار الفكر (بيروت ١٩٧٨) .
  ٢- اللباب في تهذيب الانساب، مكتبة المثنى (بغداد د/ت) .
- البابانى، اسماعيل باشا البغدادي (ت ١٩٢٠م) .
  ٣- هدية العارفين واثار المصنفين، دار الفكر (بيروت ١٩٩٠) .
- البدليسى، الامير شرفخان بن شمس الدين (ت١٠١٠هـ/ ١٦٠١م) .
  ٤- شرفنامه، الترجمة العربية محمد جميل الروژبياني، ط٢ (اربيل ٢٠٠١) .

- ابن تغري بردي، جمال الدين ابو المحاسن يوسف (ت٨٧٤هـ/ ١٤٦٩م)
٥- النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، دار الكتب العربية (القاهرة ١٩٦٩-١٩٧٢) .
- الجزري، شمس الدين ابي عبدالله محمد بن ابراهيم بن ابي بكر (ت٧٣٩هـ/ ١٣٣٨م)
٦- تاريخ حوادث الزمان وانبائه، المكتبة العصرية (بيروت ١٩٩٨).
- ابن حجر العسقلاني، احمد بن علي (ت ٨٥٢هـ/١٤٤٨م).
٧- الدرر الكامنة في أعيان المئة الثامنة (القاهرة ١٩٦٦).
- حمد الله المستوفي، حمد الله بن ابي بكر بن محمد القزويني (ت ٧٥٠هـ/ ١٣٤٩م) .
٨- نزهة القلوب، بكوشش محمد دبير ساقي (طهران ١٣٣٦هـ.ش)
- ابن خرداذبه، ابو القاسم عبيدالله بن عبدالله (ت٢٨٠هـ/ ٨٩٣م) .
٩- المسالك والممالك، دار احياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٨) .
- الذهبي، شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان (ت ٧٤٨هـ/ ١٣٤٧م)
١٠- تذكرة الحفاظ (بيروت ١٩٥٦) .
١١- سير اعلام النبلاء (بيروت ١٩٩٧)
١٢- العبر في خبر من غبر، دار الكتب العلمية (بيروت د/ت) .
- ابن رسته، علي بن عمر، (ت ٢٩٠هـ/ ٩٠٣م).
١٣- الاعلاق النفيسة، دار احياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٨) .
- ابن الساعي الخازن، ابن طالب علي بن انجب (ت ٦٧٤هـ/ ١٢٧٥م) .
١٤- الجامع المختصر في عنوان التاريخ وعيون اليسر،جـ٩ (بغدد ١٩٣٤) .
- سبط ابن الجوزي، شمس الدين ابي المظفر يوسف بن قزاوغلي (ت٦٥٤هـ/ ١٢٥٦م) .
١٥- مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، جـ٨ (حيدر اباد الدكن ١٩٥١-١٩٥٢) .
- السخاوي، شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (ت ٩٠٢هـ/ ١٤٩٧م) .
١٦- الضوء اللامع لاهل القرن التاسع، دار مكتبة الحياة، (بيروت د/ت).
- السمعاني، ابو سعيد عبدالكريم بن محمد بن منصور (٥٦٢هـ/ ١١٦٧م) .
١٧- الانساب، دار الفكر (بيروت ١٩٩٨) .
- ابن شداد، عزالدين محمد بن ابراهيم (٦٨٤هـ/ ١٢٥٨م) .
١٨- الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، جـ١، تحقيق يحيى زكريا عبارة (دمشق ١٩٩١) .
- ابن العماد الحنبلي، ابو الفلاح عبدالحي (ت١٠٨٩هـ/ ١٦٧٨م) .
١٩- شذرات الذهب في اخبار من ذهب، دار الكتب العلمية (بيروت د/ت) .
- ابن فضل الله العمري، شهاب الدين احمد بن يحيى (ت٧٤٩هـ/ ١٣٤٨م) .
٢٠- مسالك الابصار (مخطوط) مكتبة المجمع العلمي العراقي .
- ابن الفقيه، ابو بكر بن محمد (ت ٣٤٠هـ/ ٩٥٢م) .
٢١- مختصر كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٨) .
- ابن الفوطي، كمال الدين عبدالرزاق بن احمد (ت٧٢٣هـ/ ١٣٢٣م) .
٢٢- مجمع الاداب في معجم الالقاب (طهران ١٤١٦هـ) .
- ابن قاضي شبهة، ابي بكر بن احمد بن محمد بن عمر (ت ٨٥١هـ/ ١٤٤٨م) .
٢٣- طبقات الشافعية، دار الندوة الجديدة (بيروت ١٩٨٧).

- القزويني، زكريا بن محمد بن محمود (ت ٦٨٢هـ/ ١٢٨٣م) .
٢٤- اثار البلاد واخبار العباد، دار صادر (بيروت ١٩٦٠).
- القلقشندي، احمد بن علي (ت ٨٢١هـ/ ١٤١٨م) .
٢٥- صبح الاعشى في صناعة الانشا، دار الفكر (بيروت ١٩٨٧) .
- المسعودي، ابو الحسن علي بن الحسين (ت٣٤٦هـ/٩٥٧م) .
٢٦- التنبيه والاشراف، دار مكتبة الهلال (بيروت ١٩٨١) .
٢٧- مروج الذهب ومعادن الجوهر (بيروت ١٩٧٣) .
- المقريزي، تقي الين احمد بن علي (ت ٨٤٥هـ/ ١٤٤١م) .
٢٨- السلوك لمعرفة دول الملوك، لجنة التأليف والطباعة والنشر (القاهرة ١٩٤١-١٩٤٢) .
- المنذري، عبدالعظيم بن عبدالقوي (ت ٦٥٦هـ/١٢٥٨م).
٢٩- التكملة لوفيات النقلة (بيروت ١٩٨٨).
- مؤلف مجهول.
٣٠- كتاب الحوادث، تحقيق بشار عواد معروف وعماد عبدالسلام رؤوف، دار الغرب الاسلامي (بيروت ١٩٩٧).
- مؤلف مجهول.
٣١- مجمل التواريخ والقصص، بتصيح ملك الشعراء محمد تقي بهار (طهران ١٣١٨هـ،ش) .
- الهمذاني، رشيد الدين فضل الله (ت ٧١٨هـ/ ١٣١٨م).
٣٢- جامع التواريخ، الترجمة العربية محمد صادق نشأت واخرون (القاهرة ١٩٦٠) .
- ابن واصل، جمال الدين محمد بن سالم (ت٦٩٧هـ/١٢٩٧م).
٣٣- مفرج الكروب في اخبار بني ايوب (القاهرة ١٩٧٢).
- ياقوت الحموي، شهاب الدين ابو عبدالله ياقوت بن عبدالله (ت ٦٢٦هـ/ ١٢٢٩م) .
٣٤- معجم البلدان، دار صادر (بيروت ١٩٧٧).
- اليونيني، قطب الدين موسى بن محمد (ت ٧٢٦هـ/ ١٣٢٦م).
٣٥- ذيل مرآة الزمان،مجـ١ (حيدر آباد الدكن ١٩٥٤-١٩٥٥).

**– دووەم: سەرچاوە نۆییەکان:**

- الزركلى، خير الدين
٣٦ – قاموس الاعلام، دار العلم للملايين (بيروت ١٩٨٠).
- العزاوى، عباس
٣٧ – العراق بين الاحتلالين، ج١ (طهران ١٤١٠هـ)
- النقشبندي، حسام الدين علي غالب
٣٨ – الكرد في الدينور و شهرزور، اطروحة ماجستير، جامعة بغداد (بغداد ١٩٧٥).

– **سێیەم: گۆڤار:**

ڕۆژبەیانی، محەمەد جەمیل.

٣٩– حەلوان و فەرمانڕەوایانی لە مێژوودا، بەشی یەکەم، گۆڤاریکاروان، ژمارە (٢١) حوزەیران ١٩٨٤، بەشی دووەم، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٢٢) ئەموز ١٩٨٤.

– مینورسکی، ڤ، ڤ.

٤٠– گۆران، وەرگیرانی ناجی عەباس، گۆڤاری گەلاویژ، ژمارەکانی (٥–٩) ساڵی پێنجەم ١٩٤٤.

# ملخص البحث

# قبيلة گۆران

**ودورها السياسي والثقافي خلال القرون الوسطى**

**د. زرار صديق توفيق**

إن هذه الدراسة تحاول استناداً الى المصادر التاريخية الموثوقة ان تثبت ان قبيلة گۆران هي قبيلة كردية كبيرة معروفة مدحضاً بذلك رأي بعض المستشرق الذين يؤكدون على انها ليست قبيلة كردية، وتلقي الاضواء على دور قبيلة گۆران السياسي والثقافي خلال القرون الوسطى، حيث لعبت دوراً يستحق الذكر في التاريخ الكردي الوسيط واسست زعامة قبلية متنفذة في انحاء درتنك وحلوان وماهيدشت خلال النصف الثاني من القرن (٦هـ/ ١٢م) واستمرت الى ما بعد العهد المغولي على الرغم من حملات السلاجقة والمغول المدمرة،وبرز منها امراء وقادة، وصار بعضهم يمارس حكمه أمير مستقل فعرفوا بـ((صاحب الدربند))، كما انجبت العديد من المشاهير والاعلام في العلوم الاسلامية المختلفة الذين خدموا الديانة والثقافة الاسلامية ببلادهم وبالديار الشامية والمصرية خلال العصر العباسي والايوبي والمملوكي .

**'Abstract'**

## Goran Tribe and its Political Cultural Role During the middle ages

**Dr. Zirar Sdeeq**

Goran was a big well - Known Kurdish tribe during the Islamic era. It played an outstanding role in the middle Kurdish history. It founded a powerful leadership in Halwan, Dertung and Mahidasht during the second half of the century (6 A.H /12 A.D ). Many princes and leaders came from this tribe. Moreover, the tribe gave birth to many well - known figures and scholars in different religious sciences in their countries and in Egypt and Syria .

This study , relying on historical sources, endeavours to prove that Goran is one of the well - known kurdish tribes and refutes the orientalist Minorisky's claim that Goran is not a kurdish tribe .

The study also sheds light on the scientific and cultural role of Goran tribe during the Abbasid, Ayubid and Mamluks period.

# ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی مێژوویی

پ.ی.د. دلێر ئیسماعیل حەققی شاوەیس

**پێشەکی**

نەوت یەکێکە لە بەرهەمە ستراتیژییەکانی جیهان، تەنها سەرچاوەیەکی هەرزان نییە بۆ وزە، بەڵکو کەرەستەیەکی خاویشە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە پیشەسازی گرنگ، هەر لە پیشەسازییەکانی کیمیاگەری و پلاستیك و ... هتد تا دەگاتە بەرهەمهێنانی خۆراك.

سەرەڕای ئەوەش سەرچاوەیەکی گرنگی دابینکردنی سەرمایەیە بۆ پرۆسەی گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە وڵاتە بەرهەمهێنەکانی نەوتدا[1]. هەر لەبەر ئەو هۆکارانەشە نەوت ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە ڕووداوە مێژووییەکاندا و بەشێکی بەرچاوی وەرچەرخانە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان پەیوەندییان بەبوون و نەبوونی نەوتەوە هەبووە.

ئەوەتا نەوت لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە بۆتە بابەتێکی ململانێی نێو دەوڵەتی و هۆکاری ژمارەیەکی زۆر لە شەڕ و جەنگی خوێناوی[2]، هەر بۆ نموونە لە جەنگەکانی یەکەم و دووەمی جیهان، جەنگی عێراق ـ ئێران ١٩٨٠ـ١٩٨٨ و جەنگی کەنداوی یەکەم و دووەم فاکتەری نەوت لەبەر چاو بووە و، وا دیارە لە ڕووداوەکانی ئێستا و ئایندەشدا ڕۆڵی نەوت لە جاران کەمتر نابێت.

ئەم بابەتەی لەبەر دەستی خوێنەری هێژادایە بۆ ئەوە نییە باس لە ڕۆڵی نەوت بکات لە ململانێی نێو دەوڵەتیدا، یان کێشەی کوردستان و ڕۆڵی نەوت لەو مەسەلەیەدا شی بکاتەوە .... بەڵکو بۆ بەدواداچوونی ئەو وتەیەی کلیمەنسۆی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسایە لە ٢٢ی مایسی ساڵی ١٩١٩دا ڕایگەیاندووە: گەر بیزانیایە ئەو ناوچەیە هێندەی نەوت تێدایە هەرگیز دەستبەرداری نەدەبوو[3]، (مەبەستی لە ویلایەتی مووسڵە. د. ش).

لەبەر ئـەوەی زۆر لـە توێـژەر و مێژوونووسـان ئـەو وتەیـەی کلیمەنسۆیان وەك خـۆی و ڕاستییەکی بێ گرێ وەرگرتووە و دەیڵێنـەوە بـێ ئـەوەی شـەن و کـەو بکرێـت، کـە بـە بۆچـوونی ئێمـە جێگـەی گومانـە و دەشـێ تـاووتوێ بکرێـت. مەبەسـتی سـەرەکی ئـەم توێژینەوەش هەوڵدانێکە لـەو ڕووەوە بـەپێی زانیارییـەکانی ئێمـە تائێـستا لـەو بـوارەدا کارێکی وا ئەنجام نەدراوە و نەبۆتە بابەتێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە.

بۆ لێکۆڵینەوەکە و سەلماندنی بیر و بۆچوونەکانمان وا پێویست بوو کە باس لە هەنـدێك بابەت بکرێت وەك: نـەوت لـە مێـژوودا، نـەوت لـە کوردسـتاندا، ململانێـی نێـو دەوڵـەتی لەسەر چاڵە نەوتەکان، ڕۆڵی نەوت لە گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا... هتد.

لەبەر ئـەوەی هەریەکـە لـەم باسـانە چـەندین لێکۆڵینـەوەی سـەربەخۆ هەڵـدەگرن و بـۆ ئەوەی لە بابەتە سەرەکییەکەمان کە ڕاستکردنەوەی بیرو بۆچوونێکە دوور نەکەوینەوە، خوێنەری بەڕێز دەگێڕینەوە بۆ سەرچاوەکان و خۆمان لە درێژەی ئەو باسانە دەپارێزین کە لە بابەتە سەرەکییەکە دوورمان دەخاتەوە، هەر لەبەر ئەو مەبەستەشە توێژینەوەکە دابـەش کـراوە بـۆ پێـشەکییەك و چـەند زانیارییـەکی پێویـست و ئـەنجام، ئەمـەش لـە لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا شتێکی نوێ نییە.

## چەند زانیارییەکی پێویست

زانیارییە ئەرکیۆلۆژییەکان ئەوەمان نیشان دەدەن کە مرۆڤ هـەر لـە دێـر زەمانـەوەو لـە ناوەڕاستی چاخە بەردینەکانەوە بایەخی نەوتی زانیوە دانیشتوانی کوردستانیش لەمێژە شارەزای نەوت بوون و سوودیان لێ وەرگرتووە و بەلای هەندێکەوە ئاگری باباگوڕگوڕ لە کەرکووك ئەو ئاگرە هەمیشەییە نەمرەیە کـە لـە گەشـتەکەی دانیـاڵ پێغەمبـەردا بـاس کراوە[٤].

ئاورووپاییـەکانیش لەمێـژەوە شـارەزای نـەوت بـوون، سـوودیان لـێ وەرگرتـووە وەك سەرچاوەیەکی وزە و ڕووناکی یان بۆ دەرمان و هەندێ پیـشەسازی. بـەڵام لـە سـەدەی ١٩ نۆزدەوە گرنگی نەوت زۆر زیـادی کـردووە، بەتایبـەتی دوای ئـەوەی ماشـێنی دیـزڵ

هاتـە ئـاراوە و خواسـت لەسـەر بەرهەمـەكانی نـەوت زیـادی كـرد بـۆ بـەكارهێنانی لـە بەگەڕخـستنی شـەمەندەفەر، پـاپۆڕ، ئۆتۆمبیـل و ماشـێن و ئامێرەكـانی كارگـە و كارخانەكان بۆیە لە كۆتایی سەدەی نـۆزدەدا ئـیتر نـەوت بـوو بـە یـەكێك لـەو بەرهەمـە ستراتیژیانەی كە لایەنێكی بەرچاوی لە ململانێی نێو دەوڵەتاندا گرتەوە[٥].

لە ساڵی (١٨٨٢)دا فیشەری سەركردەی هێزی دەریایی بەریتانیا لـە راپۆرتێكدا ئامـاژە بەوە دەكات كـە «بـەكارهێنانی پـترۆڵ لـە بـری خـەڵووزی بـەردی وەك سـووتەمەنی بـۆ كەشتییە جەنگییەكان هێز و توانایان زیاد دەكا و دەتوانرێت هـەر لـە نێـو دەریـادا ئـەو سووتەمەنییە بگەیەنرێتە كەشتییەكان و ژمارەیەكی تریـشی لـە سـوودەكانی پـترۆڵ بـە بەراورد لەگەڵ خەڵووزدا باس كردووە، بەكارهێنانی خـەڵووزی بـەردی بـۆ گواسـتنەوە و گەیاندن لای ئینگلیزەكان بەراورد دەكـات بـەو پێـشكەوتنەی لـە ئـەنجامی بـەكارهێنانی هەڵمەوە بەدەست هات بۆ بە گەڕخستنی پاپۆڕ لە بری كەشتی چارۆكەدار»[٦].

وینیـستۆن چەرچـڵ لـە سـاڵی (١٩١٣)دا و لـە ئەنجومـەنی گـشتی بـەریتانیادا ئـەوەی راگەیانـد كـە «دوا پلانمـان ئەوەیـە وەزارەتـی كاروبـاری دەریـایی دەبێـت خـاوەن و بەرهەمهێنـەری راسـتەوخۆی پێداویستەكانمان بێـت لـە سـووتەمەنی نـەوت ... دەبێـت خاوەن یان بەلانی كەمەوە باڵادەست بێ بەسەر سەرچاوە سروشتییەكانی ئـەو نەوتـەی پێویستمانە»[٧].

ئەوەی جێگەی سـەرنجە لـە ململانێـی زلهێزەكانـدا ئەڵمانـەكان یەكـەم كـەس بـوون كـە توانییان خۆیان بگەیەننە نەوتی كوردستان.

لە نێوان ساڵانی ١٨٧١-١٩٠٢دا چەند پۆستەیەك لە شارەزا و پـسپۆر و رۆژنامەنووسـانی ئەڵمانی هاتوونەتـە ناوچـەكە و راپۆرتـەكانیان جـەخت دەكەنـە سـەر دەوڵەمەنـدی ئـەو دەڤەرە و بـوونی نـەوتێكی زۆر كـە بەشـی ئـەڵمانیا دەكـا و باشـتر و بەسوودتریـشە لـە نەوتی روسیا[٨].

لە ٤ی ئۆكتۆبەری ساڵی ١٨٨٨دا حكومەتی عوسمـانی چـیاوگی هێڵـی ئاسـنی بـەرلین - بەغـدای لەگـەڵ بـانكی ئەڵمانیـدا مـۆركرد. ئـیتر هـەر لـە سـاڵی ١٨٩٠ەوە ململانێـی نێودەوڵەتی لەسەر نەوتی كوردستان، بەتایبەتی لە چوارچێوەی هێڵـی ئاسـنی بـەرلین -

بەغداد دا گەرم بوو[9]. پرۆفیسۆر نانسی جیوگرافی ناسی بەناوبانگ لە ساڵی ١٩١٣دا ئاماژەی بەوە کردووە کە «دەبێ خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و باکووری سووریا و باکووری مێزۆپۆتامیا دروشمی لەمەو دوامان بێت»[10].
ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهان و ئەنجامەکانی و تێکشکانی ئەڵمانیا لە جەنگدا و داگیرکردنی هێزی سوپای هاوپەیمانان بۆ ناوچەکە جێ پێی ئەڵمانەکانی لاواز کرد و بەریتانیا و فرەنسا جێگەیان گرتەوە.
بەپێی پەیمانی سایکس پیکۆ خوارووی کوردستان ـ ویلایەتی مووسڵ دەکەوتە نێو بەرژەوەندییەکانی فرەنسا ئەگەرچی سوپای بەریتانیا بە بیانووی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە مێزۆپۆتامیا شاری مووسڵی داگیرکردبوو[11] دواتریش بەریتانیا بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا خوارووی کوردستان بلکێنێ بە دەوڵەتی عیراقەوە کە لە ژێر دەستی خۆیدا دروست کرا و بۆ ئەم مەبەستەش هەموو پاساوێکی دەهێنایەوە[12].

## ئەنجام:

ئەو زانیارییە مێژووییانەی کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە دەمانگەیەنێتە ئەوەی بڵێین:

١ـ دەستکەوتە ئارکیۆلۆژییەکان و زانیارییە مێژووییەکان ئەوەمان بۆ نیشان دەدەن کە لە دێرزەمانەوە نەوت لە کوردستاندا هەبووە. ئەو زانیارییانەش لەلای فرەنسییەکان شاراوە نەبووە و خۆیان بەشدارییان لە گەڵاڵە کردنیدا هەبووە.

٢ـ لە کوردستاندا هەر لەمێژەوە سوود لە نەوت وەرگیراوە و بەمەبەستی ئابووری دەرهێنراوە، هەر بۆ نموونە ریچ لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان لە ساڵی ١٨٢٠دا ئاماژە بەوە دەکات چۆن لە ناوچەی گەرمیاندا نەوت دەرهێنراوە[13].

٣ـ لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە راپۆرتێکی زۆر لەلایەن ئاورووپییەکانەوە نووسراوە سەبارەت بەبوونی نەوتێکی زۆر لە خوارووی کوردستاندا، ئەمە جگە لەو راپۆرتانەی گوڵبەنکیان نووسیویەتی. نەك هەر ئەوە بەڵکو لە سەردەمی مەدحەت پاشای والی عوسمانێکان لە بەغدا ١٨٦٩ـ١٨٧٢دا و بە هاوکاری پسپۆرە ئەڵمانەکان گەشە بە

بەرهەمهێنانی نەوت دراوە و لە باقووبە پاڵاوگەیەکی نەوت دامەزراوە بۆ ئەو نەوتەی لە مەندەلی بەرهەم هێنراوە[١٤].

٤ـ لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە لە کۆتایی سەدەی ١٩ نۆزدەدا فرەنسا خۆی هاوکار بووە لە گەشەپێدانی بەرهەمهێنانی نەوت لە ناوچەکانی گەییارە و دووزخورماتوو و باباگوڕگوڕ[١٥].

٥ـ پێویستە ئەوە بوترێت کاتی خۆی لە دانوستاندنەکانی نێوان بەریتانیا و فرەنسا و رووسیادا، کە دواتر پەیمان نامەی سایکس ـ پیکۆی لێ کەوتەوە و بەریتانیا هەوڵی داوە هێزێکی وەك فرەنسا لەنێوان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی رووسیا و بەریتانیادا هەبێت و ببێتە سەنگەر و پەرژینێك لێکیان جودا بکاتەوە و رووسەکان لە کەنداو دووربخاتەوە، چونکە بەریتانیا بوونی رووسەکانی لەو ناوچانەدا بە مەترسییەکی گەورە دەزانی، بۆیە کاتی خۆی نەرمییەك بەرامبەر بە بوونی دەسەڵاتی فرەنسا بەسەر ویلایەتی مووسڵدا لەلایەن بەریتانیاوە نیشاندراوە. کاتێکیش لەساڵی ١٩١٧دا دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر، رووسیا کشایەوە لەو پەیمانە ئیتر بەریتانییەکان ئەو مەترسییەیان لە رووسیا نەمابوو.

٦ـ کاتێك لوید جۆرج داوای لە کلیمەنسۆ کرد، چاو بخشێنێتەوە بە پەیمانی سایکس ـ پیکۆدا، کلیمەنسۆ ئامادەیی خۆی نیشان دا، کە ناوچەکانی ویلایەتی مووسڵ و فەڵەستین چاویان پێدا بخشێنرێتەوە بە مەرجێك:

- a - فرەنسا بەشی خۆی لە نەوتی مووسڵ وەرگرێت.
- b - بەریتانیا پشتگیری تەواوی فرەنسا بکات لە هەموو گازندەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.
- c - ئەگەر کار بە سیستەمی ماندات کرا، دەبێت ناوچەکانی دیمەشق و حەلەب، ئەسکەندەرۆنە و بەیروت، بخرێتە ژێر مانداتی فرەنساوە[١٦].

جێگەی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکرێت، لەکاتی جەنگدا و لەگەڵ ئەوەدا کە پشکێکی زۆر لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی، درابوو بە فرەنسا لە ناوچەکانی: باکووری کوردستان، ئەنادۆڵ و خوارووی کوردستان.

فرەنسا زۆر جەختی دەکردەوە سەر ئەوەی دەبێت بەرژەوەندییەکانی لە سووریا و ئەسکەندەرۆنە و ئەدەنەدا بپارێزرێ(١٧).

٧ـ بەریتانیا لەمێژ بوو ئەوەی نەدەشاردەوە کە سنوورەکانی رۆژئاوای هند بە فوراتدا تێدەپەڕێت و تەنیا لە ڕێگەی مووسڵەوە دەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت(١٨).

بۆیە بەریتانیا و فرەنسا لە کۆتایی جەنگدا رێککەوتبوون لەسەر ئەوەی پێی دەوترا ((ناوچەکانی کار)) لە رووسیا کە بەپێی ئەو رێککەوتنە کوردستان دەکەوتە نێو بەرژەوەندییەکانی بەریتانیاوە(١٩).

٨ـ بەریتانیا بە کردەوە ویلایەتی مووسڵی داگیر کردبوو فرەنساش مامەڵەی لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا دەکرد.

٩ـ ئەوەی ئاشکرایە کلیمەنسۆ سەرەك وەزیرانی فرەنسا بوو، رۆڵێکی بەرچاوی لە سیاسەتی نێو دەوڵەتی و سەردەمێکی زۆر چارەنووسسازدا گێڕاوە و جێگە پەنجەی بەسەر رووداوەکانەوە بەجێهێشتووە چ لەسەر ئاستی نێو خۆی فرەنسا و ئاورووپا و جیهانیش. جگە لەوەی بە سیاسەتوانێکی سەرکەوتوو و وریا ناسراوە، ناکرێ بە جۆرێکی تر هەڵسەنگێنرێت.

لەسەر بنەمای ئەو زانیاری و دەرەنجامانەی پێشتر ئاماژەی بۆ پێکرا دەتوانین بڵێین، رێگەی تێناچێ کلیمەنسۆ بەو هەموو وریایی و بە ئاگایی و زانیارییەوە، وەك سەرۆك وەزیرانی فرەنسا بێ ئاگا بووبێ لەو راستییە مێژوویانە و کەسیش نەبووبێ لە فرەنسادا ئاگاداری بکاتەوە لەو بارەیەوە و رێنومایییەکی بکات!!! بۆیە دەبێت ئەو وتەیەی کلیمەنسۆ وەك راستییەکی بێ گرێ وەرنەگیرێت و بێ لێکدانەوە جێگەی متمانە نەبێت بەڵکو وەك هەوڵدانێك بۆ چاوبەستکردنی گەلانی ناوچەکە و چەواشەکردنی ڕای گشتی وڵاتەکەی خۆی لێکبدرێتەوە.

## پەراوێزەکان:

١- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:

a - د. محمد ازهر السماك، اقتصاديات النفط، جامعة الموصل ١٩٨٠ ص٢٧-٣٨.

b - ئـەكاديمياى زانـستى يـەكێتى سـۆڤيەت. ئەنيـستيتۆى ڕۆژهەڵاتناسـى، دۆلارەكـانى نـەوت و گەشەكردنى كۆمەڵايەتى و ئابوورى وڵاتـانى ڕۆژهـەڵاتى نزيـك و ناوەڕاسـت. مۆسـكۆ ١٩٧٩ (بـە زمـانى ڕووسى).

c - د. آزاد النقشبندي، اهمية حقول كركوك النفطية، گۆڤارى مەتین ژ. ٦٦ تەموز ١٩٩٧.

d - زێڤارۆڤ ف. گۆڕانكارييە كۆمەڵايەتى و ئابوورييەكان لە كۆمـارى عيراقـدا. مۆسـكۆ ١٩٧٩ (بـە زمانى ڕووسى).

٢- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

a - Nasrollah Saifpour Fatemi, Oil diplomacy, New Yourk 1954.

b - د. ئازاد نەقشبەندی، سەرچاوەی پێشوو.

c - د. نوری عبدالحميد خليل، التاريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق، بيروت ١٩٨٠، ص٤٤.

٣- لەم بارەیەوە بڕوانە:

a- Ander Tardieu, "Mossul etle petrole" inl, illustration, CLV, pp381-382.

لە د. فاضل حسين، مشكلة الموصل، بغداد ١٩٦٧، ص٩ وەرگيراوە.

زۆر لە نووسەر و توێژەرانی تریش هەر لەو بیر و رایەدان کـە کلیمەنـسۆ نـەیزانیوە نـەوت لـە خـوارووی کوردستاندا هەیە دەنا دەستبەرداری نەدەبوو بۆ بەریتانییەکان.

بۆ نموونە بڕوانە:

- د. عبدالرحمن قاسملو، كوردستان و كورد، عبدالله حسن زادە، بنكەی پێشەوا ١٩٧٣، ل٥٦.

- Charles A. Hooper, L, Iraq etla societe des Nation, p.18

٤- د. عبدالحميد العلوجي و خضير عباس اللامي، الاصـول التاريخيـة للـنفط العراقـي ج١، بغـداد ١٩٧٣، ص٣٥.

- هەروەها بڕوانە د. عبدالله غفور، جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، سلێمانی ٢٠٠٢، ل٥٩.

٥- بۆ زانیاری بڕوانە:

Richard Coke, The heart of the middle east, London. 1952 p.p.103-179.

٦ـ الجمهورية العراقية ـ وزارة الاعلام ـ مديرية الاعلام العامة، بدايات الصراع الاستعماري على نفط المنطقة، بغداد ١٩٧٢، ص١٢.

٧ـ محسن الموسوي، النفط العراقي ـ دراسة وثائقية من منح الامتياز حتى التاميم، بغداد ١٩٧٣، ص١٤.

٨ـ د. نوری عبدالحمید خلیل، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠.

٩ـ بڕوانە:

a - الجمعية الالمانية ـ العربية في جمهورية المانيا الديمقراطية، الالمان والعرب، برلين ١٩٦٩، ص١١.

b - کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین، کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا ١٨٩٠ـ١٩٣٢، سلێمانی ٢٠٠٢، ل٥٠ـ٧١.

١٠ـ الالمان والعرب ل١١.

١١ـ د. فاضل حسین، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

ـ د. كمال مظهر احمد، اضواء على قضايا دولية في الشرق الاوسط، بغداد ١٩٧٨، ص١٣٤.

١٢ـ د. فاضل حسین، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩ـ١٣١.

ـ کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١١ـ٢٣٣.

١٣ـ ریچ کلودیوس جیمس، گەشتی ریچ بۆ کوردستان، و. محەمەد حەمە باقی، تەورێز ١٩٩٢، ل٥٤ـ٥٥. شایانی باسە ئەم کتێبە کاتی خۆی لە ساڵی ١٨٣٦ لە لەندەن بە دوو بەرگ چاپکراوە.

١٤ـ د. نوری عبدالحمید خلیل، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

١٥ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو کە وەرگیراوە لە:

- Longrigg S.H., Oil in the middle East, London 1961, p.14.

١٦ـ بڕوانە:

a - بدايات الصراع الاستعماري على نفط المنطقة، ص١٠.

b - د. فاضل حسین، سەرچاوەی پێشوو، ل٨ـ٩.

١٧ـ د. كمال مظهر احمد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣١.

١٨ـ د. كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ت. محمد الملا عبدالكريم، بغداد، ١٩٧٧، ص ١٩٤ـ١٩٥.

١٩ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٤.

# ملخص البحث
# تصحيح خطأ تاريخي

د. دلير حقي شاويس

ضمن عملية تقسيم العالم بين الدول الاستعمارية وبموجب اتفاقية سايكس - بيكو كانت ولاية الموصل من حصة فرنسا. الا ان البريطانيين سيطروا على مناطق واسعة من الولاية ومن ضمنها مدينة الموصل. وفيما بعد وبموجب تسوية بين البريطانيين والفرنسيين تنازلت الاخيرة عن ولاية الموصل لبريطانيا الا ان رئيس وزراء فرنسا كليمنصو اعلن في ٢٢ مايس ١٩١٩ ((لو كان ادرك قيمة ماتنازل عنه لما فعل)).

وقد اعيدت هذه العبارة من قبل الكثير من الباحثين و المؤرخين الكورد والعرب والاوروبيين كحقيقة مطلقة.

ان هذا البحث محاولة لمناقشة مدى صحة ماصرح به كليمنصو رئيس وزراء فرنسا في حينه حول جهله باهمية ولاية الموصل. وقد توصل الباحث بان النفط كان معروفا لدى العراقيين و غيرهم منذ القدم، كما ان النفط كان من اهم اسباب الصراع بين الدول الاستعمارية للسيطرة على المنطقة منذ قرن التاسع عشر اضافة الى مشاركة فرنسا في دراسة المنطقة واستخراج وتكرير النفط فيها. كما ان الفرنسيين اخذوا حصتهم من النفط المستخرج من ولاية الموصل بعد تنازلهم عنها لبريطانيا.

لذلك لايمكن ان نسلم بصحة هذا التصريح وجهل رئيس وزراء فرنسا باهمية ولاية الموصل وانما يمكن اعتبار ذلك ضمن عملية اعادة توزيع الحصص بين المستعمرين وتضليل الرأي العام في بلدانهم.

## Abstract

## Correction of an error

**Asi.prof. dr.diler shaweys**

According to Sajks-picot agreement, Mwsol state (wilayat) was to be the share of France. But at the end of Ist world war, the Britains controlled most of the area including Musol, that made the France concession and waived his right of Musol to Britain.
In 22na of May 1919 Climanso, the France prime minister announced that "If he knew the worth of what he offered he never did".
This study is a discussion about the credibility of this declaration and the France prime minister ignorance of Musol wilayat's importance.
The researcher concludes his study that petrol was well known by the Iraq is and the other nations since along time ago.
So, petrol was the basic factor of the struggle among the Imperialist countries to control the area since 19th century.
The France, themselves participated in studying the area to exploit petrol (extraction and reefing) so they, the France, had their share in Musol petrol. So we cannot agree with the France primeminister, but we can say that was only a bargain of the shares among and redistribution of the imperialistic countries, and an attempt to mislead the public opinion of these countries.

# پڕۆژەی
# ستانداردکردنی زمانی کوردی

**ئەم نووسراوەیە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی زمانەوانییە کە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی زمانی ستاندارد نیشان دەدات لە پێکهاتەی نەتەوەیی و خولقاندنی دەوڵەتدا.**
**دواتر لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوانەدا چەند پێشنیارێکی پراکتیکانە کراوە بۆ یەکخستنی دیالێکتەکانی کوردی و هێنانە دی زمانێکی ستاندارد.**

غازی عەلی

**١. سەرەتا:**

**زمان بابەتێکی گەلێك سەرنج ڕاکێشە و بەدرێژایی مێژووی شارستانیەت هۆش و بیری مرۆڤایەتی داگیرکردووە. لە دەورووبەری ئێمەدا هەزاران زمان ودیالێکت هەن کە چەندین بۆچوونی فیکری و وێژەیی و هونەری دەردەبڕن. مرۆڤ بەهۆی زمانەوە پلانی دواڕۆژ دادەنێت. هەروەها دەچێتە ناخی مێژووەوە بۆ زانینی چۆنیەتی ژیان و بیرکردنەوەی نەوەکانی پێشوو.**
**هەر لە مێژەوە مرۆڤ بە پەرۆشەوە ڕوانیویەتی بۆ سەرچاوەی دروستبوونی زمان، بەڵام بێ هوودە تاکو ئێستا نازانرێت چۆن، لە کوێوە کێن ئەوانەی بۆ یەکەمین جار پەیڤین .**
**لە پێشدا پەیوەندی نێوان ئایین و زمان ڕێگە خۆشکەر بوو لە هێنانە دی کولتووری مێژوویی، بۆیە نامۆ نییە، کە بیرکردنەوە سەرەتاییەکان (تاکو ئێستاش) زمانیان وەکو دیارییەك خەملاند لە لایەن خوداوە بۆ مرۆڤایەتی. زمان هەمیشە وروژێنەری پرسیار و گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە و جۆرەها تاقیکردنەوە بوو.**

هەرچۆنێك بێت ئەمڕۆ لە جیهاندا فرە زمانی هەیە. ئەمەش مانای جیاوازییە. فرەزمانی مانــای فەلــسەفەیەکی، میتــافۆرێکی زانــستی و شــێوە ژیــانێکی تــر دەبەخــشێت. جیاوازییــەکان لــە شـێوازی دەربڕینــی زمانــە جۆراوجۆرەکـانی مـرۆڤ ڕاسـتییەکە بـەڵام تێکڕای زمانەکان هەمان سترەکتورە وە هەمان ئەرکی جیاجیا جێبەجێ دەگەیەنێت.

نەتەوە، لەبەر ئاڵۆزی و بەربلاوی ماناکەی، چەندین پێناسەی بۆ کراوە. یـەکێك لەوانـە نەتەوە پەیوەست دەکەن بە چەند پێکهاتەیەکی بنەڕەتی وەکو زمان، ئایین و ڕەگـەز. ئەم پێناسەیە سنووردارە، چونکە دیارە مرۆڤێك یان گرووپێـك بـە چ زمانێـك دەپـەیڤن بەڵام کاتێك نەتەوە دەبێت بە فاکتەرێکی گرنگی ژیانی پێناسەکەی دژوار دەبێت لەبەر جۆرەها هۆکار بۆ نموونە خەڵکی ناوچەی تۆرنادالی سەرووری ولاتی سوید خۆیـان بـە سـویدی دەژمـارد لـە ترسـی ئـەوەی پێیـان نـەوترێت فنلەنـدی، دانیـشتوانی ڤـین لـە خوارووی وولاتی نەمسا نایانەوێت بژنەڤن زمانەکەیان دیالێکتێکی سلۆڤاکییە، خـەڵکی ئیرلاند و ئینگلیز لەیەك جیا دەکرێنەوە هەرچەند هەمان زمانیان هەیە.

ئـاین کرێتریایـەکی ئاشـکرای نییـە لـە دیـاریکردنی ناسـنامەی نەتەوەییـدا، بـەڵام لـەو شـوێنانەی پەرسـتگا و کڵێسە یـان مزگـەوت ئەرکـەکانی دروسـتکردنی کۆمـەڵ بـەجێ دەگەیەنێت ئەوا ئایین دەبێتە ئامرازێکی گرنگ لە یەکخستنی مرۆکان یان جیاکردنەوەی ئەوانەی هەمان بڕوایان نیە. کرێتریای ڕەگەز بەنـدە بـەو بیرۆکـە دزێـوەی کـە شـێوەی لەشی مـرۆڤ بـە خـاڵی یەکلاکـەرەوەی ئینتمـای نەتـەوەیی دادەنێـت. دزێـوەی ڕەگـەز پەرستی لەوەدایە کە خاوەن میکانیزمێکی لە کەنارخەر و زۆردارانەیە بەرامبەر بەوانەی کە خاوەن هەمان شێوە و ئاکار نین.

سەرنج ڕاکێش تـرین تیـۆری نەتـەوە یـان پێکهاتـەی نەتـەوەیی لـە لایـەن کـارڵ دویـچ پسپۆڕی دەوڵەتناسی ئەمریکییەوە لە سـاڵی (١٩٥٣) داڕێـژراوە بـەوەی کـە دەبێـت " پێکهاتەی نەتەوە لە ڕوانگەی ئەرکەوە function سەیر بکرێـت". لـە ولاتێکـی بـە برەو و فرە، کە دانیشتوانەکەی ڕەزامەندی پابەندبوونی خۆیان نیشان بدەن لـەوەی کـە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی دروست هەیە لە نێوان هەموو ئەندامەکانیدا بەوەی هەر یەك ڕۆڵی جیای هەیە لە کۆمەڵگادا، بۆ نموونە دانیشتوانی سویسەرە خۆیان بە سویسەری

دەناسـن هەرچـەندە خەڵکەکـەی سـەر بـە چـەندین زمـان و ئـاینی جیـاوازن. لێـرەدا پەیوەندییەکانی ئاڵوگۆڕی زانیاری هۆکاری یەکخستنی کۆمەڵە نەك زمان.

هەرچۆن بێت ئەم وولاتە پەیوەندییەکی پتەوی هەیە لەگەڵ وولاتەکانی دراوسێیدا بەوەی کە خاوەنی هەمان زمان و کولتـوورن. تیـۆری ئـەرکی بـێ خـەوش نییـە، چـونکە بـاش کارکردنی دەزگاکان لە کۆمەڵگایەکی فرە نەتەوەیی یەکساندا مانـای پەیوەسـت بـوون نییە بەو وولاتەوە. مرۆکان لێرەشدا خولیای ولاتێکی نەتەوەیی خۆیان هەن. لێرەدا دژە بۆچوون هەیە چونکە خەڵکانی ئەم ولاتە بنەمایەکی پتەوی هەستی نەتەوایـەتیان نییـە بۆ ولاتەکە. هەسـتی نەتەوایـەتی هەمیـشە دیاردەیـەکی لـە بەرچـاوە، بـۆ نموونـە ئـەو ولاتانەی، کە بە شێوەیەکی سروشتی ئاوێتەی پێکهاتەی نەتەوەیـەکن وەکـو سـوید لـە باری ئاساییدا هەڵگری بۆچوونێکی نێونەتەوەیین بەڵام لە کاتی هەستکردن بە مەترسی هەڕەشە ئەدرنیالی نەتەوە پەرستان بەرز دەبێتەوە وەکو هەستکردن بە هەڕەشەیەکی دەرەکی یان زیاتربوونی ژمارەی کۆچبەران بە تایبەتی لە کاتی قەیرانی ئابووریيدا.

هەندێك جار وشەی نەتەوە بە هەڵـە بـەکاردێت بـۆ نموونـە کاتێـك ولات گرێـدەدەن بـە نەتەوە. ولات مەرج نییە ڕەنگدانەوەی پێکهاتەی یەك نەتەوە بێـت. دانیـشتوانی ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا پێیـان ئەسـتەم نییـە لـە لـە ناسـاندنی خۆیـان بـە ئـەمریکی هەرچەندە ئەم وولاتە پێکهاتەی دەیان ولاتە. بە مانایەکی تر کێشەی نەتەوایەتی لێرەدا بەدی ناکرێت. لـە بەرامبـەردا دانیـشتوانی بـەلجیکا و رۆمانیـا بەئاشـکرا دابـەش بـوون بەسەر چەند هەڵوێستێکی دژ بەیەکی نەتەوایەتیدا، لەگەڵ ئەوەشـدا بـانگ دەکـرێن بـە بەلجیکی و ڕۆمانی. هاوولاتیانی ولاتێك مەرج نییـە خـاوەن ئێتنیکێکـی نەتـەوەیی بـن تەنانــەت بــە پێــی تیــۆری دویــچیش دانیــشتوان نەتــەوە پێــك نــاهێنن، چــونکە پەیوەندییەکانی مرۆیی ئەم کۆمەڵگایانـە نـەك هـەر لاوازە، بـەڵکو ویـست و بۆچـوون و ئامانجــــەکانیش دژ بەیەکــــە. لــــــەم ولاتــــــانەدا تیــــــۆری دۆیــــچ (ئەرکی **functionalism**) مانای خـۆی ون دەکـات. ناخۆشـترین پرسـیار، کـە ڕووبەڕووی مرۆڤانی سەر بە نەتـەوەی بـێ وولات دەبێتـەوە " خـەڵکی کوێیـت" خـەڵك ناسنامەی ولاتی پـێ دەبەخـشێت نـەك نەتـەوە. ئاشـکرایە ناسـنامەی زۆربـەی ولاتـان گرێدراوی زمانێکە، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر ولاتەکە ڕاستەوخۆ ناوی زمانەکە هەڵنەگرێت.

دەوڵەت ، بە پێی زۆربەی پێناسەکان، ئۆرگانێکە کە دەسەڵات و سەرداریيەتی هەبێت بە سەر ناوچەیەکی دیاریکراودا، جا ئەم دەسەڵاتە بە زۆرەملێ بێت یان بە ڕەزامەندی خەڵکی ناوچەکە یان بەهۆی هەردووکیانەوە. ئاشکرایە کە بەشێکی زۆری دەسەڵات دەکەوێتە ژێر ڕکێفی چەند کەسانێك داروو دەزگایەك وە یان کۆمپانیاکان. زەقترین جۆری ئۆرگانەکان ئەوانەن، کە نوێنەری هەرێمە جیاکانی  ئەو ناوچەیە دەکەن وەکو پارێزگاکان و کۆمونەکان بۆ نموونە ئەڵمانیا لە چەند هەرێمێکی  یەکگرتوو پێکدێت و هەر هەرێمێك تا ڕادەیەکی بەرچاو دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی خۆی هەیە. سویسەرە لە چەند هەرێمێکی جیا پێکدێت و ڕێك کەوتوون کە دەسەڵاتی خۆیان کەم بکەن لە قازانجی دەسەڵاتێکی یەکگرتووی بەهێزی ناوەند.

دەستەواژەی دەوڵەت تۆزێك ئاڵۆزە بەتایبەتی لە کاتێکدا کە زۆر لە وڵاتان بەشێك لە سەربەخۆیی خۆیان داوە بە ئۆرکانی تر. وڵاتە فیدرالیەکان دەستەواژەی دەوڵەت ئاڵۆزتر دەکەن. پێوەرێکی ناجێگیر هەیە لە نێوان ئەوەی کە وڵاتێك لە چەند بەشە وڵاتێك پێکدێت وە چەندین وڵات هاوکاری یەکتربکەن. بە شێوەیەکی ڕەسمی دەکرێت ئەم پێوەرە یەکلا بکرێتەوە بەڵام لە پراکتیکدا ناکرێت دەستنیشانی ئاستەکانی ئازادییە ڕاستەقینەکانی ئەم پێوەرە بکرێت. لە سوید دەسەڵات ناوەندییە، بەڵام لە پراکتیکدا کۆمونەکان ئازادی تەواویان هەیە. لە سۆڤیەتی کۆن سیستەمێکی فرە وڵاتی ناوچەیی، هەرێمی سەربەخۆ هەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا دەسەڵاتی ئەم وڵاتانە لە گرووپێکی فرە نەتەوەیی هەڵپەڕکێ و سەما زیاتر نەبووە. لەم دواییەدا زۆربەی وڵاتان سیستەمێکی نیمچە فیدڕالیان دامەزراندووە بۆ هەندێك ناوچە، کە ڕەگەز و زمانیان جودایە. هەڵبەتە ئەم ناوچانە جۆرە سەربەخۆییەکیشیان پێبەخشراوە، بۆ نموونە لە ساڵانەی دواییدا ئیسپانیا دەسەڵاتی ناوەندی خۆی کەم کردەوە و سەربەخۆییەکی سنووردارکراویشی داوە بە هەرێمەکانی باسك، کەتالۆنیا، سەردینیا و ئاوستا.

٢.	مەبەست:

ئەم نووسراوەیە توێژینەوەیەکی زمانەوانییە بە مەبەستی دانانی میکانیزمێکی پراکتیکانە بۆ ستانداردکردنی (یەکخستنی) زمانی کوردی. هەروەها بەکورتی  باس لە

**گرنگی پێشهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا دەکات لە بەدیهێنانی ئەم مەبەستە.**

٣. زمان بەگشتی:

أ . گرنگی زمان:

**زمان ئامرازی تێگەیشتنە لە نێوان مرۆکاندا، بەهۆی زمان مرۆڤ لە خۆی و کۆمەڵگاکەی دەگات وەچارەسەری گەلێك کێشە دەکات لەوانەی کە رۆژانە رووبەرووی دەبێتەوە. زمان هەر وەك چۆن هۆکاری نزیکخستنەوەی کۆمەڵگاکانە، هەرئاواش رێگرێکە لە نێوانیاندا.**

**هەر وەك دەڵێن کاری سەرەکی زمان " نزکخستنەوەی هزرەکانە"، بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا زمان چەندین کاری گرنگی تریش بەجێ دەگەیەنێت وەکو:**

کاری گەیاندن: **زمان بەکاردێت بۆ گەیاندنی زانیاری ، بیرورِاو کونترۆڵکردنی خووی کەسانی تر. لێرەدا باس لە زمان دەکرێت وەك ئامرازێکی گەیاندن، دەربڕین و دەرپەڕاندن.**

أ. کاری ئامادەباشی هزری: **زمان یارمەتی مرۆڤ دەدات لە تێگەیشتن و وەرگرتن و دامەزراندنی هەڵوێستەکان لە ژیاندا، هەروەها لە چارەسەرکردنی گرفت ، هۆشیاری، فەرمان و مامەڵەکردندا.**

پ. کاری ئۆرگانیزەکردنی‌کۆمەڵ: **زمان بۆ رێکخستنی کۆمەڵگا و پێوانەکردنی پەیوەندی توێژەکانی کۆمەڵ بەکاردێت وە سیمبولێکیشە بۆ دەستنیشانکردنی پلەی کۆمەڵایەتی کەسەکان بۆ نموونە " باری ئابووری، کۆمەڵایەتی، تەمەن، پیشە، نەتەوە، ئاین، رەگەز.. هتد".**

ت . کاری دەربڕینی هەستەکانە: **بەهۆی زمان مرۆڤ حەز، خولیا، ویست و ئاواتەکانی دەردەبڕێت بۆ بەرامبەر و دەوروبەرەکەی، جا ئەم هەستانە باش بن یان خراپ، تایبەت بن یان گشتی.**

ج. کاری تۆمارکردنی راستیەکان: **زمان بۆ پاراستنی زانیاری بەکاردێت بۆ نموونە زانیاری مێژوویی، زانستی، بازرگانی، دارایی، یاسایی... هتد. تۆمارکردنی خاڵی هەرە**

**گرنگی کاری زمانە چونکە زۆربەی زانیارییەکان دەپارێزرێت بۆ نەوەکانی ئەمڕۆ و سبەی . شێوازی داڕشتن لە تۆمارکردندا سادەیە، ڕوونە و ناکەسایەتییە.**

**جگە لەو خاڵانەی سەرەوە زمان ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە دروستکردن و پەرەپێدان و پاراستنی کەلتووری نەتەوایەتیدا.**

ب. زمان و بیر:

**نزیکایەتیەکی زۆر لە نێوان زمان وهزردا هەیە. ڕۆژانە چەندەها نیشانە بەدی دەکرێت، کە مرۆڤ بە هۆی زمانیەوە بیردەکاتەوە. بە پێچەوانەوە دۆخی واش بەدی دەکرێت، کە مرۆڤ یەکەم جار بیردەکاتەوە دواتر بەرگ دەکاتە بەر بیرکردنەوەکانی و لە ڕێگای ووشە و ڕستە دەریدەبڕێت. بە شێوەیەکی تر زمان ئامرازێکی سەرەکییە لە دەربڕینی هزردا. جۆرەها شێوەی بیرکردنەوە هەیە، بەڵام مەرج نییە هەموویان ڕاستەوخۆ پەیواندیان بە زمانەوە هەبێت. هیچ بەلگەیەك نییە ئەو بسەلمێنێت کە زمان پەیوەندی لە دەربڕینی هەستەکانی مرۆڤدا هەبێت لە کاردانەوەی بۆ بابەتێك یان ڕووداوێك. لێرەدا زمان بۆ ڕوونکردنەوەی کارێگەری ڕووداوەکە یان بابەتەکە بەکاردێت و دەربڕینی هەستەکە هیچ پەیوەندی بە زمانەوە نییە! بۆ سەلماندنی ئەم گریمانەیە بەڵگەی زۆر هەیە، بۆ نموونە زمان شتێکی بنەڕەتی نییە بۆ ئەوانەی کە خەریکی چالاکی هونەرین، یەکێك لەمانە ئاوازدانەرەکانن کە دەڵێن ئێمە" گوێمان" لە مۆسیك دەبێت پێش نووسینی. هەروەها ڕۆژانە جۆرەها فەنتازیا و خەیاڵ بێ بیرکردنەوە جێبەجی دەبێت. لەلایەکی ترەوە زمان لە داڕشتنی بیرکردنەوەکانی مرۆڤدا گەلێك چالاکە. مرۆڤ بەهۆی زمانەوە بیردەکاتەوە لە گێڕانەوەی چیرۆکێك، چارەسەکردنی گرفتێك یان پلاندانانی کارێك بۆ نموونە بە قسەکردن لەگەڵ خۆیدا پێش گوتنێك یان کردارێك. ئەم جۆرە بیرکردنەوانە پێی دەوترێت بیرکردنەوی لۆجیکی چونکە هەردوو توخمی " دیدەکتیف و ئیندەکتیف"ی تێدایە [1].**

---

[1] Deductive elements کاتێك گرفتێك یان هاوکێشەیەك چارەسەر دەکرێت بە پێی مەرجی پێدراو وەکو هاوکێشەی ژمێریاری .

Inductive elements: کاتێك گرفتێك ماملەوە چارەسەردەکرێت بە پێی زانیاری زانراو وەکو شوێنێکی کار لە کۆمپانیایەك.

**زمـان بـۆ ئـەم جـۆرە بیرکردنەوەانـە گرنگـە چـونکە یارمەتیـدەرێکی سـەرەکییە لـە ئۆرگانیزەکردن و پێشکەشکردنی ئەوەی مرۆڤ بیری لێکردۆتەوە، کە بیڵێت.**

ئاشـکرا نییـە تـاکو چـەند زمـان خـۆی لـە چـۆنیەتی دارشـتنی بیرکردنـەوەکانی مـرۆڤ و تێگەیشتنی لە ڕاستیەکانی ژیاندا هەڵدەقورتێنێ . بەشێوەیەکی گشتی هەموو زمانـەکان هەمان سترەکتوریان هەیە، هەمان توانایان هەیە لە دابینکردنی پێویستی و ئەرکەکانـدا. کاراکتـەری زمـانی مـرۆڤ تـاکو ڕادەیـەکی زۆر بایۆلۆژیانـە داڕێـژراوە. پێکهاتـەی زمـان بریتییە لە دەنگ و وشە و ڕێزمان. جیاوازییەکانی نێوان یەکـەکانی پێکهاتـەی زمانـەکان مانـای بیرکردنـەوە و زیرەکـی جیـاواز نابەخـشێت. منـداڵ بـە گـشتی هـەمان مـاوەی دیاریکراوی دەوێت بـۆ فێربـوونی زمـانی زگمـاکی بـەبێ ڕەچـاوکردنی جـۆری زمـان. بـە کورتی هەڵگرانی بیروباوەڕی گەردوونییەکان **universalistic** دەڵـێن زمـان هـیچ ڕۆڵێکی نییە لە چـۆنیەتی بیرکردنـەوە و تێگەیـشتنی مـرۆڤ لـە ڕاسـتییەکانی ژیانـدا، وە ئەوان پێیان وایە کە هەموو زمانەکان خاوەن هەمان بنـەمای یەکسانن. بـە پێـچەوانەوە گریمانەیەکی تر هەیە لەلایەن ڕێژەییەکانەوە **relativism** کـە دەڵێـت بیرکردنـەوە و تێگەیشتنی مرۆڤ ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە زمانەوە. بە پێی بۆچونەکانیان هـەر زمانێـك کاراکتەری سیفات و نیشانەی تایبەتی خۆی هەیە کە لە زمـانێکی تـر جیـای دەکاتـەوە. لێـرەدا زیـاتر مەبەسـت لـە یەکـەکانی پێهاتـەی زمانـە، بـۆ نموونـە جیـاوازی نێـوان دیالێکتـەکانی زمانێـك جـوانترین نموونـەن. نموونەیـەکی بەرچـاوی تـری هـەڵگرانی ئـەم بۆچوونە ئەوەیە کـە گەشەسـەندنی تواناکـانی کۆگنـاتیفی **congnitive abilities** منداڵ دەبەستنەوە بەو زمانەی کە فێری دەبێت [٢] .

بـەکورتی دەکرێـت بگوترێـت بیرکردنـەوەی مـرۆڤ و شـێوازی بـەکارهێنانی زمـانی تـا ڕادەیـەکی زۆر بەنـدە بـەو ژینگەیـەی کـە تێیـدا دەژی، بـە شـێوەیەکی تـر بەنـدە بـە پەیوەندییــە کۆمەلاّیــەتی و ئابوورییــەکانی کۆمــەڵگا. کاتێــك نەتەوەیــەك زمــانێکی یەکگرتووی ئاخاوتنی نەبێت، پەیوەندییـە کۆمەلاّییـەتی و بەرژەوەندییـە ناوچـەییەکانی جیاواز بێت کەواتە بیرکردنەوەشیان جیاواز دەبێت.

---

[٢] Cognitive ability : لە سایکۆلۆجی، پەیوەستە بە توانای پرۆسەکانی ژیریی تێگەیشتنەوە.

### ٤. گۆڕانکاری لە زماندا:

#### أ. زمان گۆڕینەوە:

لە جیهاندا خەڵکێکی زۆر بە پێی جیاوازی زمانیان شان بەشانی یەکتر دەژین. لە زۆربەی دۆخەکاندا سیستەمە( سیاسی ـ کارگێڕی ـ ڕامیاریە- بەڕێوەبەرایەتیەکە ئەم خەڵکانەی لە یەك کۆکردۆتەوە، جیاکردۆتەوە یان خەڵکێکی یەك زمانی دابڕاندووە بۆ چەند بەشێك. بە شێوەیەکی تر، چەند خەڵکێکی زمان جیاوازی لە چوارچێوەی وڵاتیکدا کۆکردۆتەوە یان کۆمەڵێك کە خاوەنی یەك زمانە بەسەر چەند وڵاتیکدا دابەش کردووە. هۆکارەکانی یەکخستن و پەرتبوونی کۆمەڵگاکان مێژوویە ، بۆ نموونە کوردستان بە درێژایی مێژوو پەرت دەکرێت و جۆرەها زمان و کلتووری بێگانە بە سەردا دەسەپێنرێت و زمانی کوردی کە زمانی ڕەسەنی دانیشتوانەکەیە هەرگیز بە شێوەیەکی ڕەسمی پێناسە نەکراوە.

لەباری کونتاکتی زمانی لەم چەشنەدا **language contact situation** زۆر جار بە دوای چەند نەوەیەکدا کۆمەڵێك خەڵك کۆتایی بە بەکارهێنانی زمانیان دێنن و دەبن بە هەڵگری زمانی خەڵکێکی تر. ئەم حاڵەتە پێی دەگوترێت زمان گۆڕینەوە **language change** وەك ئەوەی بەسەر خەڵکی گالیکدا **Gaelic** هاتووە لە باکوور و ڕۆژئاوای بەریتانیای گەورەدا. زمان گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادرێت تاکو هەست بە مەترسی لە ناوچوونی نەکرێت لەلایەن بەکارهێنەرانیەوە. زۆر جار هەوڵدان بۆ پارێزگاریکردن و مانەوەی زمانێك بێ هودەیە چونکە ئەو زمانە چیتر ناتوانێت پێویستە زمانییەکانی بەکارهێنەرانی دابین بکات بۆیە خەڵك ناچار دەبێت ببێت بە هەڵگری زمانێکی تر.

زمان گۆڕینەوە لە گۆشەنیگایەکی مێژوویی و جیهانەوە دیاردەیەکی سروشتیە. وازهێنان لە زمانێك وە تواندنەوەی لە بۆدەقەی زمانێکی تردا هەبوو و هەر دەبێت، بۆ نموونە لەم سێ سەد ساڵەی دواییدا دەیەها زمان لەناوچوون بەهۆیکۆلۆنیالیزمی ئەوروپیەکانەوە. لە ناوچوونی زمانێك تەنها مانای زیان نییە بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو، بەڵکو ئەمە زیانێکە بۆ سەرجەم شارستانیەت، کە پێکهاتەکەی فرە زمانییە. جگە لەوەش هەر زمانێك هەڵگری کلتوورێکی ، فەلسەفەیەکی وە شێوازی ژیانێکی دیاریکراوە.

هۆکارەکانی مردنی زمانێك یان دیالێکتێك دەگەڕێتەوە بـۆ گۆڕانکـاری لـە پێکهاتـەی ئابووری، کۆمەلآیەتی، ڕامیاری، دیمۆگرافی کۆمەڵگا. گۆڕینی هەیکەلی کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی و خێڵەکی بەیەکێکی تری نوێی پیشەسازی یان نیمچە پیشەسازی دەبێتـە هۆکـاری گۆڕانکـاری گەورە لە زمان و کلتووردا چونکە خەڵك لە گەلێك ناوچەی جیـاوازەوە تێکـەلاّو دەبێـت. لـەپاڵ ئەمەشدا دامەزراوەی نوێ و کارگەو دەزگاکانی بەڕێوەبردن و ماس مێدیا و پرۆسـەی فراوانبـوون و گەشەسەندن برەو دەدات بە زیادکردنی جووڵەی کۆمەلآیەتی و تێکـەل بـوونی دانیـشتوان لـە هەموو ناوچە جیاجیاکانی وولآت و توێژەکانی کۆمەڵ، بۆ نموونە بە هۆی ژن هێنانەوە. ئەمانـە هۆکاری گرنگن لە لاوازکردنی دیالێکتەکان وە بەهێزکردنی یەك زمانی ولآت. لە دۆخێکـی لـەم چەشنەدا، زمانی زۆرینە زیاتر بەکادێت وە تاکو دێـت زمـانی کەمینـە لاوازتـر دەبێـت بـەوەی کەمترو کەمتر بەکاردێت. ئەم بـارە لـە زۆر لای جیهـان ڕوویـداوە و مردنـی گـەلێك زمـانی بـە خوۆوە دیوە، چونکە خەڵك ناچار دەبێت لە چوارچێوەی ئەم سیـستەمەدا بـژێوی خـۆی پەیـدا بکات وە هیچ ئەڵتەرناتیڤێکی تری بۆ ناهێڵرێتەوە. ئەم گۆڕانکارییانـە هەرچـەند بـە ڕواڵـەت وا دیارە سروشتییە بەلاّم هەمیشە ڕامیارییەکی داڕێژکراوی ولآتـی زمـانی بالآدەسـتی لـە پـشتە بـۆ تواندنەوەی دیالێکتەکان/ کەمینەکان.

بەکارهێنانی زمانی کەمینە هەمیشە سنووردارە بە بەراورد لە گـەڵ زمـانی زۆرینـە، چونکە زمانی کەمینە لە سیستەمی ڕامیاری، دەزگا و فـەرمانگاکان و خوێندنـدا بەکارنایـەت، بـەڵکو تـەنها لـە حاڵـەتی نـاڕەسمی وەکـو هێمایـەك بـۆ ئەمـەك و پاپەنـدبوونی کۆمەلآیـەتی بەکاردێت. ئەمە وا دەکـات کـە کەمینـە هەرچـی دۆمینـی کـارکردنی زمـانی بالآدەسـت هەیـە بزانێت وە بەکاربهێنێت کە هەڵبەتە لە زمانەکەی خوێدا نییە یان پێی نازانێت. جگـە لـەوەش بارە ئابووریە کۆمەلآییەتییەکە مرۆکان ناچار دەکات کە دووزمان بن بـۆ ئـەوەی چـالاك بـن لـە ژیاندا بۆ نموونە بۆ دەستکەوتنی کـارو پیـشە. دوو زمـان زانـی(دوو زمانـە) بـە قۆنـاغی یەکـەم دەژمێررێت لـە پرۆسـەی زمـان لـە دەسـتدان، لـە ماوەیـەکی درێژخایەنـدا ئەمـە دەبێتـە هـۆی کەمکردنەوەی قسەکەرانی زمانی کەمینە وە ئەمـەش واتـای مردنـی زمـان یـان زمـان گۆڕینـەوە دەدات.

وازهێنان یان تواندنەوەی زمانێك بە تێكەڵبوونی كەمینە لەگەڵ زۆرینە دەست پێدەكات كاتێك كەمینەبە خۆشی بێت یان ناخۆشی لە هەموو پرسیارەكانی كۆمەڵدا چالاكانە ڕۆڵ دەبینێت. بە پێچەوانەوە ئەگەر كەمینەیەك نەیویست چالاك یان هەڵسووڕاو بێت لە كۆمەڵدا و خۆی دووەرپەرێز گرت یان دوورە پەرێزیان كرد ئەوا گۆڕانكاری كۆمەڵایەتی و هۆشیاری فەرهەنگی كەمتر تێیدا ڕوودەدات و لەلایەن زۆرینەوە خەڵكەكەی بە تەمەڵ و دواكەوتوو ئاست نزم ناوزەد دەكرێت.

زمانی باڵا دەست لە عێراقدا عەرەبییە وە كورد زمانێكی **standard** یەكگرتووی نییە تاكو پێویستییەكانی زمانی مرۆڤی كورد دەستەبەر بكات. لە عێراقدا هەم كورد ناچارە زمانی عەرەبی بەكاربهێنێت وە هەم عەرەب بەرنامەی داڕێژكراوی تەعریبی هەیە هاوكات لەگەڵ بەرنامەكانی ئاوەدانكردنەوە و گەشەپێدان.

**ب. زمان ودیالێكت.**

پێناسەیەكی گشتی بۆ دەستنیشان كردن یان جیاكردنەوەی دیالێكت لە زمان نییە، بەڵام ئەگەر كۆنتاكتی پێوەرێك بێت بۆ لە یەك گەیشتن وە كۆنتاكتی زمان بۆ ناتێگەیشتن ئەوا زۆر زەحمەتە هێڵێك لە نێوان هەردووكیاندا بكێشرێت. لە هەندێك شوێندا زاراوە جیاجیاكانی زمانێك بە دیالێكت دادەنرێت ئەگەرچی هیچ جۆرە تێگەیشتنێكیش ڕوونادات بۆ نموونە لە نێوان دوو كەس لە چین، ئەگەر یەكێكیان لە پەكینی پایتەخت بێت وە ئەوی تریشیان لە شاری گەورەی شەنگەهای . هەردوو زاراوەكە بە دیالێكت دەژمێرێت لە هەمان سیستەمی زماندا، چونكە هەردووكیان هەمان ڕێنووسیان هەیە و سەر بەهەمان سیستەمی ڕامیاری و بەڕێوەبەرایەتین لەلایەكی ترەوە زمانی پورتگالی و ئیسپانی لە لایەك و زمانی سویدی و نەرویجی لە لایەكی تر بە دوو زمانی جیاواز دادەنرێت هەرچەندە قسەكەرانی ئەم دوو زمانە " هەریەك لە لایەك" لە یەكتر تێ دەگەن. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نموونە سوید و نەرویج دوو وڵاتی جیاوازن و دوو ڕێنووسی جیاوازیان هەیە.

بەكورتی زمان لە دیالێكت جیادەكرێتەوە بەهۆی ئەوەی زمان لەلایەن هەموو خەڵكەوە بەكاردێت، دیسان زمان ڕێنووسێكی ستانداردی هەیە. ڕێزمانی هەیە و بەكاردێت لە فێرگەو دامەزراوەكان و ماس مێدیا و.. هتد. لەبەرامبەردا دیالێكتەكان لەلایەن خەڵكێكی كەمتر

پــەرەوازە و دوورەپــەرێز بــەکاردێت. لــە هــەموو گــرنگتر دیالێکــت " بەرهــەمێکی" سروشــتی ناوچەیەکی دیاریکراوە، بەلاّم زمان " بەرهەمێکی" دەستکرد و پلان دارێژراوە (دەکرێت بگوترێ کـۆکراوەی هـەموو دیالێکتەکانـە) و ئاراسـتەی هـەموو ناوچـەکانی وولاّت دەکرێـت و ئامـانجی ڕامیاری لە پشتە، بۆ نموونە زمانی X لە چوار دیالێکت پێك دێت (بڕوانە سکێچی ١).



D C B A

سکێچی ١ زمانی X

زمـانی X لـە چـوار دیالێکـت پێـك دێـت. ئاسـتی تێگەیـشتن لـە نێـوان قـسەکەرانی دیالێکتی A وB و B و C وە C و D بۆ هەموو دیالێکتەکان باشە.

**ت. مرۆڤی دوو زمانەو کەسایەتی:**

دەستەواژەی دووزمانە بەسەر ئەو کەسانە جێبەجێ دەبێت کـە بتـوانن دوو زمـان قـسە بکەن لە ئاستی کەسێك بۆ زمانی زگماك. ئەم پێناسەیە کەم کـەس دەگرێتـەوە چـونکە نزیکەی هەمیشە کەسانی دوو زمانە جۆرە دابەشکردنێکی زمانیـان هەیـە لـە ئەرکـەکانی گوتاردا، بۆ نموونە گوتارەکان لە بابەتێکدا سروشـتییانە دادەڕێـژرێن لـە زمـانی یەکـەم تاکو دووەم. بەم شێوەیە دەکرێت بگوترێـت ئاسـتی توانـای زمـان دەگۆڕێـت لـە نێـوان هەردوو زماندا.

لە بارەی ئاستی توانای دوو زمانی جۆرەها بۆچوون هەیە. نەخشەی خـوارەوە کورتـەی نیشاندانێکی چوار ئاستە، هەریەکەو خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە:

| خەسڵەت | زمانی دایك ئەو زمانەیە که مرۆڤ | ئەو کەسە دوو زمانە کە |
|---|---|---|
| a. سەرچاوە | فێری بووە | a.لەمنداڵییەوە فێری دووزمانی بووە لە خێزانێکی دوو زمانە.<br>b. لە منداڵییەوە دوو زمانی بەکارهێناوە بۆ پەیوەندی کردن. |
| b. توانای شارەزایی ئامادەباشی | باشترین توانای هەیە | a. توانای دوو زمانی هەیە بە تەواوی.<br>b توانای دوو زمانی هەیە هەر وەك زمانی زگماك.<br>c توانای دوو زمانی هەیە هەر وەك یەك.<br>d. توانای بەرهەم هێنان و دەربڕینی مانای تەواوی هەیە لە زمانی دووەمدا.<br>e. بەلایەنی کەمەوە زانیاری و توانای هەیە لەسەر پێکهاتەی ڕێزمانی زمانی دووەمدا.<br>f. کۆنتاکتی پەیدا کردووە لەگەڵ زمانی دووەمدا. |
| c. ئەرکەکانی زمان بەکارهێنان | زۆر بەکاری دەهێنێت | دوو زمان بەکار دەهێنێت (یان دەکرێت بەکاری بهێنێت) لە زۆربەی دۆخەکاندا (بەپێی ئارەزووی خۆی یان ویستی کۆمەڵەکەی). |
| d. هەڵوێست و بۆچوون ناساندن و ناسان | a. خۆی پێی دەناسێنێت.<br>b. لە لایەن کەسانی ترەوە وەکو قسەکەرێکی زگماك دەناسرێت. | a. خۆی پێناسە دەکات وەکو دووزمانە، وەکو خاوەنی دوو زمان یان دوو کەلتوور.<br>b. پێناسەی دەکرێت لە لایەن کەسانی ترەوە وەکو کەسێکی لەدایکبووی دوو زمانی زگماك. |

**نەخشەی ١**

**ئاستی توانای مرۆڤی دوو زمانە**

بـەپێی خەسـڵەتی سەرچـاوەیی ئـەو کەسـەی دوو زمـانی بـەکارهێناوە لـە سـەرەتای منداڵییەوە دوو زمانەیـە. بـەپێی خەسـڵەتی شـارەزایی، ئاسـتی توانـای دوو زمـان پێـوەرە بـۆ کەسێکی دوو زمانە. لەم خاڵـەدا پـسپۆرانی زمـان ڕێـك نەکـەوتوون لەسـەر چـۆنیەتی دەسـت نیشانکردنی خەسڵەتی شارەزایی، بەڵام بە کورتی دەڵێن" دوو زمان ئەو کەسەیە کە جگـە لـە زمانی زگماك، بەلایەنی کەمەوە لە کاتی گفتوگۆدا توانـای بـشکێت بەسـەر زمـانی دووەمـدا، هەڵبەتە لەگەڵ جۆرە تەتەڵەیەکـدا". خەسـڵەتی سێیەم ـــ خەسـڵەتی ئـەرکی زمانـەوانی ـــ ئەوەیە، کە چۆن کەسێك بتوانێت هەریەك لە زمانی یەکەم و دووەم لە جۆرەها دۆخدا بـەپێی پێویست بەکاربهێنێت. خەسڵەتی چوارەم ـ خەسـڵەتی بۆچـوون و هەڵوێـست ـ ئەوەیـە کـە کەسێك خۆی یان لە لایەن کەسانی ترەوە بە دوو زمـان (خـاوەنی گوتـاری دووزمـان) پێناسـە بکرێت.

بەشێکی زۆری دێباتی ڕەسمی لەسەر دوو زمانی بـاس لـە باشـی و خراپـی دەکـات. ئاشکرایە زۆربەی خـەڵکی لەسـەر ئـەوە ڕێـك کـەوتوون، کـە تـاکو مـرۆڤ زمـانێکی زیـاتر بزانێـت هـەلی باشـتری دەسـت دەکـەوێت لـە بەشـداری کردنـی جۆرەهـا کلتـور و هـزر و چالاکی جیهانیدا. هەڵبەتە ئەمە شتێکی باشە و ولاّتان پارە و کاتێکی زۆر دەبەخشن بۆ ئـەوەی ڕۆڵـەکانیان فێـری زمـانی بێگانـە بکـەن. خاڵـە باشـەکانی مرۆڤـی دوو زمانـە بیرکردنـــەوەی هەمەلایەنانەیـــە – **diverse thinking** –، نـــەرمی هزریـــە – **cognitive flexibility** ـ. مەبەست لە بیرکردنەوەی هەمەلایەنانە توانـای بینینـی گرفتە لە زۆر لای جیاواز و نادیارەوە، واتـە دۆزینـەوە و داهێنـانی چارەسـەری نـامۆ بـۆ گرفتوکـان نـەرمی هزریـە بـە گـشتی پەیوەسـتە بـە خولقانـدنی زیرەکـی بزێوانـە. جگـە لەوەش مرۆڤ هەڵوێستێکی کراوە و نەرمی دەبێـت بەرامبـەر بـە زمانـەکانی تـر. سـیفاتە خراپەکانی کاردادنەوەی دوو زمانی لەسەر کەسایەتی مرۆڤ زیـان گەیاندنـە بـە هەسـت و سۆزی مرۆڤ و توانای ژیری. خۆ ئەگەر زمانی دووەم زمانی نەتەوەیـەکی داگیرکـەر بێـت بە زۆر سەپێندرابێت بەسەر خـەڵکانێکی ـــ نەتەوەیـەکی ـ تـردا ئـەوا زیانـەکانی قـووڵتر دەبێت و ڕۆڵی دەبیچت لە تێکشکانی کەسایەتی مرۆڤدا و بەوەی دەروونی مـرۆڤ ئـازاری

پێدەگات و هەمیشە هەست بە بچووکی و ملکەچی و زۆرداری نەتەوەی سەردەست دەکات.

## ٥. زمانی ڕەسمی، زمانی نەتەوەیی، زمانی ستاندارد

زمان دەکرێت لە کۆمەڵگادا جۆرەها ئەرکی "function" هەبێت. پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان ئەرکەکانی و سیفەتەکانی زماندا هەیە. زمان دەبێت بە زمانی ڕەسمە ئەگەر خاوەنی پلەیەکی بەرزی ستاندارد بێت لە گفتوگۆ و نووسین و هەموو بوارەکانی ژیاندا بەتایبەتی ڕامیاری ، بەڕێوەبردن و فێرگەییدا. هەروەها دەبێت شێوازی ستاندارد لە لایەن زۆرینەی ڕۆشنبیران و خوێندەواران زانراو و پەیڤکراو بێت.

بۆ ئەوەی زمان وەکو زمانێکی نەتەوەیی بەکاربێت، مەرج نییە قسەکەرانی زمانەکە خاوەن وڵاتێکی سەربەخۆبن، دەبێت زمانەکە لەلایەن ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوان پەیڤ بکرێت و لە ئاڵوگۆڕ و دەمەتەقێی ڕۆژانەدا بەکاربهێنرێت. دیسان دەبێت زمانەکە وەکو سیمبوولێکی ئێتنیکی یان پێناسەی نەتەوەیی بەرجەستە بووبێت لە هەمان کاتدا دەبێت زمانەکە بوونی ئاستێکی بەرزی ستانداردی تێدابێت وەکو زمانێکی ( ڕاستەقینە) سەیر بکرێت بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی دەربخات وەکو هەڵگری هەموو بنەماکانی زمانی ڕەسمی لە وڵاتێك یا ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی. لە ڕاستیدا هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان هەردوو دەستەواژەی زمانی نەتەوەیی یان ڕەسمی. لە پراکتیکدا وڵات زمانی ڕەسمی هەیە بەڵام نەتەوەکە مەرج نییە خاوەنی وڵات بێت، دەکرێت خاوەنی زمانی نەتەوەیی بێت.

زمان دەبێت ئاستێکی بەرزی پێشکەوتن و ستانداردی هەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت ببێتە زمانی وانە وتنەوە و ئامرازێك بێت بۆ گوتنەوەی زمانی زگماك لە فێرگە و دەزگاکانی تری خوێندندا. هەڵبەتە دەبێت پەرتووك و کەرەستەی مۆدێرن و پێشکەوتوو فەراهەم کرابێت لە ئەنجامدانی چالاکییە زمانیەکاندا.

زمانی ستاندارد وەك دیالێکتەکانی خۆڕسك نییە، بەڵکو دەستکرد و بەبەرهەمهێنراو و گەشەپێدراوە " یان بەرهەم دێت و گەشەی پێ دەدرێت" لە هەلومەرجێکی کۆمەلأیەتی و رامیاری دیاریکراودا بۆ گەیشتن بە مەبەست و ویستی خوازراودا. زمانی ڕەسمی یان ستاندراد لە ئەنجامی پلان دانانی شارزایانی نەتەوەیەك یان ئێتنیکێکی دیاریکراو پەیدا دەبێت. پیتەکان، وشەسازی و فەرهەنگی ووشە بە گوێرەی داخوازی و ئەگەرە چاوەڕوانکراوەکانی ڕێزمان و بانکی وشەوە دادەنرێت. زمانی ستاندری زۆربەی نەتەوەکان پلان دارێژراوە و هەمیشە خزمەت دەکرێت لە لایەن ئۆرگانە رامیارییەکانەوە، وەکو ئەکادیمیای زمان.

جگە لەسوودە ئاشکراکانی پراکتیزەکردنی زمانی گەشەکردووی ستاندراد، زمانی ستاندارد ئەرکی گرنگ دەبینێت لە خزمەتکردنی یەك دانیشتوانی بە تایبەتی لە هێنانە دی یەك وتاری هاوبەش کە بە پێویستییەکی ژیانی دادەنرێت بۆ نەتەوەکان. زمانی ستاندارد " ئەو زمانە پاکە" زیاتر بە مێژووی خەڵکەکەوە گرێدراوە بە تایبەتی ئەو نەتەوە یان ولأتانەی کە خۆیان بە خاوەنی مێژوویەکی کۆن دەزانن. بەهای سیمبۆڵی زمان لە یەکخستنی قسەکەران و دەست نیشانکردنی سەربەخۆیی و جیاوازییان لە لە بەرامبەر ولأت و نەتەوەکانی تر دایە.

زمانی ستاندارد دوای چەند هەنگاوێکی یەك لە دوای یەك دروست دەبێت هاوگن (Christopher Stroud ,p44 kenneth hyltenstam)Haugen پێشنیاری چوار توخمی سەرەکی دەکات بۆ بەدیهێنانی زمانی ستاندارد: هەڵبژاردن selection، کۆددانانcodifiction

ئەرکەکانی تاقیگەیی the fuction of laboring و ڕازی بوون accepting. لە توخمی هەڵبژاردندا دیالێکتێك یان چەند دیالێکتێك هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەوەی ببێت بە بنچینە بۆ زمانی ستاندارد. ئەم هەڵبژاردنە پشت بە هەڵوێستی رامیارانە دەبەستێت زۆر جار لە هەڵسەنگاندنی زمانەوانی دوورە.

کۆددانان ـ ستانداردکردن ـ واتە چۆنیەتی قاڵب وەرگرتنی فۆرمی نووسین لە زمانی ستانداردا

( ڕێزمان، بانکی وشە و ڕێنووس). دوای ماوەیەك زمانی ستاندارد دەبێت بە نۆرمێکی ئاسایی نووسین و قسەکردن. هەڵبەتە نووسینی ستاندارد دەبێت بە پارێزراو **conservative** بە بەراورد لەگەڵ قسەکردنی ستاندارد، چونکە قسەکردن زیاتر لە نووسین ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت. گۆڕانکاری لە نووسینی ستانداردا پەیدا دەبێت ئەگەر بەکارهێنانی (نووسەران) نووسینەکانیان بە پێی گۆڕانکارییەکانی قسەکردن بگۆڕن.

مەبەست لە ئەرکەکانی تاقیگەیی پەیوەندی زمانی ستانداردە بە بواری بەکارهێنانەوە کە بۆ یەکەم جار لە دەزگا ڕسمییەکاندا ( پەرلەمان، دادگاکان، خوێندنگاکان، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەو .. هتد) جێبەجێ دەکرێت. بۆ ئەوەی زمانی ستاندارد لەگەڵ داواکاری هەموو بوارەکاندا بگونجێت پێویستە بانکی وشە گەشەی پێبدرێت بۆ بەرجەستەکردنی مانای نویێ، بۆ نموونە لە بوارەکانی زانستی و بەڕێوەبەرایەتیدا، وەك دەڵێن نویێ خوازی **modernizition** وە هەروەها زیاتر کردنی نەرمونیانی زمانی ستاندارد.

بەهای زمانی ستاندارد پشت بەوە دەبەستێت کە تا چەند قسەکەران پێی ڕازین یان ڕازی دەکرێن. توانای قسەکەران لە بەکارهێنانی زمانی ستانداردیش بەندە بە دابینکردنی پێویسیتیەکانی خوێندنەوە. هەڵبەتە مسۆگەرکردنی چەند ساڵێکی خوێندن بەردی بناغەی ئەم پرۆسەیە دەبێت. لێرەدا ناکرێت ڕۆڵی ماس مێدیا و ڕیکلام و چالاکییە هونەری و گەیاندن و بازرگانییەکان فەرامۆش بکرێت.
وا دەردەکەوێت کە جیاوازی نێوان زمانی ستاندارد و دیالێکتەکان دیکۆتۆمی بێت [٣] .
لە ڕاستیدا زمانی ستاندارد دەکرێت جۆرەها شێوەی دووری پەرەسەندن وەربگرێت،

---

[٣] dichotomy جیاکردنەوەی دوو گرووپ یان دوو شت کە تەواو پێچەوانە و جیان لە یەکتر.

بۆیە ماوەی هەنگاوەکانی ئاڵوگۆڕ لە دیالێکتەکان بۆ ستاندارد کۆنتنیۆمە [٤] . کلۆس/ فاسۆڵد klos & fsold

( سەرچاوەی پێشوو، لا 45) پێنج پلەیان داناوە لە پرۆسەی ستاندارێز کردنی زماندا:

١. زمانی تەواو پەرەسەندووی ستاندارد: لەم قۆناغەدا لە سەر ئاستی زتنکۆکان زانیاری نوێ ئاڵوگۆڕ دەکرێت. زمانی ستاندارد زمانی ڕەسمی وڵاتە.

٢. زمانی ستاندارد لە گرووپی (نەتەوەیەکی) کەمدا: ئەگەرچی لەم قۆناغەدا زمانی ستاندارد لەمێژە هەیە، بەڵام وتاری هاوبەش زۆر کەمە و ناتوانێ زۆربەی بوارەکانی ژیان بگرێتەوە.

٣. زمانی ستانداردی گەنج: لەم قۆناغەدا زمان دەست بە کۆدکردنی دەکرێت. ئەرکەکانی تاقیگەیی هێشتا لە سەرەتادایە. زمانی ستاندارد دەکرێت بۆ قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی بەکار بهێنرێت بەڵام نەك بۆ قۆناغی بەرزتر.

٤. زمانێکی ناستاندارد لە گەڵ ئورتۆگرافی: سیستەمی نووسینی هەیە بەڵام یاساکانی ئەم سیستەمە دانەڕێژراون لە کتێبەکانی خوێندنی زماندا.

٥. زمانی پێش نووسینی هونەری: زمانێك کە هێشتا پرۆسەی پەرەسەندنی زمانی ستانداردی بە خۆوە نەدیوە.

هەموو ئەو خاڵانەی (پلە) سەرەوە لە کەمینە زمانەکانی جیهاندا دەبینرێت، هەر چەندە پلەکانی ٢ تاکو ٥ ئاسایی ترینیانە ( ئەم بۆچوونە زمانی کوردیش دەگرێتەوە).

## ٦. ئێتنیك Ethnic و نەتەوە Nation

**لە زۆربەی فۆرمێلەکردنەکاندا کاتێك باس لە پاراستنی زمان دەکرێت گرووپی کەمینە و ئێتنیکی بەرامبەر یەك دەکرێن، هەرچەند ئێتنیك دەکرێت زۆرینە بێت و خاوەنی وڵاتی**

[٤] continuum زنجیرەیەك نایتمی " بابەت" لەیەکچوو بە شێوەیەك کە نایتمی یەکەم لە دووەم دەچێت وە دووەم لە سێیەم دەچێت تاکو ئەوەی دواهەمین نایتم زۆر جیاواز دەبێت لە یەکەم.

سەربەخۆی خۆی بێت. هۆکارەکانی ئـەم بەرامبەرکردنـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە کەمینە لە زۆرینە هۆی زیاتری هەیە بۆنیشاندانی  خەسڵەتەکانی ئێتنیکی.

پێناسەیەکی گشتی بۆ ئێتنیك بریتییە لە " هەستی هاوهەمەهەنگی لەگەڵ گرووپێك کە بنچینەکەی خەسڵەتی هاوبەشە وەکـو زمـان ، ئـایین، ڕەگـەز ". خـاڵی نێوەنـدی ئـەم پێناسـەیە بریتییـە لـە هەسـتە خـودی و دەروونـی کۆمەڵایـەتی هاوبەشـە وەکـو پێویـستییەکی یەکلاکـەرەوەی ئێتنیکـی. نیـشانە بابەتییـەکانی ئێتنیکـی وەکـو کارەکتەرەکانی کولتووری کۆمەڵایەتی، دەکرێت لێرەدا ئاماژە بە چەند خـاڵێکی گـرنگ بدرێت:

١. سەرچاوەیەکی هاوبەش .
٢. ناوچەیەکی دیاریکراوی هاوبەش.
٣. کولتوورێکی هاوبەش.
٤. ئایین، باوەڕێکی هاوبەش.
٥. زمان.
٦. بەتەنگەوەبوون، ئەمەك و شۆفینزم.
٧. فۆرمی خێزان  دروستکردن ، بونیادی خێزانی.
٨. ژنهێنان لە چوارچێوەی گرووپێکدا endogamy.

نەتەوە و ئێتنیك گەلێك خاڵ کۆیان دەکاتەوە، بـەڵام دەکرێـت بـە نەتـەوە بگوترێـت " ئێتنیکێکی هۆشیار" ، " ڕێکخستنێکی هاوئاهەنگی ئیتنۆکـەلتوور " یـان" ئێتنیکیکـی ناڕازی کە داخوازی جیابوونەوە دەکات ". هەر چۆنێك بێت چەند خاڵێکی هاوبەش هەیە بۆ پێناسەکردنی نەتـەوەیی **nationalism** , بـەپێی پاوڵستۆن **Paulston** ( سەرچاوەی پێشوو، ل **26** ) بریتییە لە :

١. هەستکردن بە یەکبوونێکی گرووپی بەهێز.
٢. هەوڵدان بۆ مافی خۆبەڕێوەبردن.
٣. بوونی یان هەوڵدان بۆ بوونی هەرێمێك.

٤. **هەرەشەیەکی هەستپێکراو لە لایەن گرووپێك یان چەند گرووپێکی ترەوە.**

٥. **خاوەن پێشرەوانێکی بەرز و خوێندەوارو بەهێزە.**

**خاڵێکی جیاوازی تری نێوان نەتەوە و ئێتنیك ئەوەیە کە نەتەوە نەك هەر داوای یەکسانی دەکات لەگەڵ نەتەوەکانی تر بەڵکو هەوڵ دەدات مەرجەکانی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت.**

**لە ڕوانگەیەکی مێژووییەوە ئاشکرایە کە سێ کوچکەی ئایدۆلۆجی نەتەوەیی بریتییە لە یەك زمان و یەك وڵات. ئەم ئایدۆلۆژییە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە سەری هەڵداوە و زۆربەی نەتەوەکانی جیهان ئەم قۆناغەیان لە مێژە بڕیوە. کورد نە یەك وڵاتی هەیە، نە یەك زمانی ( ستاندارد) هەیە وە تیۆری خەڵکەکەی یەك هزری نەتەوەیی هەیە بەڵام بە کردەوە هزری خێڵەکی و بنەماڵەیی و ناوچەگەرییەتی سەلماندووە.**

٧. وێنەیەکی گشتی

أ. زمانی کوردی:

**زمانی کوردی سەر بە کۆمەڵەی زمانە ئێرانییەکانە لە چوار دیالێکتی سەرەکی پێکدێت " کرمانجی باکوور، کرمانجی ناوەڕاست، کرمانجی خواروو و گۆرانی (فواد حمە خورشید،1985، لا 40 ). هەر دیالێکتێك پێکهاتەی چەند زاراوەیەکی بچووکی ناوچەییە. ئاستی تێگەیشتنی نێوان قسەکەرانی دیالێکتەکان بۆ یەکتر دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی جوگرافی، ئاڵوگۆڕی ئابووری و هونەری و وێژەیی و هەروەها ڕادەی هۆشیاری و پلەی خوێندن و ویستی قسەکەران و دۆخی کات و شوێنەکە وەك هەر زمانێکی تر لە جیهاندا.**

**ڕاستییەکی ئاشکرا ئەوەیە کە تاکو ئێستا " سەرەڕای هەموو شۆڕش و ئاڵوگۆڕەکان" ئاستی تێگەیشتنی نێوان قسەکەرانی دیالێکتەکانی کوردی لە یەکتری کەمە " لێرەدا**

باس لە زمانی یەکگرتوو یان ستاندارد ناکەم چونکە نییە". هۆکارەکانی ئەم کەم یان ناتێگەیشتنە دەگەڕێتەوە بۆ گەلێك هۆ لەوانە مێژوویی وەك شەڕ و دوژمنایەتی ناوخۆیی، دامەزراوەیی (administration)

وەك نەبوونی بەڕێوەبەرایەتی کوردی، ئایینی وەك بوونی شیعە، سونی، عەلەویی، یەزیدی، و کاکەی، ناهۆشیاری وەك گوندەیی و کەل لەرەقی لە ئەنجامی نەزانی، تاکەکەسی وەك نەبوونی داو و دەزگاو کۆمەڵە کە بە کردەوە نوێنەری تۆێژە جیا جیاکانی جەماوەر بێت، دەروونی وەك دڵپیسی و قین و باوەڕ بە یەك نەبوون، کلتووری باڵادەستی نەتەوە سەردەستەکانی کوردستان و ..هتد. لە پاڵ ئەمانەدا نەخوێندەواری، هەژاری، نەبوونی یان کەمی ڕێگا و بان و ئامرازی هاتوچۆ، دابڕانی کورد لە یەکتر بە پێی یاسا و بڕیاری پلانداڕاوی مەبەستدارانە. ئەمانە هۆکاری ڕیشە داکوتراون لە کۆمەڵگای کوردیدا و نەتەوە داگیرکەرەکانی کوردستان دریغی ناکەن و نەیان کردووە لە ڕژاندنی تۆویی براکوژی و دوورە پەرێزەکردن ودابەشکردن و سووککردنی مرۆڤی کورد بە دەستی کورد بە مەبەستی کوشتنی ڕوحی هاوکاری و یەکسانی و خۆشەویستی لە کۆمەڵی کوردەوارییدا. لە بەرامبەردا کورد پلانێکی نەخشە بۆ کێشراوی ڕوون و دیاریکراوی نییە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم پلانە دوژمنکارانە بەوەی کە لە هزر و بیر و دەروونی هەر مرۆڤێکی کوردا ئایدۆلۆژییەکی ڕەسەن و پاك و پتەوی کوردانە بڕوێنن کە سەربەخۆ و جیای بکاتەوە لە هزر و زمان و کلتووری نەتەوە داگیرکەرەکانی کوردستان بۆ نموونە گەنجی کورد ڕابهێنرێت لە گوێگرتن بۆ گۆرانی و مویسیکی کوردی بە مەبەستی هێمن کردنەوەی مێشك و فراوانکردنی هزری و ڕوحی و گیانی خۆشەویستی " لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە هونەری موسیکی کوردی بە بەراورد لەگەڵ زمانەکانی تری جیهانی لە ئاستێکی بەرزی چلۆنایەتی و چەندایەتی نییە، ئەمەش یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی گوێگرتنی مرۆڤ کورد لە موسیکی نەتەوە داگیرکەرەکانی کوردستان " یان لە شاری هەولێر و خانەقین بێگانە ناچار بێت کوردی بپەیڤێت نەك وەکو ئێستا هاووڵاتی کورد بە شەوقەوە پێشوازی لە کەسێکی بێگانە دەکات تا بە زمانەکەی قسە بکات تەنها بۆ ئەوەی بیسەلمێنی بۆ نموونە زمانی عەرەبی دەزانێت بێ

ئەوەی هەست بە هیچ ملکەچییەك بكات.ئایدۆلۆژییـەك كـە كەسـایەتی كـورد دروسـت بكات، باوەڕ و هیوا و دڵخۆشی پێببەخشێت و وویست و خۆشەویستی و ئارەزووی زانین وتێكەڵاوبوونی لە گەڵ دیالێكتەكانی تـردا لا بروێنێـت تێگەیـشتنی یـەك زمـان و هـزری دەخولقێنێت.

بەپێویـستی دەزانم بـە كـورتی بـاس لـە شـوێنی جـوگرافی دیالێكتـەكان بكـەم پـێش باسكردنی زمانی ستادارد،ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. دیـالێكتی كرمـانجی بـاكور: وەك بایەیزیـدی، هـەكاری، بۆتـانی و.. هتـد. لـە كوردستانی توركیا، سوریا، عێراق و ئێران. زۆرینە پێك دێنێت.

٢. دیالێكتی كرمانجی ناوەڕاست: وەك گەرمیانی، سۆرانی ، موكری ..و هتـد. لـە كوردستانیعێراق و ئێران.

٣. دیالێكتی كرمانجی خواروو: وەك لوڕی، بەختیاری، لەك و..هتد. لە كوردستانی عێراق و ئێران .

٤. دیـالێكتی گـۆرانی: لـە دوو بـەش پێـك دێـت، بەشـی یەكـەمیان بریتییـە لـە هـەورامی، گـۆرانی ڕەسـەن و باجـەلانی وە دەكەوێتـە هـەردوو بەشـی ئێـران و عێراقەوە. بەشی دووەم زازایـی دەكەوێتـە كوردسـتانی توركیـا. سـەرەڕای دووری جوگرافی نێوان هەردوو بەشەكە گەلێك بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی ( وشە، ڕستە و فونەتێك) هەیە هەردوو بەشەكە لە یەك چوارچێوەدا كۆبكاتـەوە. مـن خێزانێكـی ئاشنای زازاییم هەیە، كە زۆر شارەزای زمانن وە گەلێك جار باسی ئـەم بابەتـەمان كردووە. هەڵبەتە ئەوان گەلێك بەڵگەی ورد و درشتیان لایە بـۆ سـەلماندنی بـوونی زازا وەكو پێكهاتەیەكی دیـالێكتی گـۆرانی. مـن ئـەم ڕوونكردنـەوەم نووسـیوە بـۆ بەرپەرچدانەوەی كۆمەڵە كوردێك كـە یارمـەتی وەردەگـرن لـە دوژمنـانی كـورد و دەڵێن زازا زمانێكی سەربەخۆیە وەك هەر زمانێكی تر. ئەم دیالێكتـە كەمینـە پێـك دەهێنێت.

هەر چۆنێك بێت، دەكرێت زمانی ستانداردی كوردی وەكو زۆربەی زمانـەكانی تـری جیهانی لەم دیالێكتانە پێك بهێنرێت. سكێچی ژمارە ( ٢) دووری و نزیكی دیالێكتـەكان

له یەکتر لە لایەك وە چۆنیەتی نزیکخستنەوەی ئەم دیالێکتانە لە یەکتری بە مەبەستی خولْقاندنی زمانی ستاندارد لە لایەکی تر نیشان دەدات.




سکێچی ژمارە (٢)

وەك لە ڕوونکردنەوەکانی پێشوو و سکێچی سەرەوەدا دەردەکەوێت دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست تێکەلاْوی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەلْ هەموو دیالێکتەکان. ئەم دیالێکتە دەکرێت بکرێت بە هەلْقەی گرێدراوی دیالێکتەکان لەبەر شوێنی جوگرافی ( دەکەوێتە ناوەڕاستی هەمووان) دوە مێژووی تێکەلاْوی ئەم دیالێکتە لە هەموو ڕوویەکەوە لەگەلْ ئەوانی تر. لە هەمووی گرنگتر، ئێستا ئەم دیالێکتە خاوەنی زۆرینەی کەرستەی خوێندن و دوکومێنت و پەرتووك و نووسینە لە هەموو بوارەکانی هونەری و وێژەیی و زانستیدا. دیسان کۆددانان و ئەرکەکانی تاقیگەیی ئەم دیالێکتە لە وانی تر گەلێك پێشکەوتوو ترە ودەکرێت ببێت بە جێگەی ڕازیبوون و پەسەندی هەموو لایەك. بە کورتی کام دیالێکت کۆنتاکتی زیاتر هەبێت لەگەلْ ئەوانی تر ئاستی تێگەیشتنیشی زیاتر دەبێت، لەبەرئەوە تواناشی زیاتر دەبێت بۆ بوونی بە زمانی ستاندارد. هەر چۆنێك بێت ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست بسەپێنرێت بەسەر ئەوانی تردا، بەلْکو دەبێت سوود لەو شارەزایی و تا ڕادەیەك لێك تێگەیشتنە وەربگیرێت کە لە نێوان کرمانجی خواروو، ناوەڕاست و گۆرانی لەلایەك وە لە لایەکی تر کرمانجی باکوور، ناوەڕاست و گۆرانی ( زازا) هەیە بۆ دانانی نۆرمێك ( ڕێزمان و بانکی وشە) بۆ زمانی ستاندارد.




سکێچی (٣)

دەسەڵات گرنگترین فاکتەرە لە دانانی زمانی ستانداردا. ئێستا لـە کوردسـتانی عێراقـدا باشترین زەمینە خوڵقێندراوە بۆ کارکردن بۆ ئـەم مەبەسـتە. پـێش هـەموو شـتێك لـەم بەشەی کوردستاندا ڕێژەیەکی باشی دانیشتوان هەیە لە هـەر چـوار دیالێکتەکـە، ئەمـە جگە لە ڕێژەیەکی باشی ڕۆشنبیران و نووسەران و ڕامیارناسان و بوونی چەند زانکۆ و.. هتد. جگە لە بنەما و خەزینەیەکی باشی زمانەوانی و فەرهەنگی، لێرەدا کورد خـاوەنی زۆرترین دەسەڵاتە و توانای دابینکردنی پێویستییەکانی ئەم کارەی هەیە بە تایبەتی لە دابینکردنی دارایی و شوێن و جێی تاقیگەی دیمۆگرافی و پێکهێنانی ئەکادیمیای زمانی. هەروەها ویست و بڕوایەکی بەهێز و پەنگ خواردووی لە مێژینەش ناکرێت لە بیر بکرێت. دیسان کارکردن بۆ ئەم مەبەستە لە بەرژەوەندی دەسەڵاتی کوردییـە لـە بـە دیهێنـانی وتارێکی هاوبەش و دروستکردنی باوەڕ و متمانە بە یەکتری و بەهێزکردنی دەسـەڵات و توانایان لە بەرپەرچدانەوەی ڕامیاری بەردەوامی بە عەرەبکردن یاخود ڕازی نەبوون بـە ئیرادەی عەرەبی کە بەغدا هەمیشە دەیەوێت بیسەپێنێت بەسەر هەولێردا. بە کورتی لە دروستکردنی زمانی ستانداردا بەرژەوەندی نەتەوەیی هەیە وە دەبێت ئیرادە و ویست و بەرژەوەندی ڕامیاریش هەبێت بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی پێشڕەوانی نەتەوەیەك وە ئەم مەرجانەش لە دۆزی ئیستای کورد و پێشڕەوانی بەدی دەکرێت و کار نـەکردن بـۆ ئـەم مەبەستە مانای بێ هێزی و لەناوچوون دەبەخشێت.

ب. هەڵوێست و ووتاری هاوبەش:

**سەرەڕای هەموو مەینەتییەك، كورد بە گشتی، تەنانەت ئەوانەی كە ناتوانن بە زمانی ڕەسەنی خۆشیان بپەیڤن، شانازی بە كوردایەتییەوە دەكەن. ئەمە خاڵێكی گرنگە بەڵام بەس نییە بۆ دروستكردنی وتاری هاوبەش. سێ خاڵی بنەڕەتی هەیە لە دەست نیشانكردنی وتاری هاوبەشدا:**

1. **دەبێت ئەو گرووپە یەك زاراوەی زمانی هاوبەشی هەبێت، واتە نۆڕمێكی هاوبەش لە بەكارهێنانی زمان و ڕێزو بەهایەكی بەرزی هاوبەش لەو زاراوەیە و زاراوەكانی تر. زاراوەی ستاندارد دەبێت بۆ زۆرینەی دانیشتوان یەكەم زاراوەی بەكارهێنراو بێت.**
2. **دەبێت هەر كەس خۆی بە ئەندام و هەڵگری ئەو زمانەی ستانداردە بزانێت و لە لایەن ئەندامەكانی تری كۆمەڵەوە بە ئەندام وەربگیرێت.**
3. **دەبێت كەسەكان هەمیشە كۆنتاكتی لەگەڵ ئەو زاراوەیەدا هەبێت وە ئەمەش گرنگترین خاڵە.**

**بۆ دروستكردنی كۆنتاكتی هەمیشەیی ئەم زاراوەیە لەگەڵ كۆمەڵانی خەڵكدا دەبێت بەهای** perstige **ئەم زاراوەیە بەرز بنرخێنرێت بۆ نموونە ببێتە زمانی ڕەسمی دەزگا تایبەتی و گشتییەكانی هەرێم. هەروەها دەبێت سترەكتوری ئەركەكانی زمانی ستاندارد بەهەمی وێژەیی و هونەری و زانستی بگرێتە خۆ و زیاترین بەكارهێنانی هەبێت لە هەموو بوارەكانی بژێوی مرۆكاندا وەكو ماس مێدیا، فێرگەو زانكو و پەیمانگا و دامەزراوەكاندا. هەروەها دەبێت زمانی ستاندارد ڕێزمان و بانكی وشەی دەوڵەمەند و دەستەواژە و شێوازی دیاریكراوی نووسینی هەبێت بۆ هەموو مرۆڤێكی كورد فەراهەم كرابێت. بە شێوەیەكی تر دانانی فەرهەنگێكی كوردی ـ كوردی، ڕێزمانی زمانی ستانداردی كوردی كە تیایدا یاساو ڕێساكانی فۆنەتیك و وشەسازی و ڕستەسازی كۆنكریتانە ڕوون كرابێتەوە. هەڵبەتە دەبێت هەموو فەرمانبەران و كارمەندانی هەرێم توانای نووسین و ئاخاوتنی زمانی ستانداردیان هەبێت.**

ئاسـاييیه، کـه زمـانی سـتاندارد بـه شـێوەیەکی ڕەسمـی لـه ڕێگـەی خوێنـدنگا و دەزگاکانی هەرێمەوە دەست پێبکات و دواتر لە بۆنە نارەسمییەکاندا ببێتـە زمـانی خەڵك تەنانەت ببێـت بـه زمـانی ئاخـاوتن لـه هـەموو مـاڵێکی کـوردا. لـەم ئاسـتەدا پێشبینی ئەوە دەکرێت ئەو کەسانەی زاراوەی دیالێکت بەکاردەهێنن مانـای کـەمی ئاستی خوێندن و پلەی کۆمەڵایەتی نیـشان بـدات بۆیـە ناچـار دەبـن خۆیـان فێـری زاراوەی ستاندارد بکەن.

ت. هەندێك پێشنیاز:

یەکێك لە خاڵە یەکلاکەرەوە گرنگـەکانی نێـوان نەتـەوە و ئێتنیـك ئەوەیـە کـە نەتـەوە مـەرجی خـۆی دەسـەپێنێت بەسـەر نەتـەوەی تـردا بـەڵام ئێتنیـك مـەرجی بەسـەردا دەسپنرێت. بۆ ئەوەی کورد لە کوردستانی عێراقدا مەرجی خۆی بـسەپێنێت و مـەرجی بەسەردا نەسەپێنرێت دەبێت ئاڵوگۆڕی دیموگرافی و کۆمەڵایەتی دروست بکـات کـە لـە بەرژەوەندیدا بێت. بەجێ نەهێنانی ئەم ئاڵوگۆڕانـە لـە لایـەن کـوردەوە مانـای پێـدانی هەلە بە ڕەگەز پەرستانی عەرەب بۆ ئەنجامدانی ئەم ئاڵوگۆڕە کە مسۆگەر لـە سـوودی کورددا نابێت. دەکرێت زۆر پێشنیازی نایاب بخرێتە بەردەم، بەڵام من بە سێ پێشنیاز ئەم بابەتە دەوروژێنم. هەرچۆنێك بێت ئەمە کاری دەزگا و لێژنەیە نەك تاکە کەس:

١. ئەمڕۆ لە شارە عەرەب نشینەکانی عێراقدا یەك تاکو دوو ملیـۆن کـورد هەیـە. ئەم کوردانە لە زێدی خۆیـان ڕەویـان پێکـراوە بـە مەبەسـتی بەعـەرەبکردنیان لـە ناوچە عەرەب نشینەکاندا و لە هەمان کاتدا بچووککردنەوەی پێکهاتەی نەتەوەیی و ڕووبـەری کوردسـتان لـە ئـەنجامی نیـشتەجێکردنی عـەرەب لـە بـری ئـەو کـوردە دەرکراوانە. هێنانەوەی ئەم کوردانـە و نیـشتەجێکردنیان بـە شـێوەیەکی نەخـشە بۆکێشراو ئەرکێکی زۆر پێویستە، بـۆ نموونـە دروسـتکردنی گـەڕەکێك بـۆ کـوردی فـەیلی لـە شـاری دهـۆك لەبـەر ئـەوەی ئاسـتی تێگەیـشتن لـە نێـوان فەیلییـەك و دهۆکییەك وۆر کەمە( ئەگەر هەبێت) ئەمەش پرۆسـەی خولقانـدنی زمـانی سـتاندار پێش دەخات. لە هەمان کاتدا ئەم کوردانـە لـە قـوڕگی تـەعریب و هـزری عـەرەبی ئیسلامی ڕزگار دەکەین.

٢. دووری نێوان هەر دوو شاری کەرکوك و موسڵ لە شارە عەرەب نشینەکانی عێراق زیاترە تاکو شارە کورد نشینەکان. لە ڕاستیدا ئەم شارانە بە لادێ و شارۆچکەی کوردییەوە دەورە دراون و بە کوردستانەوە لکێندراون. هێنانەوەی کوردەکان و دروستکردنی کۆمەڵگای نوێ لە نزیك ئەم شارە کوردانە و گرێدانیان بە سنووری هەرێمەوە پێویستە. ئەمە کارێکی بەجێیە تەنانەت ئەگەر لە داهاتووشدا عەرەبە هاوردەکان بگەڕێنەوە. من پێم وایە گەڕانەوەی عەرەبەکان تاکو ڕادەیەکی زۆر بەندە بە هاتنەوەی کوردەکان.

٣. دروستکردنی بنکەیەکی لوڕی لە شاری خانەقین بە مەبەستی خرۆشانی هەزری نەتەوەیی لە لوڕستانی گەورەدا. ڕزگارکردنی کوردی لوڕی لە هەزری فارسی ئیسلامیەنەك هەر ئەرکێکی نەتەوەییە بەڵکو گەرەنتیەکیشە لە بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکانی کوردی عێراقدا. لێرەدا دەکرێت سوود لە هونەری گۆرانی و مۆسیقا وەربگیرێت وەکو جوولانەوەیەکی نەرمی جەماوەری بە بێ کێشە دروستکردن لەگەڵ دەسەڵاتی ئێراندا [٥].

٨. دواو وتە: زمانی ستاندارد پێگەی سەرەکی بیری نەتەوەییە. هەر نەتەوەیەك زمانێکی ستانداردی نەبێت بەهای نەتەوایەتی دەخرێتە ژێر پرسیارەوە و ئومێدی دروستکردنی دەوڵەتیشی کەمتر دەبێت.زاراوەی ستاندارد سەرچاوەی لێك تێگەیشتن ویەك خوویی و بیرو کاری هاوبەشە. دیسان زاراوەی ستاندارد هاوکاری و خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی و خەمخۆری نێو ئەندامەکانی کۆمەڵ زیاد دەکات وە ئەمەش باوەڕ و دڵنیایی دەبەخشێت بە تاك و کۆمەڵ .بۆ بونیادنانی سیستەمێکی نەتەوەیی و یەکخستنیماڵی کورد ئەم خەسڵەنانە پێویستی ژیانن.

دوو توخمی سەرەکی هەیە لە خوڵقاندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ بەرهەم هێنانی زمانی ستاندارد، یەکەمیان ئاڵوگۆڕی ئابووری، کۆمەڵایەتی، بەڕێوەبەرایەتی و دیمۆگرافیە ئەویش بە جێگۆڕکێ و تێکەڵاوی دیالێکتەکانە کە تیایدا منداڵان و

---

[٥] multi kulti melodi festival لە نووسینی دانەر ، ستۆکهۆلم، ٢٠٠١ . ڕۆڵی موسیك لە کۆمەڵگادا.

گەنجان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە پێکهاتنی زمانێکی یەکگرتووی ستاندارد. هەڵبەتە لێرەدا خوێندن و ماس مێدیا و چالاکییە هونەری و وێژەییەکان یارمەتیدەری گرنگن. دووەمیان دروستکردنی ئەکادیمیای زمانی کوردییە، کە ئەرکی هێنانە دی زاراوەی ستاندارد لە هەناوی دیالێکتەکانەوە بۆ داهێنانی نۆرمێکی نووسین، کە لەلایەن زۆرینەی دانیشتوانەوە پەسەند بێت لە زمانی ستانداردا تاکو ڕادەیەکی زۆر شێوازی قسەکردن و نووسین یەك دەبێت.

دەبوایە لە ماوەی ئەم چواردە ساڵەدا (دوای ڕاپەڕین) بیر لە ئەنجامدانی پرۆژەیەکی لەم جۆرە بکرایەتەوە، کە نەکراوە ئێستا هەلی باشتر ڕەخساوە. ئەم پرۆژەیە پێویستی بە بڕیاری ڕامیاری و یارمەتی داراییە. میللەت خاوەنی زۆر پسپۆڕ و شارەزای زمانەوانی و زانستە کۆمەڵایەتییەکانە، ئەمە بێجگە لەم دۆزە ئارامەی ئێستا . ئەنجامدانی پرۆژەیەکی لەم جۆرە نەك هەر ئەرکێکی نەتەوایەتییە بەڵکو سەرچاوەی بەهێز بوونی دەسەڵاتی کوردە لە عێراقدا. ئەمە پرۆژەیەکی پراکتیکانەیە بۆ کەسێك، کە ویست و باوەڕی کوردانەی هەبێت. هیمەت و ویژدانی دەسەڵاتداران هەنگاوی یەکەمە.

سەرچاوەکان

Bergman, Gosta (2003), Kortfattad svensk historia.

Goteborg, printed av Elanders Digitaltryck AB.

Crystal, David (2003), The Cambridge Encyclopedia of language. Italy, fifth edition, printed by G. Canale & C.S.p.A.

Gellerstam, Martin (1994), ordforradets harledning. I: Arv och lan I svenskan. Sju uppsayer om ordfaradet I kulturstommarnas perspektiv. Svenska Akademien. Stockholm: Nostedts. Sid. 1-11.

Helgander, jhon(1994), Dalamal i upplosning – Bakgrund och forklaringsmodeller, (1994) Ungdom,

dialect och sparkfor’ndring. I: Kotsias, Ulla- Britt & Helgander, jhon (utg.) dialektkontakt, sprakkontakt och sprakforandring I norden. Mins 40. Stockholm: instituitoen for nordiska sprak.
(sid. 121- 134).

Hyltenstam, Kenneth och Stoud, Christopher (1991), Sprakbyte och sprakbevarand. (kap.1-5. Sid. 9-60).

Lundin, Thomas (1993), Sprakens landskap i Europa. Lund, studentlittratur (sid. 7-25).

Nystrom, staffan, (1996), Introduktion till dialektologin. Stockhoolms universitet, instiution for nordiska sparak.

Perridon,Harry (1994), sprakpolitik och sprakutveckling.

Spakbytet I svenska Tornedalen. I: Kotsinas, Ulla- Britt & Helgander, jhon (utg.) Dialektkontakt, sprakkontakt och
sprakforandring i norden. MINS 40. Stockholm : Institutionen for nordiska sprak. (sid. 107-115).

Trudgill, peter (1994), language contact and dialect contact i
linguistic change. I : kotsinas, Ulla- Britt & Helgander, jhon (utg.) Dialektkontakt, sprakkontakt och sprakforandring i norden. MINS 40. Stockholm: Instituationen for nordiska sprak
(sid 13-22) .

عەبدوڵڵا غەفور (٢٠٠٠) جوگرافیـای کوردسـتان . چـاپی دووەم، چـاپ و ئۆفیـسێتی سەردەم، سلێمانی.

فوئاد حەمە خورشید و حەمە کەریم هەورامی (١٩٨٥). زمانی کوردی – دابەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی. دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی آفـاق عربیة، بغداد.

## ملخص البحث

## مشروع اللغة الكردية الموحدّة (الفصحى)

### غازي علي

اللغة الموحّدة أو مايسمّى بالفصحى ركن اساسي من اركان وجود الأمة، حيث أنّها تقّرب مختلف فئاتها وشرائحها من بعضها البعض وتوحّد مشاعرها القوميّة تجاه مايقاسيه المجتمع من حلّو الحياة ومرّها. إنها أداةٌ رئيسة لتوحيد الأمة وبناء كيانها وأمالها في تقرير المصير.

إنَّ التبادل التجاري والنشاطات الفنية والأدبية والرياضية و وسائل الأعلام المختلفة لها دور كبير في تكوين اللغة الفصحى أما تأسيس اكاديمية اللغة الكوردية فهي من أجل وضع المصطلحات بأنواعها نحو لغة يستسغها معظم ابناء الأمة التي تمتلك طاقة هائلة من الأختصاصيين لتنفيذ هذا المشروع العظيم الذي لايفتقر تنفيذه الاّ الى قرار سياسي ودعم مالي.

## Abstract

## Kurdish Standard Language

Ghazi Ali

The standard language is the basic element of a nation's existence and brings different sections of the nation close together and unifies their feelings towards each other and their society.

Commercial exchange, arts, literature and athletics play a great role forming a standard language, but establishing an Academy of Kurdish Language is very important to coin terms towards a fluent and easy language.

Our nation has a great deal of specialists to achieve this national project but it needs only a political decision and financial support.

# گەشتێك بەنێو ڕێزمانی كاری (دان)دا

**د. شێركۆ بابان**
**پرۆفیسۆری هاریكار**
**ئەندامی كارای كۆڕی زانیاری كوردستان**

**دەستپێك:ــ**

له زمانی كوردیدا، ڕێزمانی كار زۆر ئاڵۆز و چڕ و دژواره. لـه ئـەم ڕوانگەیـەوه، كـاری (دان) بریتییه له یەكێك له ئەو گلێنه ڕێزمانییه ئاڵۆزەی كه به ئاسـانی ڕوون نابێتـەوه و ڕەنگه ڕێزمانی تۆماركراویش نەتوانێت دادی بدات. بەداخەوه، ئەو ڕێزمانەی كـه ئێـستا هەیه و دەگوترێتەوه بریتییه له توێژاڵێكی زۆر تەنك و بچڕبچڕ له ئەو ڕێزمانه ئەستوور و دژوارەی كه له بیری هەر هەموومان هەیه و زمانی هەر هەموومانی پێ دەكەوێته گەڕ.

سەبارەت به كاری (دان)، ئەم كاره گرنگه ڕێزمانەكەی ورده و پڕه له پێچی ڕێزمـانی و پڕه له گێژەنی واتاسازی. له ئـەم نووسـینەدا، دەمانـەوێت، بـه وردی ڕێزمـانی كـاری (دان) لێك بدەینەوه، تائەو ڕادەیەی كه نهێنییەكانی دەكەونه سەر ئـاوی تۆژینـەوه. بـه هیـواین، بتـوانین خوێنـەری ئـازیز تێبگەیـەنین و بتـوانین وای لێ بكـەین كـه بابەتەكـه بەراورد بكات لەگەڵ ئەو ڕێزمانەی كه ئێستا دەگوترێتەوه.

**١ـ سەرەتایەك لەسەر كاری (دان):**

كاری (دان) بریتییه له كارێكی (تێپەڕ) و له ڕستەدا بەركارێك داگیر دەكات، وەك:

**من ( پاره ) دەدەم**
**من ( پاره )م دا**

لە دیوی (بکەر نادیار)دا، ئەم کارە دەبێت بە (دران) و دەشێت بگوترێت:

**( پارە ) دەدرێت**

**( پارە ) درا**

بێگومان، وەك (بکەر نادیار) تێنەپەڕە، ئەم رستانەی دوایی بکەری (من) دەکەن بە (نادیار) و بەرکاری (پارە) دەکەن بە (جێگری بکەر).

**<u>٢ـ کاری (دان) بەرووتی:</u>**

وەك لە کۆپلەی پێشوودا باسکرا، کاری (دان) بریتییە لە کارێکی (تێپەڕ) و بەرکار داوا دەکات. لە ئەم هەڵوێستەدا، ئەگەر رستەکە رووت بکەینەوە لە (بەرکار)ەکە، ئەوا واتای کارەکە دەبەسترێت بە (بەرکار)ێکی نادیارەوە و ئەو جۆرە (بەرکار)ەش دەکەونە بەر واتای (تابۆ). واتە، ئەو وشانەی کە ناشیرینە لە گوفتاردا گۆ بکرێت، چونکە کردەوەی بێ رەوشتی دەردەخات. تەنانەت، گۆ کردنی چاوگی (دان) بەبێ (بەرکار) لە ئەم نموونانەدا:

**( پارە )دان، ( هان )دان، ( سەر)دان، ( کوڵ )دان، .... هتد**

دەبێت بە هۆی چەواشە بوونی واتاکەی لە بیری هەموومانندا بەرەو واتایەکی (تابۆ) و ناشیرین. ئەم جۆرە واتایەش هەل و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە و بە ئەم چەشنە پەیدا دەبێت:

**<u>یەکەم</u>**: ئەگەر (بەرکار)ێکی بەرجەستە لە ریزی رستەکەدا نەبێت.

**<u>دووەم</u>**: ئەگەر کاری (دان) پاشگری دووپاتی (ەوە)ی پێوە نەبێت، بۆ نموونە، کاری (دانەوە) واتاکەی چەواشە نابێت بە دیوی (تابۆ)دا، هەرچەندە (بەرکار)ی پێوە نەبێت.

<u>سێیەم</u>: ئەگەر کاری (دان) هیچ پێشگرێکی واتاگۆڕی پێوە نەبێت، بۆ نموونە، کاری (هەڵدان، دادان، ڕادان، لێدان، تێدان... هتد) بەرکاریان پێوە نییە، بەڵام واتاکەیان چەواشە نەبووە بە دیوی واتایەکی (ناشیرین)دا.

بە کورتی، ئەم جۆرە واتایە، کاتێك پەیدا دەبێت کە کاری (دان) رووت ببێتەوە، چی لە (بەرکاری جودا) و چی لە پاشگری دووپاتی و چی لە پێشگری واتا گۆڕ. وەك نموونەیەکی بەکار، دەتوانین ئەم کارە شرۆڤە بکەینەوە:

(سەر هەڵدانەوە): سەر ـ هەڵ ـ دان ـ ەوە

ئێستا، هەتا هەر سێ وشەی (سەر)، کە بەرکارە و (هەڵ)، کە پێشگرە و (ەوە)، کە پاشگرە، لانەبەین، ئەو جۆرە واتا (تابۆ)یە خۆی ناسەپێنێت بەسەر کاری (دان)دا. ئەمە و سەرەڕای ئەو مەرجانەی کە باس کران، کاری (دان) لە بکەر نادیاردا، ئەو کێشەیە دروست ناکات چونکە (بەرکار)ەکە رۆڵی خۆی دەدۆڕێنێت و ودەبێت بە جێگری (بکەر). بۆ نموونە، کاری (دران) هیچ واتایەکی تابۆی تێدا نییە.

### ٣- هۆی پەیدابوونی واتای سووکایەتی:

بێگومان، کاری (دان) کە بە رووتی گۆ دەکرێت، لەناو چاوی بیردا روخساری (دان) کلۆری تێدا هەیە، چونکە لە رەسەندا بریتییە لە:

(بەرکار + دان)

لەسەر کێش و ئاوازەی (هان دان). لە ئاستی ئەو کلۆرییەدا، کە دەچێتە سەر کاری (دان)، دوو میکانیزم هەن کە یەك دەگرنەوە و جێی ئەو کلۆرییە بە وشەیەکی ناشیرین (تابۆ) پڕ دەکەنەوە:

یەکەم: لە ئاستی رستەسازیدا، دەشێت (بەرکاری جودا) لابردرێت و لەجێی ئەو بەرکارە جودایە، بەرکارێکی لکاو، یان بەرکارێکی نادیار، دابنرێت، وەك:

(نان) دەخوات: (ـــــــ) دەخوات

دووەم: لە ئاستی واتاسازیدا، هەندێك جار بەرکارێك دەهێتە کایەوە بۆ (واتا بەستن) کە واتاکەیی ناشرینە، وەك (جووتبوون)ی زایوندی . هەر لەبەر ئەوە، میکانیزمێکی تر هەیە بۆ گۆنەکردنی ئەو وشە ناشرینە و لابردنی لە ریزی گوفتاردا.

ئەمە و کە ئەم دوو میکانیزمە لە یەکتری چەسپ دەبن و بەرکارەکە لادەچێت، واتای یەکێك لە ئەو دوو میکانیزمە زاڵ دەبێت. پاشان، وەك میکانیزمی یەکەم لە ئاستی

رستەسازی دایە و گشتییە بۆ گشت کاری زمانەکە و میکانیزمی دووەم تایبەتییـە و هـەر لە رێزمـانی چـەند کارێکـدا بـەکار دەهێنرێـت، واتـا تایبەتییەکـە جـودا دەبێتـەوە و زاڵ دەبێت بەسەر کاری (دان)دا. ئەوەش لە یاد نەکەین، کە لـە هـەمان لاپـەڕەی ئـەلبوومی رێزمانەکەدا، کاری (کردن)یش، دەکەوێتە بەر ئەو دوو میکانیزمە و دیوەکەی تری کـاری (دان) پڕ دەکاتەوە. بۆ نموونـە، وەك چـۆن گـۆکردنی کـاری (دان) بـە رووتـی واتایـەکی ناشیرین دەبەخشێت، بە هەمان شێوە گۆکردنی (کردن) بـە رووتـی، هـەر هـەمان واتـای ناشیرین دەبەخشێت، بەڵام هەر یەکێکیان لە جەمسەرێکی جیاوازەوە.

**٤ـ کاری (دان) و ئامرازی (بە):**

کاری (دان) روخسارێکی تری هەیە لە چەشنی (دان بـە..) ئـەم روخـسارە زۆر چـالاکە و ئاراستەی جوولەی (بەرکار) دەردەخات بۆ لای بارگەی ئامرازی (بە)، وەك:

**پارەکەم دا بە (شیلان)**

لە ئەو نموونەیەدا، بەرکاری (پارەکە) ئاراستە کـراوە بـەرەو بارگـەی ئـامرازی (بـە) کـە بریتییە لە (شیلان). لە ئەم بارگەیەدا، دەتوانرێت، بگوترێت:

**ئەوان پارەکەیان دا بە (من)**
**ئەوان پارەکەیان دا بە (تۆ)**
**ئەوان پارەکەیان دا بە (ئەو)**
**ئەوان پارەکەیان دا بە (ئێمە)**
**ئەوان پارەکەیان دا بە (ئێوە)**
**ئەوان پارەکەیان دا بە (ئەمان)**

ئەمەو ئەو شەش جێناوە بۆیان هەیە ببن بە (جێناوی لکاو) و ئامرازەکەش (بە) بکەن بە ئامرازی لکاو (پێ)، وەك:

**ئەوان پارەکەیان دا پێ(م)**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ(ت)**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ(ی)**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ(مان)**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ(تان)**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ(یان)**

لە ڕێزمانی کوردیدا، ئەم جۆرە ڕستەیە بە جۆرێکی تر وەرسووڕاون و لە ئەم دیاردەدا، جێناوەکانی (م، ت، ی، مان، تان، یان)، وەرچەرخاون بۆ (م، یت، ـــ، ین، ن، ن) و ئامرازی (پێ)یش وەرچەرخاوە بۆ (ێ)، وەك:

**ئەوان پارەکەیان دا پێ (م) : ئەوان پارەکەیان دا(م)ێ**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ (ت) : ئەوان پارەکەیان دا(یت)ێ**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ (ی) : ئەوان پارەکەیان دا(ـ)یێ**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ (مان) : ئەوان پارەکەیان دا(ین)ێ**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ (تان) : ئەوان پارەکەیان دا(ن)ێ**

**ئەوان پارەکەیان دا پێ (یان) : ئەوان پارەکەیان دا(ن)ێ**

ئەم میکانیزمە زۆر بەر تەسکە و بەزۆری لە ڕێژەکانی کاری (دان)دا دەبینرێت.

**٥- کاری (دان) و ئامرازی (لە):**

کاری (دان) ئامرازی پەیوەندی (لە) وەردەگرێت و دەبێت بە (دان لە ...). لە ئەم میکانیزمەدا کاری (دان) واتای دەگۆڕێت بۆ ئاراستەکردنی (بەرکار) بەرەو بارگەی ئامرازەکە، وەك:

**ئازاد ( بەردەکە )ی دا    لە دیوارەکە**

**ئازاد ( تابلۆکە )ی دا    لە دیوارەکە**

ئەوەی سەیرە، ئەم جۆرە رستە تێپەڕە بۆی هەیە بە (تێنەپەڕ) بکەوێتە کار، وەك:

**بەردەکە دای لە دیوارەکە**

لە رستەی یەکەم و دووەمدا وشەی (بەردەکە) بریتییە لە (بەرکار) و لە رستەکەی سێیەمدا، هەمان وشە بریتییە لە (بکەر). لە ئەم روانگەیەوە، کاری (لێدان) پەیدابووە، وەك:

**شیلان ( دارێك ) لە ئازاد دەدات**

یان،

**شیلان ( دارێك )ی ( لێ ) دەدات**

یان، دەشێت بەرکارەکە (دارێك) لاببەین، وەك:

**شیلان ( ...... ) ( لێ )ی دەدات**

ئەم رستەیەی دوایی دوو واتا دەبەخشێت:

یەکەم: واتای کاری (لێدان) دەچەسپێت، وەك لێدان بە دەست و بە دار ... **هتد**.

دووەم: واتای کاری (تامپۆن کردن)، یان وەك بە عەرەبی پێی دەگوترێت (إصطدام).

**٦ـ کاری (دان) و ئامرازی (بە ..... ەوە):**

کاری (دان) لەگەڵ ئامرازی (بە ... ەوە)دا، واتاکەی دەگۆڕێت بۆ پێوەدان (لسع، لدغ)، وەك:

**مارەکە دای بە شوانەکەوە**

یان،

**مارەکە دای ( پێی )ەوە**

یان،

**...... دای ( پێی )ەوە**

لە ئەم کارەدا، ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە بە تێنەپەڕ دەکەوێتە بەر رستەسازی و پێویستی بە (بەرکار) نییە. بۆ نمونە، لە ئەو رستەیەی سەرەوەدا، لە رووی رستەسازییەوە، دەشێت بگوترێت، وشەی (شوانەکە) بریتییە لە (بەرکاری ناراستەوخۆ)، کە لە رووی واتاسازییەوە، وشەی (شوانەکە) بریتییە لە (بەرکار).

**٧ـ کاری (دان) لەگەڵ ئامرازی (بە ... دا):**

کاری (دان) لەگەڵ ئامرازی (بە ... دا) یەك دەگرێت کاری (پێدادان)، بە واتای (پێداکێشان) پەیدا دەبێت، وەك:

**منداڵەکە بووکەکەی دا بە زەویدا**

یان،

**منداڵەکە بووکەکەی دا پێیدا**

یان،

**...... بوکەکەی دا پێیدا**

یان،

**...... ....... دای پێیدا**

ئەم کارە بۆی هەیە بە تێپەڕی بکەوێتە گەڕ، وەك:

**چۆلەکەکە  دای بە دارتەلەکەدا**

بە واتای،

**چۆلەکەکە خۆی دا بە دارتەلەکەدا**

**٨ـ کاری (دان) و ئامرازی (بۆ):**

ئامرازی پەیوەندی (بۆ) هیچ چالاکییەکی لە قەوارەی کاری (دان)دا نیە، مەگەر لە ئاوەڵگوزارەدا.

**٩ـ کاری (دان) و ئامرازی (لە .... ەوە):**

وەك ئامرازی (بۆ)، ئامرازی پەیوەندی (لە ... ەوە) هیچ چالاکیەك نانوێنێت لە قەوارەی کاری (دان)دا، مەگەر لە ئاوەڵگوزارەدا.

**١٠ـ کاری (دان) و ئامرازی پەیوەندی (ـە):**

ئامرازی پەیوەندی (ـە) دەتوانێت رووداوی کاری (دان) راگوێز بکات بۆ سەر ئاوەڵکارێك، وەك:

**سەربازەکە منداڵەکەی دایـ( ـە ) بەردار**

**پۆلیسەکان دزەکەیان دایـ( ـە ) پێش خۆیان**

ئەم دیاردەیە سیمایەکی گشتی هەیە و ئامرازی (ـە) دەچێتە نێو قەوارەی کارەکە و دەی بەستێت بە (ئاوەڵکار)ی شوێنەوە. لە ئەم ڕاستییە بترازێت، ئامرازی (ـە) بۆی نیە بچێتە سەر کاری (دان)، مەگەر بە چەواشەیی، وەك:

**نامەکەی دایـ( ـە ) دەستم**

ئەم رستەیە لە ڕەسەندا بریتییە لە:

**نامەکەی دا ( بە ) دەستم**

لە ڕاستیدا، زمانی نووسین پڕە لە ئەم جۆرە چەواشەکارییە و زۆر لە نووسەران وا دەزانن ئیشێکی جوان ئەنجام دەدەن، ئەگەر ئامرازی ڕەسەنی (بە) پەرپووت بکەن و بیکەن بە (ـە). سەبارەت بە ئیشەکانی ئێمە، ئێمە تەنها لە ئاستی ئاوەڵکاردا، ئامرازی (ـە) بە ڕەسەن دەناسین، وەك:

**منداڵەکە بەرخەکەی دایـ( ـە ) پێش خۆی**

کە ناتوانرێت بگوترێت:

**منداڵەکە بەرخەکەی دا ( بە ) پێش خۆی**

**١١ـ کاری (دان) و واتا بەستن بە (بەرکار):**

لە زمانەکەدا، چەند وشەیەك هەیە لە چەشنی (ناو) و ئەو وشانە دەتوانن کاری (دان) ببەستن بە واتایەکی ترەوە، وەك:

**( هەناسە )دان**

**( دەنگ )دان**

**( کۆڵ )دان**

**( گیان )دان**

**( نووچ )دان**

**( سەرسم )دان**

## (بۆڕ)دان

له ئهم گرووپهدا، ئهوهی سهیره ئهوهیه که ئهو ناوانه بریتین له (بهرکاری کارهکه). به واتایهکی دی، ئهو ناوانه ههم بریتین له (بهرکار)ی رستهسازیانه و ههم بریتین له (واتابهست)ی واتاسازیانه. ههر لهبهر ئهم هۆیه، شهبهنگی کارێکی (تێنهپهڕ) زاڵ دهبێت بهسهر واتای ئهو روخساره لێك دراوانهدا. ئهمهش وا دهکات، که کارهکان بتوانن به میکانیزمێکی تایبهتی ببنهوه به (تێپهڕ)، وهك:

| | |
|---|---|
| **ههناسهدان به کهسێك** | **ههناسه پێدان** |
| **کۆڵ دان به کهسێك** | **کۆڵ پێدان** |
| **بۆڕ دان به کهسێك** | **بۆڕ پێدان** |

ئهم دیاردهیه لهسهر پێوانهی ئهم جۆره رستهیه رۆنراوه:

**پاره دان** ← **پاره پێدان**

له جۆره رستهی ئاوهادا تهم و مژ پهیدا دهبێت لهنێوان دوو واتای دژ ئاراستهدا، وهك:

واتای یهکهم: ناچار کردنی کهسێك بۆ (پارهدان)، وهك:

**پارهکهم پێ دا**

واتای دووهم: واتای پاره بهخشین به کهسێك، وهك:

**پارهکهم پێ دا**

کەواتە، لە واتای یەکەمدا، ئەو کەسە پارە لە گیرفانی دەردەچێت بەهۆی کەسێکەوە، کەچی لە واتای دووەمدا، پارە دەچێتە نێو گیرفانی. بۆ جودا کردنەوە و لێك دابڕاندنی ئەو دوو واتا دژ ئاراستەیە، چەند سەرنجێك هەن، وەك:

<u>خاڵی یەکەم</u>: واتای دووەم، ئەوە پەسەند دەکات کە ئامرازی (پێ) بکرێت بە ئامرازی (ێ)، وەك:

**پارەکەم دایێ          پارەکەم پێدا ←**

کەچی ، لە واتای یەکەمدا، ئەم میکانیزمە خۆی ناچەسپێنێت بە ئەم پێیە، پەیدابوونی ئامرازی (ێ) بێ مەلامەت و بێ بنچینە نییە.

<u>خاڵی دووەم</u>: ئەگەر چینێکی تر بچینە نێو ژێرخانی ڕێزمانی کوردییەوە، دەتوانین بڵێین، ئەو جۆرەی ئامرازی (بە)، کە لە واتای یەکەمدا هەیە، جیاوازە لە ئەوەی کە لە واتای دووەمدا هەیە. یەکێکیان دەگەڕێتەوە بۆ کاری (دان بە ...) و ئەوی تر دەگەڕێتەوە بۆ ئامرازی (بە تێپەڕ کردن) بۆ هەندێك لە کارەکان.

**<u>١٢ـ کاری (دان) و پێشگری واتاگۆڕ:</u>**

کاری (دان) بۆی هەیە هەر سێ پێشگری (هەڵ، دا، ڕا) وەربگرێت، وەك:

ـ هەڵدان:

**منداڵەکە تۆپەکەی هەڵدا بۆ سەربان**

ـ دادان:

**هێشتا دا پیرە نوێژی دانەداوە**

یان بە واتای (تیژکردن)، وەك:

**منداڵەکە پێنووسەکەی خۆی زۆر داداوە**

ـ ڕادان:

**هێشتا مێگەلەکە ڕای نەداوە**

سەرەڕای ئەم سێ پێشگرە، کاری (دان) بۆی هەیە هەندێك پێشگری تر وەربگرێت، وەك (بەر، لا، تێ، ... هتد)، وەك:

- بەردان:

**شیلان پەتەکە بەر مەدە**

- لادان: ئەم کارە بۆی هەیە بە تێپەڕ و تێنەپەڕ وەربسووڕێت، وەك:

- تێپەڕ:

**شیلان دەفتەرەکانت لابدە**

- تێنەپەڕ (واتای چەواشەبوون):

**شیلان چاك لای داوە لە ڕێنمایەکان**

- تێدان، وەك:

**ئەم کراسە کورتە، دوو پەنجەی تری تێبدە**

- دەردان، وەك:

**برینەکە ئاوی دەرداوە**

**١٣ـ کاری (دان) لەگەڵ (ناو)دا:**

ئەلبوومی ئەم جۆرە بەکارهێنانە زۆر بەرفراوانە و کاری (دان) دەتوانێت دەرگا بکاتەوە لە چەندین واتای تر، وەك:

(پەلاماردان، مۆڵ دان، باوەش دان لە شتێك، هاندان، جۆشدان، خولدان، سووڕدان، پیشاندان، تووڕدان، فڕێدان، گەمارۆدان، لووشدان، بادان، .... هتد).
ئەم جۆرە کارە تێپەڕن و داوای بەرکار دەکەن، وەك:

(بکەر + بەرکار + کار)

نموونە:

**منداڵەکە دەفتەرەکەی تووڕ دا**
**منداڵەکە دەفتەرەکەی فڕێ دا**
**کێ منداڵەکەی هان دا؟**
**کێ ئەو شارەی پەلامار داوە؟**

ئەم کارانە خۆ جودا دەکەنەوە لە کاری (هەناسەدان) و هاوەڵەکانی بە ئەوەی کە ئەمان (بەرکار) وەردەگرن و ئەوانی تر پێویستیان بە (بەرکار) نییە. ئەم دیاردەیە لە پێشتردا بە جوانی باسکراوە.

## ١٤ـ کاری تێکدان

بێگومان واتای کاری (تێکدان) جودایە لە واتای کاری (تێدان). ئەم کارە واتای (بەرەو نارێکی) دەبەخشێت. بە رادەیەك، کە چەندین وشە و زاراوەی لێکەوتووتەوە، وەك (تێکدەر، تێکدەران، تێکدراو، تێکدەرە، لە خۆ تێکدەر، ماڵ لە خۆ تێکدەر، ... هتد). ئەوەش لە یاد نەکەین کە ئەم کارە بریتییە چاوگی (تێپەڕ) بۆ کاری (تێك چوون)، وەك:

تێکچوون (تێنەپەڕ) ⟵ تێکدان (تێپەڕ)

بۆ نموونە، دەگوترێت:

**نازانم بۆچی، پرۆژەکەمان (تێك چوو)**

یان،

**نازانم بۆچی، شیلان پرۆژەکەمانی (تێکدا)**

کەواتـە، کـاری (دان) بـۆی هەیـە لـە بـوارێکی بـەر تەسـکدا، بـاری تێپـەڕی کـارێکی تـر بنوێنێت، وەك کاری (بوون : کردن):

**ئەم منداڵە چەند جوان (بووە)**

یان،

**کێ ئەم منداڵەی وا جوان (کردووە)**

سەرەڕای ئەوەی گوترا، کاری (تێکدان) باری ئـاڵۆز تـری هەیـە. بـۆ نموونـە، لـە (چـا تێکدان)دا هەڵوێستەکە زۆر ئاڵۆز و دژواتاییەکی سەیر هەیـە، چـونکە لـە (چـا تێکـدان) واتای (بەرەو باری باشتر) دەهێتە ئاراوە، بەڵام لە (ماڵ تێکدان)دا واتـای (بـەرەو بـاری خراپتر) دەهێتە ئاراوە. هۆی ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو راسـتیەی کـە چـاوگی (چـا تێکدان) لە رەسەندا بریتییە لە (چا تێك وەردان). واتـە، چـاوگی (وەردان)بـە پێـشگری (وەر) واتای گۆڕاوە نەك بە پێشگری (تێك)، وەك:

**شیلان، ئاوێك وەربدە لە پەرداخەکە**

**١٥ـ گەمەیەك لە کاری (دان)دا:**

کـاری (دان) وشـەی (دەسـت) وەردەگرێـت وەك (بـەرکار) و کـاری (دەسـت دان) چـێ دەکات، وەك:

**ئەم ئیشە دەست نادات بۆ تۆ**

بێ گومان کاری (دەست دان) بریتییە لە کـارێکی (تێنەپـەڕ)ی چـالاك و رۆژانـە بـەکاری دەهێنین لەسەر ئەندازەی:

(هەناسەدان، دەنگدان، بۆڕدان، نووچدان، ....هتد)

لە رووی گەمەی رێزمانییەوە، کاری (دەستدان) ڕوو دەکات لە ئامرازی پەیوەندی (لـە) و دوو روخساری نوێ بۆ دوو کاری دی پەیدا دەکات، وەك:

یەکەم: کاری (دەستدان لە ....)، وەك:

**دەستم دا لە دیوارەکە**

یان،

**دەستم دای لە دیوارەکە**

دووەم: کاری (لە دەستدان)، وەك:

**تازە، ئیشەکەی خۆی لە دەستدا**

لەنێوان ئەم دوو کـارەدا (دەسـتدان لـە ...) و (لـە دەسـتدان) هەنـدێك سـەرنجی سـەیر هەیە، وەك:

یەکەم: لە کاری (دەستدان لە ..)دا, بەکارهێنانی یەکەم (تێپەڕ)ە و بەکارهێنانی دووەم (دەستم دای لە دیوارەکە) تێنەپەڕە. ئەمەش لە کۆپلەکانی پێشوودا روون کراوەتەوە.

دووەم: لە هەردوو کارەکەدا، ئامرازی (لە) دوو جێگای هەیە، جارێك لەپاش کـاری (دان) و جارێك لە پێشی. ئەم ڕاستییە بووە بە هۆی پەیدابوونی دوو (واتا)ی جیـاواز. ئەمـەش خۆی لە خۆی بریتییە لە حەشارگەیەکی تاریك و نابێت هـەروا بـە زلکـوێری و بەئاسـانی بەسەریدا برۆین.

سێیەم: هۆی ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان کاری (دەست دان لە ..) و کـاری (لـە دەسـت دان)دا هەیە، دەگەرێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی کە یەکەمیان بە ئامرازی (لە) واتای گـۆڕاوە و دووەمیان بە پێشگری (لە دەست) واتای گۆڕاوە.

چوارەم: بۆ نموونە، لە کاری (دەستدان لە ...) ئەگەر وشەی (دەست) لاببەین، ئەوا واتای کارەکە ناگۆڕێت، وەك (دان لە ...):

**دەستم دا لە دیوارەکە**

**...... دام لە دیوارەکە**

یان، دەتوانین (دەست) کە بەرکارە، بگۆڕین بەرکارێکی دی، وەك:

**پەنجەم دا لە دیوارەکە**

**شانم دا لە دیوارەکە**

یان،

**پەنجەم دای لە دیوارەکە**

**شانم دای لە دیوارەکە**

کەواتە، وشەی (دەست) لە کاری (دەستدان لە ...)دا بریتییە لە وشەیەك کە خانەی چۆڵی (بەرکار)ی پڕ کردووتەوە، بەڵام لە کاری (لە دەستدان) وانیە. بۆ نموونە، ناتوانین وشەی (دەست) لە کاری (لە دەستدان)دا دەربهێنین، یان بیگۆڕین بە هەر وشەیەکی تر. کەواتە دەستەواژەی (لە دەست) بریتییە لە (واتاگۆڕێك بۆ کاری (دان) و کردوویەتی بە (لە دەستدان).

پێنجەم: بەپێی خاڵی پێشوو، سەری حەشارگەیەك هەڵ دەدرێتەوە، چونکە جۆرەکانی (واتاگۆڕین)ی کار دەکەوێتە بەر پۆلین کردن، وەك لە کۆپلەی داهاتوودا باسی دەکەین.

شەشەم: لەکاری (دەست دان)دا، کە لە سەرەتای ئەم کۆپلەیەدا باسکرا، بە هەمان شێواز، وشەی (دەست) بریتییە لە (واتابەست) بۆ کاری پتەوی (دەست دان) و لەپاشتردا، واتایەکی خوازراو پەیدا بووە لە چەشنی (دەست دان). هەر بۆ پرۆڤە، ئەگەر وشەی (دەست) لاببەین لە ئەو کارە، ئەوا واتاکەی دەبزرکێت و لە خشتە دەبرێت.

**١٦ـ جۆرەكانی (واتاگۆڕی) لە كاری (دان)دا:**

مەرجی (واتا گۆڕین) ئەوەیە كە پارچەیەكی سەربار بخرێتە سەر كاری (دان) و بە ئەو كردەوەیە واتاكەی بگۆڕێت لە (دان: بەخشین)ەوە بۆ واتایەكی نوێ. لە ئەم روانگەیەوە، كاری (دان) لە دەرگای زۆر بابەتی ڕێزمانی داوە بۆ ئەوەی چشتێك پەیدا بكات و بە ئەو چشتە خزمەتی زمانەكە بكات. لە راستیدا، زۆربەی زۆری ئەم بابەتە لە كۆپلەكانی پێشەوەدا باس كراون، بەلاّم لە ئەم كۆپلەیەدا كۆیان دەكەینەوە و جۆرەكانیان دیاری دەكەین، وەك:

یەكەم: پێشگری واتا گۆڕ (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ). لە ئاستی كاری (دان)دا تەنها پێشگری (ڕۆ) بڕشتی نییە. ئەگەرنا، سێ پێشگرەكەی تر دەتوانن سێ واتای سەربار لە كاری (دان) پەیدا بكەن، وەك:

**ـ هەڵدان: بەرد هەڵدان**

**ـ دادان: نوێژ دادان**

**ـ ڕادان: مێگەل ڕادان**

دووەم: واتا گۆڕیی بە ئامرازی پەیوەندی. لە ئەم رووەوە، ئامرازی پەیوەندی كاریگەری خۆی نوواندەوە و واتای كاری (دان)ی گۆڕیوە بۆ (لێدان، پێوەدان، پێدادان).

سێیەم: واتاگۆڕی بە (واتای بەركار). لە ئەم رووەوە كاری (دان) چەسپ دەبێت بە (بەركار)ێكەوە و لەگەڵ واتای ئەو بەركارەدا دەبێت بە كارێكی (ڕۆنراو بە بەركار)، وەك:

**(هەناسە)دان**

**(هەنیسك)دان**

له ئەم کارانەدا، لابردنی وشەکانی (هەناسە، هەنیسك) دەبێت بە هۆی بەراویتەبوونی واتاکانیان.

<u>چوارەم</u>: واتاگۆڕی بە (هێزی تێپەڕین). له راستیدا، کاری (دان) خۆی تێپەڕە و بەلاّم له زۆر بەکارهێنانـدا دەگۆڕێت بۆ (تێنەپەڕ). لە ئـەم هەلوێستیەدا، واتـای کـاری (دان) ناگۆڕێت، بەلاّم واتاکە بەرگێکی (تێنەپەڕ) لەبەر دەکات، وەك:

**دەستم دای لە گلۆپەکە**

بەواتای:

**دەستم کەوت لە گلۆپەکە**

بەلاّم دەشێت بگوترێت:

**من دەستم دا لە گلۆپەکە**

لـە بـەکارهێنانی یەکەمـدا، واتـای کـاری (لێـدان) بـە تێنەپـەڕ چەسـپاوە، بـەلاّم لـە بـەکارهێنانی دووەمـدا واتـای کـاری (لێدان) بـە تێپـەڕی چەسـپاوە. بەلّگـەش بـۆ ئـەو راستیەی کە لە نێو ئەو حەشارگەیەدایە، ئەوەیە کە رستە تێپەڕەکە دەشێت بکرێت بـە (بکەر نادیار)، وەك:

**دەستم درا لە گلۆپەکە**

لـە ئاسـتی واتـای یەکـەم دا، نـاتوانین رسـتەی (بکـەر نادیـار) دروسـت بکـەین، چـونکە رستەکە تێنەپەڕە و (بەرکار) لە ئارادانیە، تا بیکەین بە (جێگری بکەر). ئەم دیاردەیـە، خۆی لە خۆیدا بریتییە لە بەلّگەیەکی بەکار بۆ سەلماندنی باری (تێنەپەڕ) لە رستەیەکدا وەك (دەستم دای لە گلۆپەکە).

<u>پێنجەم</u>: واتا گۆڕی بە ئامرازی پەیوەندی و بارگەکەی. لە ئەم میکانیزمەدا، زمانەکەمان دەولّەمەندە و چەند (کار)ێك هەیە کە واتایان دەگۆڕێت، وەك:

**ـ لە دەست دان**

**ـ بە فیڕۆ دان**

**ـ بە هەدەر دان**

**ـ بە کرێ دان**

ئەم جۆرە کارانە، لە رووی واتاوە، ناتوانن دەست بەرداری ئامرازەکە و بارگەکەی بن.

شەشەم: وەك لە سەرەتای ئەم نووسینەدا باسکرا، کاری (دان) هەر کاتێك پاك بکرێتەوە لە (بەرکار) ئەوا واتایەکی (تابۆ) پەیدا دەبێت.

حەوتەم: کاری (دان) دەرگای واتا پتەوەکانی دەکاتەوە بۆ (واتا دانەوە) و بۆ (واتاخوازی). بۆ نموونە، کاری (هەڵدان) لە واتای خوازراودا دەبێت بە (پێدا هەڵدانی کەسێك). یان، هەندێك لە کارەکان بە راستەوخۆیی دیاردەی (واتادانەوە) هەڵدەگرن، وەك: (دەست دان، لە دەست دان).

هەشتەم: لە کاری (دادان)دا، سیمای سێ واتای پتەو دیارە و ئەمەش بریتییە لە دیاردەیەکی دەگمەن، وەك:

**ـ دادان: تیژ کردنی پێنووس و دار**

**ـ دادان: دەستپێکردنی نوێژ**

**ـ دادان: دەرس دادان (تلقین)**

ئەم سێ نمونەیە بەرانبەر بە ئەم سێ رستەیە دەوەستن، بەریزە:

**شیلان پێنووکەی داداوە**

**شیلان نوێژەکەی داداوە**

**شیلان شیرینی دەرس داداوە**

بێ گومان، ئەم سێ واتایە هەرچەندە لە (پتەو) بچن بەڵام وا نییە. لە (دەرس دادان)دا، وشەی (دەرس) بریتییە لە (واتا بەست) بۆ کاری (دادان)، چونکە لابردن و ئاڵوگۆڕ کردنی ئەو وشەیە دەبێت بە هۆی بزرکاندنی واتاکە. لە بەرانبەردا وشەی (دادان)، لە نموونەی یەکەمدا، بەرانبەر بە (تیژکردن) دەوەستێت و لە نموونەی دووەمدا بەرانبەر بە (دەستپێکردن) دەوەستێت. بێگومان، ئەم دوو واتایەش لە یەکتری جودا دەبنەوە.

**۱۷ـ کاری (لە خشتەدان) و (لە خشتەبردن):**

کاری لە (خشتەدان) واتای (لە قاڵب دان) دەگەیەنێت وشەی (خشتە) بە واتای (قاڵب) هاتووە، وەك:

**شیلان پڕۆژەکەی لە خشتە داوە**

بە ئاشکرا دیارە کە کارەکە تێپەڕە و گەمە سینتاکسییەکەش هەر تێپەڕە، چونکە دەستەواژەی (پڕۆژەکە) بریتییە لە بەرکاری رستەکە. سەرەڕای ئەوە، لە ئەم کارەدا گەمەیەکی سەیرتر هەیە و دەشێت کاری (لە خشتەدان) بکەین بە (لە خشتەبردن)، بۆ پەیداکردنی دژ واتایەك بۆ ئەو کارە، وەك:

**شیلان پڕۆژەکەی لە خشتە بردووە**

بێگومان، کاری (لە خشتەبردن) بریتییە لە دژواتای کاری (لە خشتەدان)، کەچی کاری (بردن) و کاری (دان) ئەو دژواتاییە نانوێنن. سەرەڕای ئەوەی کە گوترا، کاری (لە خشتەدان) و (لە خشتەبردن) روویان کردووە لە (واتای خوازراو)، وەك:

**کێ ئەم منداڵەی لە خشتە بردووە؟**

**۱۸ـ رەگی کاری (دان):**

وەك لە ڕێزمانی تۆمار کراودا زانراوە، بنجی کاری (دان) بریتییە لە (دە) و ڕەگی ڕابردووی بریتییە لە (دا)، وەك:

**من هەوڵ دە(دە)م**

**من هەوڵم (دا)**

لە ڕابردووی بەردەوام و دوور و تەواودا بە ئەم چەشنەی ڕەگی (دا) ریز دەبێت:

**من هەوڵم دە(دا)**

**من هەوڵم (دا)بوو**

**من هەوڵم (دا)وە**

بنجی کاری (دان)، کە بریتییە لە (دە)، نارێکی تێدا هەیە، چونکە بزوێنی (ە) پەیدا بووە. لە ڕێزمانی کوردیدا، ئەو کارانەی کە ڕوخساریان کورتە، بنجەکەیان دەشێوێت، وەك:

**دان، مان، نان**

بنجی کاری (مان) دەبێت بە (مێن) و بنجی کاری (نان) دەبێت بە (نێ). سەرەڕای ئەو نارێکییە، کاری (دان) لەناوی بکەریشدا هەر کێشەی هەیە، چونکە داوای دەنگی (بـ) دەکات، وەك (نان دەر: نان بدەر: بدەر).

**<u>١٩ـ کاری (دان) و پاشگری دووپاتی (ەوە):</u>**

پاشگری دووپاتی (ەوە) بۆی هەیە بچێتە سەر گشت کاری زمانەکە بۆ واتای دووپاتی و بۆی هەیە بچێتە سەر چەند کارێك بۆ گۆڕینی واتاکەی. بۆ نموونە، ئەم کارانە لای ڕاست

واتـای تایبـەتی خۆیـان هەیـە و ئـەو کارانـەی لای چـەپ، کـە پاشـگری دووپاتیـان وەرگرتووە، واتایەکی نوێ دەبەخشن:

**بردن : بردنـ(ەوە)**

**کردن : کردنـ(ەوە)**

**شۆردن : شۆردنـ(ەوە)**

**گرتن : گرتنـ(ەوە)**

**ناسین : ناسینـ(ەوە)**

**کەوتن : کەوتنـ(ەوە)**

**گەیشتن :گەیشتنـ(ەوە)**

**گەڕان :گەڕانـ(ەوە)**

..... : ......

لە کاری (دان)یشدا، ئەم دیاردە هەیە، وەك:

**دان : دانەوە**

لە ئەم هەڵوێستەدا، رەنگە وا بزانرێت کە کاری (دانەوە) واتـای نـەگۆڕاوە، بـەڵکو تـەنها دووپاتی بەسەردا چەسپاوە. بۆ روون کردنەوەی ئەم ئارێشەیە، دەتوانین روخسارەکانی تری کاری (دان : دانەوە) وەربگرین، وەك:

**هەڵ دان : هەڵ دانـ(ەوە)**

**بادان : بادانـ(ەوە)**

**لادان : لادانـ(ەوە)**

**بەردان : بەردانـ(ەوە)**

**سووڕدان : سووڕدانـ(ەوە)**

**دادان : دادانـ(ەوە)**

بۆ نموونە، واتای (هەڵدان) لە کویێ و واتای (هەڵدانەوە) لە کویێ. یان واتای (بەردان) لە کویێ واتای (بەردانەوە) لە کویێ. بە هەمان شێواز، گشت ئەو کارانەی سەرەوە واتایان گۆڕاوە بە پاشگری (ەوە) و کوردیزانان دەتوانن واتاکانیان لە یەکتری هاوێر بکەن. ئێستاش، دەتوانین چەند نموونەیەك لە رستە وەربگرین بۆ ئەوەی باری گۆڕینی واتایی بە جوانی روون بکەینەوە، وەك:

- هەڵ دان:

**شیلان بەردەکەی هەڵ دا**

**شیلان پەڕەکەی هەڵ دایەوە**

- دادان:

**شیلان پێنووسەکەی داداوە**

**شیلان پەردەکەی داداوەتەوە**

- بەردان:

**شیلان چۆلەکەکەی بەردا**

**شیلان شووشەکەی بەردایەوە**

- بادان:

**شیلان پەتەکەی بادا**

**شیلان ئۆتومبیلەکەی بادایەوە**

لە ئاستی ئەو نموونانەدا، چەند سەرنجێکی ورد و خنج هەیە و دەبێت یەکلایی بکرێنەوە، وەك:

یەکەم: کاری (دان) لە یەکەم هەنگاودا پێشگری (هەڵ)ی وەرگرتووە واتاکەی گۆڕاوە لە (دان)ەوە بۆ (هەڵدان). پاشان، لە دووەم هەنگاودا، پاشگری دووپاتی (ەوە)ی وەرگرتووە و جارێکی تر واتاکەی گۆڕاوە و بووە بە (هەڵدانەوە)، وەك:

**هەنگاوی سفر: کاری دان**

**هەنگاوی یەکەم: کاری (هەڵ دان)**

**هەنگاوی دووەم: کاری (هەڵدانەوە)**

لە ئەم هەڵوێستەدا، بلیمەتی زمانەکەمان لە حەشارگەکانیدا دەردەکەوێت، هەر بۆ نموونە و بە تەریبی لەگەڵ ئەو نموونەیەی سەرەوەدا، دەتوانین روو بکەین لە کاری (بەردانەوە) وەك:

**هەنگاوی سفر: کاری (دان)**

**هەنگاوی یەکەم: کاری (بەردان)**

**هەنگاوی دووەم: کاری (بەردانەوە)**

دووەم: لە رووی زانستیەوە، بابەتەکەی نێو خاڵی پێشوو، وەك ئەوە وایە کە کەرەستەکان بە (یەك لە دوای یەك) ریز بکەین، وەك دەنکی (خەناوك) لە کشتەکەکەیدا. لە راستیدا، دەبێت کەرەستەکان بە (تەریبی) ریز بکەین وەك دەنکی مێخەك لە هەر گرێیەکی مێخەکبەندا، وەك:

| هەنگاوی سفر | دان | |
|---|---|---|
| هەنگاوی دووەم | دان | دانەوە |
| هەنگاوی سێیەم | (هەڵ)دان | (هەڵ)دانەوە |

کەواتە، کاری (دان) لە یەکەم هەنگاودا دابەشبووە بۆ کاری (دان)ی بێ پاشگر و کاری (دانەوە)ی پاشگردار و لە هەنگاوی دووەمدا پێشگری واتاگۆڕ (هەڵ) واتای تازەی پەیدا کردووە، چی لە کاری (دان)دا و چی لە کاری (دانەوە)دا.

سێیەم: ئەو دابەشکردنەی کە لە خاڵی دووەمدا چەسپاوە چوار کاری ریز کردووە (دان، دانەوە، هەڵ دان، هەڵ دانەوە)، کەچی لە خاڵی یەکەمدا سێ کار ریز کراوە (دان، هەڵ

دان، هەڵدانەوە). کەواتە، دابەش کردن بە (تەریبی) کاری (دانـەوە) فـەرامۆش ناکـات و حەشارگەیەکی تر دەخاتە بەر مەکینەی ڕێزمان.

چوارەم: بـەپێی خـاڵی دووەم، کـاری (دان) لـە یەکـەم هـەنگاودا بـووە بـە (دانـەوە) و پاشگری دووپاتی (ەوە)ی وەرگرتووە، نەك پێشگری (هەڵ). کەواتە، پاشگری دووپـاتی هەر لە سەرەتاوە و هەر لە بنچینەوە ڕچـەیەکی نـوێی پەیـدا کـردووە لـە کـاری (دان)، وەك:




پێنجەم: لە پوختەی خاڵی (چوارەم)دا، دەتوانین بڵـێین: لەسـەر پەیـڕەی کـات، یەکـەم جار کاری (دان) بووە بە (دان) و بووە بە (دانەوە) و لە پاشتردا پێشگرەکان (هـەڵ، دا، لا،....) چەسپاون. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە، کە ژمارەی ئەو پێشگرانە زۆرن، وەك:

| دان | | واتا گۆڕین |
|---|---|---|
| دان | دانەوە | یەکەم هەنگاو: پاشگری (ەوە) |
| هەڵ دان | هەڵ دانەوە | دووەم هەنگاو: (پاشـگرەکانی هـەڵ، دا، لا، ....) |
| بەردان | بەردانەوە | |
| لادان | لادانەوە | |
| دادان | دادانەوە | |
| بادان | بادانەوە | |
| ...... | ....... | |

شەشەم: کەواتە، هەڵەیە ئەگەر بڵێین:

**کاری (دان) بووە بە (هەڵدان) و لە پاشتردا بووە بە (هەڵدانەوە).**

لە بەرانبەردا، راست و دروستە ئەگەر بڵێین:

**کاری (دان) لە رگێشەوە بووە بە دوو کاری جمك وەك (دان) و (دانەوە) و لە پاشتردا هەر یەك لە ئەو دوو کارە کەوتوونەتە بەر زەبری پێشگری (واتاگۆڕ) و بووگن بە (هەڵ دان) و بە (هەڵدانەوە)**

هەفتەم: بەڵگەیەکی تر بۆ ئەو بابەتەی کە باسکرا بریتییە لە کاری (دەنگ دان) و کاری (دەنگ دانەوە) کە دوو واتای زۆر زۆر جیاوازیان هەیە. بێگومان، وشەی (دەنگ) بووە بە (بەرکار) و چووەتەسەر هەردوو کارەکە و دوو واتای پەیدا کردووە، وەك:

ـ واتای یەکەم: دەنگ دان لە هەڵبژاردندا، وەك:

**دەنگ + دان ——— دەنگ دان**

ـ واتای دووەم: ناوبانگ پەیدا کردن، وەك:

**دەنگ + دانەوە ——— دەنگدانەوە**

لە هەندێك جێی تردا، مەرج نییە وشەکە بچێتە سەر هەر دوو کارەکە. بۆ نموونە، وشەی (رەنگ) دەچێتە سەر کاری (دانەوە) و دەبێت بە (رەنگ دانەوە)، کەچی هەمان وشەی (رەنگ) یەك ناگرێت لەگەڵ کاری (دان). لە رانبەردا، وشەی (کۆڵ) دەچێتە سەر کاری (دان) و دەی کات بە (کۆڵدان)، کەچی ناچێتە سەر کاری (دانەوە) و مەرجی (واتاگۆڕین) ناچەسپێت.

## ٢٠ـ رێچکە سنتاکسییەکانی کاری (دان):

لە گشت ئاستەکانی زمان دا، کاری (دان) تایبەتمەندی و ئاڵۆزی خۆی هەیە و پێویست بە ئەوە دەکات کە زۆر بە وردی لێی بتۆژرێتەوە. هەر لەبەر ئەوە، لە ئەم کۆپلەیەدا دەمانەوێت بە خنجی ئەو رێچکانە دیاری بکەین کە لە رێزمانی ئەم کارەدا دەردەکەون، وەك:

<u>یەکەم</u>: ڕێچکەی ڕستەسازی ئاسایی بۆ گشت کارە تێپەڕەکان، وەک:

**(بکەر : بەرکار : کار)**

وەک:

**تۆ : پارە : دەدەیت**
**تۆ : تۆپەکە : هەڵ دەدەیت**
**تۆ : کات : بە فیڕۆ دەدەیت**
**تۆ : پێنووسەکە : دابدە**

لە ئەم ڕێچکەیەدا، بەرکارەکان بریتین لە بەرکاری ڕێزمانی سادە و ساکار و هیچ بەشداریەک ناکەن لە گۆڕینی سیمای کارەکاندا.

<u>دووەم</u>: ریچکەی ڕستەسازی ئاسایی بە بەرکاری ناراستەوخۆوە (کاری ئامرازدار)، وەک:

**(بکەر : بەرکار : کار : بەرکاری ناراستەوخۆ)**

| بکەر | بەرکار | کاری ئامرازدار | |
|---|---|---|---|
| | | کار | ئامراز |
| من | پارەکە | دەدەم | بە شیلان |
| من | پارەکە | دەدەم | پێی |
| یان، | | | |
| من | پارەکەی | دەدەم | پێ |

<u>سێیەم</u>: ڕێچکەی (کاری ئامرازدار) بە ئامرازی (ێ)، وەک:

| بکەر | بەرکار | کاری ئامرازدار | |
|---|---|---|---|
| | | کار | ئامراز |
| من | پارەکەی | دەدەم | پیْ |
| من | پارەکەی | دەدەم | یْ |

چوارەم: ڕێچکەی کاری یاریدەدەر بە (ڕۆنان)، وەك:

**دەنگ دان**

**هەناسە دان**

**کۆڵ دان**

**بۆڕ دان**

**کوڵ دان**

لە ئەم ڕێچکەیەدا، کاری (دان) وەك کارێکی یاریدەدەر ئیش دەکات بۆ ڕۆنانی کارێکی نویْ، کە بە واتاکەی بریتییە لە (تێنەپەڕ واتایی)، وەك:

**ئێمە کۆڵ نادەین**

**چێشتەکە کوڵ دەدات**

لە ئەم جۆرە بەکارهێنانەدا، ڕستەی (بکەر نادیار) دروست نابێت مەگەر بە زۆر. سەرەڕای ئەوەش، لابردنی (بەرکار) دەبێت بە هۆی لابردنی ئەو واتایەی کە بەرکارەکە بەستوویەتی بە کاری (دان)ەوە.

پێنجەم: زۆرجار، کاری (دان) جارێکی تر دەکرێتەوە بە (تێپەڕ)، وەك:

**هەناسەدان: هەناسەدان بە کەسێك: هەناسە پیْدان**

بۆ نموونە، وەك چۆن وشەی (هەناسەدەر) هەیە، هەر ئاوهاش وشەی (هەناسەپێدەر) هەیـە، وەك:

**نەخۆشەکە هەناسە دەدات**
**دکتۆرەکە هەناسە بە نەخۆشەکە دەدات**
**دکتۆرەکە هەناسەی پێ دەدات**

ئەم جۆرە بەکارهێنانە بە ئەم چەشنە یاسارێژ دەکرێت:

بکەر : بەرکار : (پێ) : کار

ئەم رچە سنتاکسییە پەنا و پاسارێکیتر لە رێزمانەکەدا روون دەکاتـەوە و ئـەرکێکی تـر دەدۆزێتەوە بۆ ئەرکەکانی ئامرازی پەیوەندی (بە) و روخسارە لکاوەکـەی (پـێ). جـۆرە بابەتی ئاوها، دەشێت بخرێتە بەر تۆژینـەوە، نـەك جـار بـە جارێك نووکـە قەڵـەمێکی لێ بدرێت.

<u>شەشەم</u>: رێـچکەی رستەسـازی دوولایەنـە. زۆر جـار بـاری رستەسـازی بـە دوو رێـچکەدا دەچەسپێت بەسەر کاری (دان)دا. بۆ نموونە، بۆ هەمان (واتا) دەشێت ئـەم دوو قاڵبـەی خوارەوە بەکاربهێنرێت:

رێگای یەکەم:

**شیلان ئازاد هان دەدات**

رێگای دووەم:

**شیلان هانی ئازاد دەدات**

لەسەر ئەندازەی:

**شیلان پارە داوا دەکات**
**شیلان داوای پارە دەکات**

بێگومان ئەم ڕێچکە دوو لایەنە بە پەرپووتی و بەبێ بەرنامەیی زمانی نووسینی پێ لەوتاوە. لە ئەم ڕووەوە، دەشێت یەکێك لە ئەو دوو ڕێچکەیە بخرێتە بەر برەو. ئێمە ئەو جۆرەی کە لە ڕێگای یەکەمدا چەسپێنراوە، بە شیاوتر دەزانین.

**٢١ـ پوختەکاری:**

کاری (دان) کێشەیەکی زۆری هەیە و لە گشت ئاستەکانی زماندا بە ئالۆزی خۆی دەنوێنێت. هەر لەبەر ئەوە، پێویستی بە چەندین لێکۆڵینەوە هەیە و ئەم کارەی ئێمەش بریتییە لە سەرەتایەك بۆ ئەو ئیشانە. لە دووی توێی ئەم نووسینەدا، چەند بابەتێك هرووژێنراون و دەشێت بە پوختەیی بیان کەین بە چەند خالێك، وەك:

**یەکەم:** کاری (دان) ڕوخساری چاوگەکەی زۆر کورتە، وەك هەردوو کاری (مان و نان). لە ئەم سێ کارەدا (دان، مان، نان) ئەگەر نیشانەی ڕابردوو (أ) و نوونی چاوگ (ن) لابدەین تەنها سێ دەنگ دەمێنێتەوە (د، م، ن)، کە بریتیین لە ڕەگی هەر سێ کارەکە. هەر لەبەر ئەو هۆیە کاری (دان) لە ئاستی دەنگسازی و وشەسازیدا بە ئالۆزی دەچێتە نێو تەونی ڕێزمانەکەوە و ئەو کێشانەی کە لە کورتی ڕوخسارەکەیەوە پەیدا بووە ڕاگوێزیان دەکات بۆ ئاستی وشەسازی. بۆ نموونە، دەبا ڕەگی کاری (دان) بریتی بێت لە پیتی (د)، کەچی بریتییە لە برگەی (دە) و لە پاشتردا دەنگی بزوێنی (ە) دەتوێتەوە لە نێو نیشانەی ڕابردوودا و جارێکی تر بنجی کارەکە دەبێتەوە بە پیتی (د) و برگەکەش دەبێتەوە بە (دا). تەنانەت، لە دەمکاتی ڕانەبردووشدا لەگەڵ جێناوی کەسی سێیەمی تاك (ێت) کێشە دروست دەبێت و جێناوەکە دەگۆردرێت بە ئەلەمۆرفی (ات).

**دووەم:** کاری (دان) هەر لە بنج و بنەڕەتەوە، پاشگری دووپاتی (ەوە) وەردەگرێت و دەبێت بە (دانەوە). لە ئەم میکانیزمەدا، واتای کاری (دان) دەگۆڕێت و ئەمجا هەردوو کارە دووانەکە (دان و دانەوە) دەکەونە نێو بزاڤی ڕستەسازی و واتاسازی، بەلام هەر یەکێکیان بە سەربەخۆیی لە ئەوی تر. بۆ نموونە، وەك چۆن (دان و دانەوە) جیاوازن لە یەکتری، هەر ئاوهاش (دەنگ دان) و (دەنگ دانەوە) جیاوازن لە یەکتری. لە ئەم ڕووەوە، سێ باری شیاو هەیە بۆ بزاڤی واتا گۆڕین:

١ـ هەندێك لە پێشگرە واتاگۆڕەكان دەچنە سەر هەردوو كاری (دان) و (دانەوە) و دوو واتای جیاواز لە یەكتری چێ دەكەن، وەك (دەنگ دان و دەنگ دانەوە)، باسكراو لە پێشتردا.

٢ـ دەشێت كاری (دان) پێشگرێكی واتاگۆڕ وەربگرێت، بەڵام كاری (دانەوە) وەری نەگرێت و بزاڤی واتاگۆڕین پەیدا نەبێت. بۆ نموونە، كاری (فڕێدان) واتای دەگۆڕێت، بەڵام كاری (فڕێدانەوە) واتاكەی ناگۆڕێت، بەس رووداوەكەی دووبارە دەبێتەوە.

٣ـ دەشێت كاری (دانەوە) پێشگرێكی واتاگۆڕ پەسەند بكات و واتاكەی پێ بگۆڕێت، بەڵام كاری (دان) واتاكەی پێ نەگۆڕێت. بۆ نموونە، (ڕەنگ دانەوە) هەیە، بەڵام (ڕەنگ دان) واتای نییە، مەگەر بە زۆرەملێ.

**__سێیەم__:** كاری (دان) بە رووتی بەبێ هیچ پاشگر و پێشگرێك واتایەكی (تابۆ) دەبەخشێت و ئەم واتایە خۆی دەسەپێنێت بەسەر گوفتاردا. لە هەر هەل و مەرجێكدا كە (بەركار) لابردرێت لە كاری (دان)دا، چاوی بیرمان وا دەزانێت كە ئەو بەركارە تابۆیە لادراوە. بەشێوەیەكی گشتی، گشت كاری زمانەكە ئەوە پەسەند دەكەن كە (بەركار)ی جودا لابردرێت، بە شێوەیەكی تایبەتیش، هەندێك لە كارەكان ئەوە پەسەند دەكەن كە بۆ سەلاری گفت گۆ وشەی ناشرین و تابۆ لابچێت. كاتێك كە ئەو دوو میكانیزمە یەك دەگرن، ئەوا میكانیزمە تایبەتەكە واتاكەی خۆی زاڵ دەكات. هەر بۆ پراوە، كاری (كردن)یش هەمان دیاردەی تێدا هەیە بەڵام بە دژواتای كاری (دان).

**__چوارەم__:** كاری (دان) هەر لە بنجەوە خۆی دەكات بە كارێكی (ئامرازدار) و هەندێك لە ئامرازەكانی پەیوەندی پەسەند دەكات، وەك:

**دان بە ..... : پێدان**

**دان لە ..... : لێدان**

**دان بە .... ەوە : پێوەدان**

**دان بە .... دا : پێدادان**

لە راستیدا، ئەم ئامرازانە واتای نوێ پەیدا دەکەن و کاری نوێ چێ دەکەن و دەشێت هەر کارێك لە ئەم کارانە بە جودایی سەودا بکرێت. ئەمە و لە ئەم میکانیزمەدا، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئامرازی پەیوەندی بووە بە (واتاگۆڕ) لەسەر ئەندازەی (هەڵ، دا، را). هەر بۆ پرۆڤە، وەك چۆن پێشگری (هەڵ) واتای کاری (دان)ی گۆڕیوە بۆ کاری (هەڵدان)، هەر ئاوهاش پێشگری (پێوە) واتای کاری (دان)ی گۆڕیوە بۆ (پێوەدان).

**پێنجەم:** لە زۆر جێدا ئامرازی (بە) لە کاری (دان بە ...)دا نابووت دەکرێت و دەکرێت بە ئامرازی (ـە). لە ئاستی ئەم گەمە نابەجێیەدا زمانەکە پەرپووت دەبێت، چونکە ئامرازی پەیوەندی (ـە) لاپەڕەی خۆی هەیە لە ئەلبوومی ڕێزمانەکەدا و هەڵ و مەرجی خنج و سفتی خۆی هەیە بۆ دەرکەوتن، وەك:

١- ئامرازی پەیوەندی (ـە) دەچێتە نێو کرۆکی قەوارەی (کار)ەوە.

٢- ئەم ئامرازە ڕووداوی کارەکە ڕاگوێز دەکات بۆ سەر ئاوەڵکارێکی شوێن، وەك (سەر، دەر، ناو....).

٣- ئامرازی (ـە) واتای (کار) ناگۆڕێت، بەڵام باڵێکی سەربار چێ دەکات لە میکانیزمی ڕووداوی کارەکەدا، نەك لە پەیژەی ڕستەکەدا.

هەر بۆ نموونە، ڕستەی (من دامە تۆ) نادروستە، بەڵام ڕستەی (من دامە بەر ڕەخنە) دروستە، چونکە ئاوەڵکاری (بەر) کەوتووەتە پاش ئامرازی (ـە).

**شەشەم:** کاری (دان) بریتییە لە یەکێك لە ئەو کارانەی کە دیاردەی (واتابەستی) پێوە دیارە. بۆ نموونە، لە کاری (هەناسەدان) واتای وشەی (هەناسە) واتای کاری (دان) بەستووە و لە هەمان کاتیشدا، کاری (دان) وەك کارێکی ڕۆنەر دەرکەوتووە. لە ئەم جۆرە کارەدا چەند ئاکارێك بەدی دەکرێت، وەك:

١- ئەو وشەیەی کە واتای کارەکە دەبەستێت دەبێت بە (بەرکار) و پێکەوە واتایەکی نوێ پەیدا دەکەن.

٢- هەر چەندە ڕستەکە، (تێپەڕ)ە بە ڕێزمانی کاری (دان)، بەڵام لە ڕووی واتاوە لە (تێنەپەڕ) دەچێت.

٣ـ ئەو جۆرە رستەیە، لەبەر ئـەوەی تێنەپـەڕن بـە (واتـا) دۆخـی (بکـەرنادیار) پەسـەند ناکەن.

٤ـ ئـەو جـۆرە کـارەی کـە بـە واتـا تازەکـەوە دەبـن بـە تێنەپـەڕ، بـە ڕێزمـانی ئـامرازی پەیوەنـدی (بـە، پـێ) دەبنــەوە بـە (تێپــەڕ)، وەك (هەناســەدان بـە کەسـێك)، یـان (هەناسەپێدان). لە ئاستی ناوی بکەردا دەگوترێت (هەناسەدەر) و (هەناسەپێدەر).

٥ـ کاتێك کە کاری (هەناسەپێدان) چێ دەبێت بە تێپەڕی، جارێکی دی ڕێـژەکانی (بکـەر نادیار) دەکەونەوە کار، وەك (هەناسەپێدان، هەناسەپێدران). بەرانبەر بە ئـەم دیاردەیـە لە ئاستی کاری (هەناسەدان)، کە تێنەپەڕە بە واتا، کاری (هەناسەدران) سـست دەبێـت لە بەکارهێناندا.

٦ـ تێپەڕاندنی کاری (هەناسەدان) بە ئامرازی (بە، پێ)، کەم و زۆر لە تێپەڕانـدنی کـاری (تێنەپەڕ) دەچێت بە (ئاندن)، وەك (سووتان : سووتاندن) ئەم دوو کارە (هەناسـەپێدان و سووتاندن) ڕێژەی (بکەر نادیار) دروست دەکەن، چونکە تێپەڕن, وەك:

| هێزی تێپەڕین | کاری (سووتان) | کاری (هەناسەدان) |
|---|---|---|
| تێنەپەڕ | سووتان | هەناسەدان |
| تێپەڕاندن | سووتاندن | هەناسەپێدان |
| بکەر نادیار | سووتێنران | هەناسەپێدران |

**حەوتەم:** کاری (دان) چەند پۆلێك لە پێشگری (واتاگۆڕ) لە خۆ دەگرێت و دەشـێت ئـەم کارە بریتی بێت لە کەرەستەیەکی بەکار بۆ دۆزینەوەی میکانیزمەکانی (واتا گـۆڕین) لـە ڕووبەری ڕێزمانی کوردیدا، وەك:

١ـ واتا گۆڕە سادەکانی زمانی کوردی (هەڵ، دا، ڕا...) کە دەچـنە سـەر چـەندین کـار، وەك (هەڵ دان، دادان، ڕادان).

٢ـ واتا گۆڕین بە ئامرازی پەیوەندی وەك (لێ، پێ، پێوە، پێدا). ئەم بابەتە لـە پێـشتردا باس کرا و نموونەی (لێدان، پێدان، پێوەدان، پێدادان) بەکارهێنران.
٣ـ واتا گۆڕین بە ئامراز و بە بارگەکەی، وەك: (بە فیرۆدان، لە دەست دان).
٤ــ واتـا گـۆڕین بـە وشـەی واتـادار، وەك: (پـەلاماردان)، (سـووڕدان)، (باوێـشکدان)، (هەناسەدان)، (باوەشدان لە ...)، (کوڵدان)، (بۆڕدان)، (ڕێدان).
٥ـ واتا گۆڕین بە (ئاوەڵکاری شوێن)، وەك (دەردان)، (بەردان)، (لادان).
٦ـ واتا گۆڕین بە پاشگری (ەوە) و بە یەکێك لە ئەو پێشگرانەی کە باس کران، وەك:

**(بەر) دان .... : (بەر) دان (ەوە)**

**(هەڵ) دان .... : (هەڵ) دان (ەوە)**

لە نموونەکانی دەستە ڕاستدا، تەنها هـەر پێـشگرەکان بـریتین لـە (واتـاگۆڕ)، بـەڵام لـە نموونەکانی دەستە چەپدا، پێشگرەکان و پاشگری (ەوە) بریتین لە (واتاگۆڕ).
**هەشتەم:** لە کاری (تێکدان)دا دژواتایی هەیە. بۆ نموونە (چـا تێکـدان) و (مـاڵ تێکـدان) دوو واتای دژیەك دەبەخـشن لـە (چـا تێکـدان)دا بـاری چـایەکە بـەرەو باشـی دەچـێت، کەچی لە (ماڵ تێکدان) باری ماڵەکە بەرەو خراپی دەچێت.
**نۆیەم:** کاری (تێکدان) بریتییە لە دیوە تێپەڕەکـەی کـاری (تێکـچوون)، کەچـی لـەپاش لادانی پێشگری (تێك)، لە ئاستی کاری (چوون)دا، کاری (دان) ئەو ئەرکەی نییە.
**دەیەم:** لە دوو کاری هاوشێوەدا، وەك:

**ـ دەست دان لە (...)**

**ـ لە دەست دان.**

ئاڵۆزی هەیە. کاری یەکەم جەمسەرەکەی بریتییە لـە کـاری (لێـدان) و وشـەی (دەسـت) بریتییە (بەرکار). کەچی کاری دووەم خۆی جەمسەرێکی تەواوە و پێشگری (لە دەست) واتاکەی گۆڕیوە. ئەگەرنا، لە ئەم کارەدا نـاتوانین وشـەی (دەسـت) لاببـەین و نـاتوانین

ئامرازی (له) بکەین بە (لێ) وەك (دەست لێ دان). لە ئەم کردەوەیەدا، واتای کاری دووەم تێکەڵ دەبێت بە واتای کاری یەکەم. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بریتییە لە حەشارگەیەکی ڕێزمانەکە. بە کورتی دەستەواژەی (لە دەست) لە کاری (لە دەست دان)دا بریتییە لە واتاگۆڕێکی پتەو و ناشێت دەستکاری بکەین.

**يازدەيەم:** کاتێك کە کاری (دان) دووجار واتای گۆڕا بێت، جارێك بە (پێشگر) و جارێك بە (پاشگر) وەك (هەڵدانەوە)، نابێت وا بزانین کە کاری (دان) هەر دوو واتا گۆڕەکەی وەرگرتووە. لە راستیدا کاری (دان) و کاری (دانەوە) هەر یەکێکیان بە جودایی پێشگری (هەڵ)ی وەرگرتووە.

**دوازدەيەم:** لە زمانی نووسین دا، ئامرازی (ێ) تەنها لە دوو کاردا بڕەوی هەیە، کە بریتین لە (دان) و (گەیشتن). بێگومان گشت ئەو کارانەی کە ئامرازی (ێ) هەڵ دەگرن کاری (دان بە ...) دەکەن بە جەمسەری واتایی، نەك کاری (دان).

## سەرچاوە:


- د. شێرکۆ بابان، سەرەتایەك لە واتا سازی لە ڕێزمانی کاردا، ئامادەیە بۆ چاپ، هێشتا بڵاو نەکراوەتەوە.
- د. شێرکۆ بابان، ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ەوە)، هەولێر ۲۰۰۱.
- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ۱۹۷٦.
- د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، ۱۹۸۲.
- لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ۱۹۷٦.
- محەمەد مەعرووف فەتاح، کار پۆلین کردن بەپێی ڕۆنان، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۲۱، بەغدا ۱۹۸۹.
- د. وریا عومەر ئەمین، تێنەپەڕ فەرمانێکی بکەر نادیارە، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ۱۰۷، بەغدا ۱۹۸۵.
- محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر ۱۹۸۷.

# ملخص البحث

## جولة في قواعد
## فعل (دان) في اللغة الكردية

**د. شيركو بابان**

في اللغة الكردية، هنالك غموض و تعقيد في القواعد الخاصة ببعض الافعال من الناحية الصرفية و النحوية أو من ناحية المعنى و الاستعمال. هذه المشاكل القواعدية لها جذور علمية خاصة تتميز بها قواعد اللغة الكردية و لايمكن دراستها بسهولة و على ضوء قواعد الافعال في اللغات الاخرى. و مثال من هذه المجموعة من الافعال هو الفعل (دان) و الذي يقابله في المعنى السطحي أو الظاهري الفعل (أعطى، يعطى) في اللغة العربية أو الفعل ( to give) في اللغة الانگليزية. في القواعد الخاصة بهذا الفعل هنالك تفرعات جانبية من الناحية الصرفية و النحوية و هنالك توسعات عرضية في المعنى و المدلول. في الخطوة الاولى من البحث، تم دراسة المشاكل السطحية و التي يمكن معالجتها بالقواعد التقليدية و في الخطوة التالية تم التعمق في صلب مشاكله الجوهرية و الناجمة عن تغيير الشكل بالادوات الصرفية و توليد معاني جديدة متفرعة من المعنى الاصلي للفعل و خاصة تأثير أداة تكرار الحدث (ەوە) و التي تغير جذرياً المعنى الاصلي و تفتح باباً جديداً في قواعد فعل (دان). في القواعد التقليدية لايمكن التعمق الكامل في هذه التعقيدات، إلا في طبقة رقيقة من سماكة قواعده.

في هذا البحث أجريت جولة سريعة و جدية في الجذور المعمقة لهذه المشاكل و ذلك لغرض قولبتها في قواعد اللغة الكردية، حيث تم عرض مافي قواعده من غموض و أسرار.

# Abstract

## A scope in grammar of the verb (Dan) in Kurdish language

**Sherko Baban**

In Kurdish language, there is some imbiguity and complication in grammar of some verbs, in their morphoy and syntax, or in their meaning and their use. This category of verbs has its particularity in Kurdish grammar. An example from these verbs is the verb (دان), which corresponds by hard meaning to the verb (to give) in English, or the verb (donner) in French. In grammar of this verb, due to the presence of prefixes and secondary meanings, there is some lateral grammatical and semantical problems. These irregularities lead such verbs to have their own grammatical particularity. In addition to these problems there is an other page concerning the past fix (هوه), which corresponds to the prifix (-re) in English or French. This grammatical element, functions as a meaning changer in a too complex manner.

In this work, a general scope is presented for all the problems in forms and meanings of this verbs and a conclusion is performed for the origin of these irregularities.

# کاریگەریی دەستنووسەکانی مامۆستایانی کورد
# لە نووسینەوەی
# مێژووی کورد و زانایانی کوردستاندا

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

**سەرەتایەکی کورت:**

دەبێ لەپێش هەموو شتێکدا ئەوە بزانین کە مێژووی کۆنی کورد بە دروستیی نەنووسراوە و، لەتەك ئەوەدا گەلێك لە مێژوونووسە گەورەکانی جیهان وەك: ئیبنوئەثیری جەزەریی و، ئیبنو خەلەکان و، ئیسماعیل پاشای بابانی و، چەندین مێژوونووسی دیکەی گەورە، کە کتێبگەلی گەورە و نایاب و جێگەی بایەخیان لە مێژووی ولآت و زانایانی ولآتی ئیسلامیدا نووسیوە کورد بووە، کەسی وامان نەبووە بە تەنگ مێژووی گەلی کوردەوە بێت و، کتێبی سەربەخۆی لەسەر بنووسێت، نەك هەر ئەمە بەڵکو ئەو مێژوونووسە گەورانە نەهاتوون بەش و بابەتی جیا لەناو کتێبەکانیاندا بۆ مێژووی کوردستان، یان زانا و ناودارانی گەلی کورد دابنێن و، هیچ نەبێ، وەك ولآت و زانایانی ولآتان گەلەکەیان بە جیهان و مێژوو بناسێنن. نەك ئەمەش تەنانەت ئەو مێژوونووسە کوردانە ئەوەندەیان بە خۆیشیان ڕەوا نەبینیوە لە سووچێکی لاپەڕەیەکی کتێبە گەورەکانیاندا بە یەك دوو دێڕ باسی خودی خۆیان بکەن و، بڵێن: ئێمە لە نەتەوەی کوردین و، ئاو و هەوای سازگاری کوردستان مێشکی زاخاو داوین و، لە پەنای چیا و دۆڵیدا گەشەمان کردووە و، مامۆستایانی کورد فێری خوێندن و زانیارییان کردووین.

لەلایەکی دیشەوە هەمیشە کوردستان شەڕگە و گۆڕەپانی گۆڕینەوەی دەستەلآت و، سەندنەوەی تۆڵەی ئەم زلهێز لەو زلهێز و، داگیرکردنی بنکە و جێگەی دەستەلآتی ئەم میر و ئەو پادشا بووە و، سالآنە و مانگانەیش چەند شەڕی گەورە و کارەساتی خان و مان سووتێن سەرتاسەری، یان بەشی زۆری، کوردستانی گرتووەتەوە و، بوونی قەلآ

دێـرین و گـەورەکانی وەك قـەڵاکانی: هـەولێر و، کـەرکووك و، چەمـچەماڵ و، بـەکراوا و، ئەحمەدئاوا و، باوە کورۆیی و ... دەیان قەڵای دیکـەی بەشـەکانی دیکـەی کوردسـتان، نیـشانەیەکی ئاشـکرای ئـەم قـسەن و، ئەگـەر خـوێنی ڕژاوی دەوروبـەری ئـەو قەڵایانـە مابوایە و، کەلاك و کەللەسـەری بـێ گیـانکراوی دیفاعکـەران و داگیرکـەران ـ وەك یـەك ـ نەرزیبایە و نەبوایەنەوە بـە خـۆڵ، ئێـستە بـن ئـەو قەڵایانـە دەریـای خـوێن دەبـوون و، بارسایی ئێسك و پروسکی پاڵەوانان و جەنگاوەرانیش لە سەرووی قەڵاکانەوە دەبوون!

لە خوێندنەوەیەکی خێرای لاپەڕەکانی مێژوویشەوە بۆمان دەردەکەوێ کـە ئاکـامی جـەنگ چـییە و، چ ماڵکاولییـەك بەسـەر شـەڕگە و وڵاتـی جـەنگزەدەدا دێـت و، هێـزی سەرکەوتوو و براوە چی بـە وڵاتـی هێـزی شکـستخواردوو و دۆڕاو دەکـات و، چ بەڵایـەك بەسەر ئاسەوار و شوێنەوار و سامانی نەتەوایەتیی و مێژووییدا دێنێ!

گەلی کورد گەلێ جارە و بەتایبەتی لەم سەدانەی دواییـدا، خوازیـاری ئـەو جەنگانـە نەبووە و، لایەن نەبووە تیایاندا و، هەرچی پێکرابێ بەزۆر پێیکراوە و، ئەنجامیش بـەش و بارەی جگە لـە مـاڵوێرانی و خـان و مـان سـووتانی بەشـێکی دی نـەبووە و، روونیـشە داگیرکەر دوای سەرکەوتنی بەسەر لایەنەکەی دیدا، تا پێی کرابێـت ڕووی تـاڵان و بـڕۆی کردوەتە سەر شوێنە گەورە و دیارەکـانی وەك قـەڵا و مەدرەسـە و مزگـەوت و، هەرچـی شوێنەواری پڕ بایەخ و، سامانی بە سامانی وڵات بووبێت لەو شوێنانەدا پارێزراوە و، ئەو داگیرکـەرەیش هەرچـی بـەلاوە پەسـەند بووبێـت و بـۆی هـەڵگیرابێت لەتـەك خۆیـدا بردوویـەتی و، چیـشی وا نـەبووبێت بـە ئـاگری رق و کینـەی سـووتاندوویەتی و شـتێکی لەدوای خۆیەوە لە خۆڵەمێش بەولاوە بەجێ نەهێشتوە!

کە ئەمەیش دەنووسین، لەو بەری رەنج و، کۆششی بیری مێشك و، ئـەرکی دەسـت و بازووی هونەرمەندان و ڕۆشنبیرانەی سەدان ساڵی رابوردوومان و، هەزاران قەڵا و شـار و گوندی بەرینی کوردستانە، هەواڵمان لە هیچیان نییە و، نازانین چیمان بووە و، دوژمن چی لێکردوون و، بۆ کوێی بردوون و، چییان بەسەر هاتووە!

تەنها شتێك بۆرە هەواڵێکی دروستمان لەسەری لـە دەسـتدا بێـت ـ کـە ئـەویش بـە قەڵـەمی دوژمنانمـان نووسـراوە ـ هـەواڵی گەنجینـە و کتێبخانـەی عەبداڵخانـە کـە دوای

نیشتنەوەی جەنگ و تالآنکردنی قەلاَکەی ئەولیا چەلەبیی مێژوونووسی دەربار بانگ کراوە بۆ سەرنووسکردنی ئەوەی کە ماوە لە سامانی عەبدالّخان و، ئەویش بەم شێوە - وەك مامۆستا ئەمین زەکی نووسیویەتی - تۆماری کردوون:

"ئەولیا چەلەبی خۆی (بالذات) لەگەلّ هەیئەتێك بۆ ضەبطی مەترووکاتی عەبدالّ خان مەئموور بووە، ئەلّێ: لەناو ئەم مەترووکاتەدا غەیری باری حەوت حوشتر کتێبی نایاب لە کتێبخانەی ئەمیردا، نزیکەی چوار هەزار کتێبی بە قیمەت و مەشهوور قەید کراو، ئەم کتێبانە هەموو دەستنووس و دائیر بە: دین، تەئریخ، لوغەت، عیلمی حەیوانات و، نەباتات و، طیب و، تەشریح و، شیعر و دیوان بوو، ئەنواعی خەریطە، ئەطلاس، صوورەت و لەوحەی نایابیشی تیابوو و، جەلّدیان لە غایەت بەدەر بە قیمەت بوو.

تەئلیفاتی عەبدالّ خان ٧٦ جەلّد کتێب و ١٠٥ ریسالە بوو بە عەرەبی و فارسی نووسرابوو....)[1]

---

[1] بڕوانە: محمد امین زکی - کورد و کوردستان بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ١٩٧. انتشارات سیدیان مهاباد. عباس عەزاویش لە (العمادیة في مختلف العصور)دا بەشێوەیەکی دی و کەمێك بە درێژی باسی زێڕ و گەوهەر و شتی فرە نایابی ناو گەنجینەی عەبدالّ خان دەکات و دەلّێت: ئەوانەی لە کتێبی نایاب و، دەستتخەتی بێوێنە و، سەدان کتێبی نایابی تەفسیری قورئانی پیرۆز و، فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (د. خ) و دەیان دانەی نایابی شانامە و، چەندین دانەی نایابی دیوانی گەورە شاعیرانی فارس و ... جگە لەوەی دەیان نوسخە لە قورئانی پیرۆز بە خەتی خۆشنووسە ناودارەکانی جیهان کە وێنەیان بەو شێوە تەنانەت لە کتێبخانەی شێخولئیسلامیشدا دەست ناکەوێت! هەر چەند عەباس عەزاویی زۆر بەدرێژیی لەسەر ئەم باسە دەنووسێت و ناوی دەیان شتی سەرسوڕهێنەر دێنێت، دوایی دەلّێ: ئەوەی ئەولیا چەلەبیی نووسیویەتی لێرەدا جێگەی نابێتەوە و ئەگەر لەسەری بڕۆم زۆر زۆری دەوێت.

هەر لەو قسانەوە دەردەکەوێت کە ضیائەدین خانی میری بەدلیس لەو شوێنەدا بووە کە کتێب و شتومەکەکانی گەنجینەی عەبدالّخانی تێدا هەڕاج کراوە و، کاتێ ئەو شتانەی دیوە خۆی پێ نەگیراوە و فرمێسك بە چاویدا هاتووەتە خوارەوە، ئەحمەد شای والیی لێی پرسیوە: ئەمانە هی تۆن وا بۆیان دەگریت؟ ئەویش وتوویەتی: نەخەیر، بەلاَم گەلێکیان بە خەتی منن. والیش ئەو شتانەی بە میری بەدلیس بەخشیوەتەوە.

ئەمە یەکەم کتێبخانـەی کـورد و مـیرە کوردێکـە کـە هـەواڵێکی کـەممان لـە دەم و قەڵەمی دوژمنانەوە لێی هەیە، دەبێ ئەو هەموو میرە کوردە کە بەزۆریی خاوەنی قەڵا و چەك و قەڵەم بوون، چییان کتێب و دەستنووسی نایاب هەبووبێت؟ شوێنەوارەکانیان بە چ دەردێك چووبن؟

تەنانەت دەبێ ئەم گەنجینە و سامانە لە نرخ نەهاتووەی عەبداڵ خان پاش ئـەوەی دەستی بەسـەر داگـیراوە و ـ دیـارە ـ بەشـێکی لـە کتێبخانـەی بـابی عالیـدا لەنگـەریان گرتووە چییان بەسـەر هـاتبێ؟ لـەو هـەزاران دەسـتنووس و دانـراوە دانـسقە و نایـاب و کەمیابە ـ تائێستە ـ هەواڵی پەرەپەکیشیان لای مێژووی کورد و زانایانی نییە.

ئەم هەواڵەیش کە هەمانە لەم سـەدانەی دواییدایـە. ئـەی هـەواڵی مێـژووی کـۆن و، چـەرخەکانی پـێش زایـین و دوای ئـەوان و، ئـەو شـوێنەوارانەی لـە: مـۆرە قورینــە و، سـواڵەلمەتە و، تەختــە و تــەوەنی دۆزراوە، لــە ئــەنجامی کەنــە و پــشکنین و منــەی شوێنەوارناسان و گەڕیدە بیانییە جۆراوجۆرەکان کە لە مـاوەی دەیـان سـاڵدا سـەدان و هەزاران شوێنی دێرین و ئەثەریی کوردستانیان ئەمدیوە و دیو کردووە و، هەزاران پارچە نووسراوی بزماریی و کۆنی دۆزراوە لەو شوێنەوارانەیان لەتەك خۆیاندا بردوەتەوە و، لـە مۆزەخانەکانی وڵاتانی هەندەرانـدا پـارێزراون و، گـەلێکیان باسـی ئەوەیـشیان لـە پاڵـدا نەنووسراوە کە لە کوێ دۆزراونەتەوە یان چۆن دزراون و، لەبنەڕەتدا سـەر بـە چ گـەل و خاکێکن!

هـەر بـەم پێیـەیش دەسـتنووس و دانـراوی زانـا و مامۆسـتایانمان، ئەوانـەیان لـەو هەموو کارەسات و جەنگانەی رابوردوو سەریان دەرکردووە، لە بنهەنگڵی ئـەو گەڕیـدە و رۆژهەڵاتناسـانەدا هـەڵگیراون و، ئـاوارەی نـاو کتێبخانـە و مۆزەخانـەکانی وڵاتـانی دوور بوون و، ئێمەی خاوەنیان هەواڵێکی ئەوتۆمان لە شوێن و ژمارە و ناو و بابەتیان نییە.

---

ئەولیا چەلەبیی لەناو قسەکانیدا دەڵێت: ئەو دەستخەتانەی هەڕاج کران و لەوێدا تالآنفرۆش کران وەها فرۆشران کە پارەی دەستخەتێکیان بایی یەك نوقطە ـ خاڵی ـ مەرەکەبی دەستخەتەکە نەدەبوو!

ئەوەیش با لەولاوە بوەستیٚ کە دەیان هەزار دەستنووسی نایابی جۆراوجۆرمان لە کتێبخانەکانی بەغدا و تاران و ئەستەمووڵ و دیمەشق و شارەکانی دراوسێی کوردستاندا پارێزراون و، دووبارە هەواڵێکی ئەوتۆمان دەربارەی تەنانەت ژمارەکانیشیان، کە چەندن، نییە !

لێرەدا بەسەر ئەوەدا ناڕۆم کە بنووسم: وا بزانم کەم گەل هەیە - یان هەر نییە - لەم چەرخەدا بە ئەندازەی گەلی کورد کەمتەرخەم و خەمسارد بێت بەرانبەر بە ئاسەوار و دەستنووس و شوێنەوارەکانی زانایان و خاك و ولاّتەکەی. لەم سەردەمەدا هەر یەکێك لە ئێمە بگریت چەندین بەسەرهاتی سەرسوڕهێنەری دەربارەی پشکنینی ناڕەوا و نازانستییانە و، دۆزینەوە و هەڵکۆڵین و هەڵگرتنی ناشییانەی شوێنەواری دەگمەن و مێژوویی ژێر زەویی، دەیان گرد و تەپۆڵکە و گۆڕستان و شیو و دۆڵی کوردستان و، دوایی فرۆشتنیان بە قاچاخچییان و درانی شوێنەوار بەڕۆژی نیوەڕۆ و، بە دەنگنەهاتنی کەسیش لە عاستی ئەم تاوانانەدا... نەبیستبیٚ و نەزانیٚ. ئەمە لەکاتێکدا گەلانی خوا پێداوی ولاّتانی جیهان دەمێکە لە کۆکردنەوە و دۆزینەوەی زۆربەی شوێنەوارە مێژووییەکانیان بوونەتەوە و، ئەگەر شتێکیشیان مابیٚ زۆر وەستایانە و شارەزایانە و لەسەرخۆ کاری بۆ دەکەن و، باشترین و رازاوەترین شوێنی ولاّتەکانیان شوێنی پاراستنی شوێنەوارە دێرینەکانیان و مۆزەخانەکانیانە !

دوای ئەم سەرەتا دەڵێم:

ئێمەی کورد بە درێژایی مێژوو - مێژوومان شێوێنراوە، شوێنەوارمان دزراوە، تەنانەت ناوی زانا و پیاوە بلیمەتەکانی گەلەکەیشمانمان پیٚ ڕەوا نەبینراوە و، زۆریان بە زۆر خراونەتە ریزی زانایانی ولاّتانی دیکەوە.

ئەو مێژووەیشمان کە لەم ساڵانەی دواییدا بە هەوڵ و کۆششی چەند دڵسۆزێکی گەلەکەمان نووسراوەتەوە، لەتەك هەوڵی دڵسۆزانەی ئەو مامۆستایانەدا دەیان کون و کەلێنی تێدایە و، بە یەکەم خوێندنەوە و چاوپێداگێڕانیان چەندین هەڵەی زەق و زلیان تێدا دەبینرێت. کە بۆ هۆی سەرەکیی ئەم ناتەواویی و کەموکوورییانەیش بگەڕێین، بیٚ ماندووبوون دەگەینە ئەو ئەنجامە کە هۆکان - بە زۆریی - بۆ دوو لایەن دەگەڕێنەوە:

**یەکەم:** نەبوونی سەرچاوەی ڕەسا و دروست و ڕەسەنی باسەکەیان.

**دووەم:** پشتبەستن - بەناچاریی - بە سەرچاوەگەلی بێگانە کە هەندێکیان بە ئارەزوو و ئەنقەست مێژووی کوردیان شێواندوە و، هەندەکەی دیشیان لەبەر نەبوونی سەرچاوە لەلایەکەوە و، نەشارەزاییيان لە بار و دۆخ و بوومی وڵاتەکە و، دووریيان لە کەش و هەوا و بارە جۆراوجۆرەکانی وڵاتی کوردەوە - بێ ئەوەی مەبەستیان بێت چونکە هەر ئەوەندەیان لە دەستدا بووە - کەوتوونەتە هەڵەگەلی ئاشکرا و، نائاشکراوە و، مێژوونووسانی ئێمەیش گەلێ جار هەڵەی هەردوو تاقمەکە دەگوێزنەوە ناو کارەکانیان.

ئەی مێژوومان چۆن بنووسینەوە؟

بەپێی ئەوەی من بە تەنیا باڵ و، بەو کەمدەرامەتیی و کەمتواناییيەی خۆمەوە، لەم چەند ساڵەی دواییدا شانم داوەتە ژێر باری پرۆژەی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستنووسەکانیانەوە) بەگوێرەی ئەو ئەنجامەی بە دەستم هێناوە، دەتوانم بە پشتەسوورییەوە بڵێم: باشترین سەرچاوە و، ڕاستتر و دروستتر بنەوان بۆ ئەوەی زانیاریی ڕاست و دروستی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد لێ هەڵێنجین، شوێنەوار و دەستنووسە کۆنەکانی ناو کوردستان و زانایانی کوردە.

پێش ئەوەی بێمە سەر نموونە هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە دەستنووسەکان چ کاریگەرییەکیان لە نووسینەوەی مێژوودا هەیە و، مێژووی زانایانی کورد لەڕووی دەستنووسەکانیانەوە چۆن ڕاست دەکرێتەوە و، چۆن گەشە دەکات و بەرەو دروستیی دەڕوات... دەڵێم:

دەبێ لەپێشدا بکەوینە کۆمەڵی شوێنەوارەکانمان و، ژیرانە، لەسەرخۆ چۆنمان پێدەکرێت و، چیمان لە توانادا هەیە لە هەوڵ و وزە بیخەینە گەڕ و، بزانین لە مۆزەخانەکانی جیهان و کتێبخانەکانیاندا، چی شوێنەوار و دەستنووسی سەر بە کورد و کوردستان هەن، سۆراخیان بکەین و هەواڵیان بزانین و، زانیاریی پێویستیان لێ وەربگرین و، ئەو زانیارییانە بابەتبەندیی بکەین و، لە ڕووی زانیاریی بە دەستهاتووی نوێوە، یان سەر لە نوێ مێژووی کورد بنووسینەوە، یان بەشێوەیەکی زانستییانە

تێروتەسەل چاو بە مێژووی تۆمار کراوماندا بگێڕینەوە و، بە زانیارییە نوێکان کون و کەلەبەر و کەند و پەسێوەکان پڕ بکەینەوە و، چەوت و چەوێڵەکان راست بکەینەوە و، لایەنە لاوازەکان دەوڵەمەند بکەینەوە.

بەلاَم دەبێ پێش ئەم کارەیش لایەنێکی گرنگی دیکە هەیە باسی بکەین و، بەسەریدا نەڕۆین، چونکە بێ وریایی لەو لایەنە کارەکانمان نابەکام دەبن.

ئەو لایەنەیش ئەوەیە بەهۆی ئەوەوە زمانی کوردی زمانێکی جیهانیی یان ناسراو و دیاری ڕووی زەویی نییە و، بەزۆریی لەژێر باڵی زمانەکانی فارسیی و تورکیدا حەشار دراوە و، نەیتوانیوە لەژێر باڵی فەند و فێڵ و دەستخەڕۆ کردنی ئەو دوو زمانە سەر دەربێنێ و، هەوییە و پێناسەی تایبەتیی خۆی هەبێت، بەو پێیە ئەو بەرهەمانەیش بە زمانی کوردیی نووسراون، کاتێ دەستنووسەکانیان ئاوارەی ولاَتان بوون و، لە کتێبخانەکانی هەندەراندا لەنگەریان گرتووە، لەوێش دەستنووسە کوردییەکان لەژێر کاریگەریی ئەو دوو زمانەدا بزر بوون و، بۆیان نەلواوە لە سنووری دەستەلاَتی ئەو دوو زمانە دەرچن و، پێناسەی خۆیان بدۆزنەوە.

واتە: دەستنووسی کوردیی لە هەر کتێبخانەیەکی گشتیی یان تایبەتیی ولاَتاندا هەبێت ـ تائێستە ـ لەژێر ناوی دەستنووسی فارسیی، یان تورکیی، یان زمانە هیندوئەوروپییەکاندا کارت و ناسنامەی بۆ کراوە. لە وتارێکدا بە درێژیی لەسەر ئەوەم نووسیوە کە هێشتا ناونیشانی دەستنووسە کوردییەکانی کتێبخانەی فلاَن ـ هەر کتێبخانەیەك لە کتێبخانەکانی جیهان ـ لە سکی دایکی مێژوو دایە و، بەرەژانیشی پێوە نەگرتووە.

هەر وەك بەڵگەیەکی روونی ئەم لایەنەیش دەڵێم: کتێبخانەی دەستنووسەکانی عێراق (دار العراق للمخطوطات) کە پێشتر پێی دەگوترا (دار صدام للمخطوطات) پێش ئەوەی من بچمە ناوی و کاری تێدا بکەم، لەهیچ فیهرەست و ئەندێکسێکیدا ناوی دەستنووسی کوردی نەبوو، تەنانەت رۆژێك داوای دەستنووسێکم کرد کە لە کارتەکەیدا نووسرا بوو (مخطوط فارسی) کاتێ بۆیان هێنام و ئەمدیو و دیوێکیم کرد، دەبینم دەستنووسی دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانییە بە خەتی (خالص)ی کوڕی!

لەمەوە کەوتمە گەڕان بەدوای دەستنووسی کوردیدا لەو کتێبخانەدا، تا سەرەنجام گەیشتمە ئەوە پتر لە (٢٠٠) دووسەد دەستنووسی نایابی جۆراوجۆری کوردیم لە: دیوان و، کەشکۆڵ و، فەرهەنگ و، عەقیدە و، چەندین بابەتی دیدا دۆزییەوە و، زۆریانم بە مێژووی ئەدەبی کوردیی ناساند و، کارتی تایبەتیشم بۆ هەموویان کرد و، جێگەی تایبەتیم لە (اندکس)دا بۆ بڕدان و، کارێکی وام ئەنجام دا هەر لێکۆڵەرەوەیەك بچێتە ئەو کتێبخانە دەتوانێ بێ ماندوو بوون بزانێ چ دەستنووسێکی کوردیی تێدا هەیە.

دوای ئەمانە:

دوای ئەم باسە پێویستانە دێمە سەر ئەوە ـ وەك لە سەرەتاوە ئاماژەم بۆ کرد ـ بە تەنها خۆم و، لە ماوەیەکی کەم و، لە سنووری یەك کتێبخانەدا کارێکی وام ئەنجام داوە بە شانازییەوە دەڵێم: دەبێ لەبەر ڕۆشنایی ئەو کارەی مندا یان جارێکی دیکە مێژووی ئەدەبی کوردیی بنووسرێتەوە، یان بە تێروتەسەلیی چاو بە گەلێ لایەنیدا بگێڕرێتەوە، چونکە لە پرۆژەکەمدا گەلێ بیر و بۆچوونی وەهای پێشووم بە بەڵگەوە هەڵوەشاندوەتەوە، کە تا سەردەمێکی نزیك وا چەسپابوو کەس پرکێشی ئەوەی نەدەکرد بیر لە نادروستیی یان لاوازیی ئەو بۆچوونانە بکاتەوە.

بۆ نموونە:

١ـ تا سەردەمێکی نزیك ـ ڕەنگە تا ئێستەیش ـ لای زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد ئەوە چەسپابوو کە نالیی شیعر نووسینی بە دیالیکتی سۆرانیی یان کرمانجیی خواروو داهێناوە و، ئەو ڕچەشکێن و سەرقافڵەی ئەو کاروانەی ئەدەبی کوردیی بووە، بەڵام من چەندین دەقی ڕەوان و ڕەسای زمانی کوردیی، بە زاراوەی کرمانجیی خواروووم، دۆزییەوە و بڵاوم کردنەوە، کە دەیان ساڵ پێش نالی و، بگرە پێش لە دایکبوونی نالیش، گوتراون و تۆمار کراون، وەك: جەفایی مەلا محەمەدی سیوچپی خاوەنی بەیتی ئەوەڵ و ئاخر و، مەلا محەمەدی ئیبنولحاجی خاوەنی مەهدی نامە و، ڕەنجووریی خاوەنی دیوانی شیعری گەورە و تەڕ و پاراوی و، کارێزیی هاوچەرخی ڕەنجووریی و دۆست و هاوەڵی گیانیی و بیریی و ... کەسانی دیش.

وەك ئەمەیش دەڵێم، ئەوەیش لەبیر ناکەم کە ئەم ئەنجامانەی من بە دەستم هێناون دوا ئەنجام نین و، بە دووری نازانم، ئەمڕۆ بێت یان سبەی، لە سووچ و قوشبنی کتێبخانەکانی جیهانەوە چەندین بابەتی دیکەی وەها سەر هەڵبدەن. قۆناخی سەرەتای نووسینی شیعر بە زاراوەی کرمانجی خواروو بە ناخی مێژوودا گەلێ قووڵتر بکەنەوە.

٢ـ راستکردنەوەی مێژووی زانایان و ناوداران:

گەلێ جار باس و خواست و مێژووی تاکە کەس و بنەماڵە، دەماودەم لە دەمی ئەم و ئەوەوە وەردەگیرێت و تۆمار دەکرێت و، دوایی ئەو نووسراوە دەبێ بە بنەمایەکی مێژوویی وەها کە راست و دروست و جێگەی متمانە بێت و، هیچ مشتومڕ هەڵنەگرێت، کەچی لەپڕ لە پەنای دەستنووسێکدا زانیارییەك یان زانیاریگەلێك سەرهەڵدەدەن ئەو بنەما ـ تا ئەو کاتە ـ راست و دروستە ـ هەمووی یان هەندێکی ـ هەڵدەوەشێننەوە.

بۆ نموونە ژیانی مامۆستا مەلا ئەبو بەکری موصەننیف ـ تا ئەندازێك ـ بە وردیی نووسراوە و، چووەتە سەر لاپەڕەکانی مێژوو، دەستا و دەست ئەم و ئەو و بۆ باس و لێکۆڵینەوە زانیاریی لێ وەردەگرن. لەو ژینامەدا نووسراوە کە مامۆستا مەلا ئەبوبەکری موصەننیف چوار کوڕی هەبووە و، ناو و شوێنەوار و ژیانیان نووسراوە. بەلام من لە پەنای دوو دەستنووسدا ئەوەم دۆزییەوە کە ئەم مامۆستا کوڕێکی پێنجەمی هەبووە و، کوڕەکەی زانا و هەڵکەوتوو بووە و، ساڵی ١١٢٥ و دوای ئەوەیش لە شاری مەدینەی پیرۆزدا بووە، ئیتر دوای ئەوە هەواڵێکی ئەوتۆم دەربارەی نەدۆزییەوە، لەم ساڵانەی دواییدا بیستم کە نەوەی ئەم مامۆستا لە یەمەندان و، ئەو نەوانە دەزانن پێوەندییان بە بنەماڵەی مامۆستای موصەننیفەوە هەیە و، لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەوان. هەروەها بیستم پیاوانی ئەو بنەماڵە بە شوێن ئەوەدا دەگەڕێن کەسێك ڕێنموونییان بکات و بگەنەوە کوردستان و، خزم و کەسی دێرینیان بەسەر بکەنەوە.

هەروەها وەك لە دەستنووسەکانەوە بۆم دەرکەوتووە مامۆستای موصەننیف وەك لەڕووی نووسین و زانیارییەوە پیاوێکی پیرۆز و خاوەن زانیاریی زۆر و بەپێز بووە، لە رووی نەوەیشیەوە وەها بووە و، نەوەی زانا و پیرۆزی لە گەلێ ناوچەی جیهاندا، وەك دیمان و دەبینین، هەبووە.

یەکێکی دی لە نەوەکانی ئەم مامۆستا ـ ئەمیش لە ڕێگەی دەستنووسەکانەوە زانیومە ـ مامۆستا مەلا عەبدوڵڵایەکە، کە ناسراوە بە عەبدوڵڵای ڕەبتەکیی و، دوا قۆناغی ژیانی لە موصڵدا بووە، زانایەکی گەورەی ئەو شارە بووە و، گەلێ کەسی پێگەیاندووە و، ئیجازەی خوێندن و، خوێندنی قورئانی پیرۆز بە قیرائەتەکانەوەی پێدوان و، ڕشتەی ئیجازەی زۆر لە زانایانی موصلْ بۆ سەر ئەم مامۆستا دەگەڕێتەوە. هەروەها دەگێڕنەوە ئەم مامۆستا ئەوەندە پیرۆز و دۆعاگیرا بووە لەلای خودا، لە موصڵدا بێبارانییەکی زۆر سەخت بووە، خەڵك ترسی قات و قڕییان لێ نیشتووە، چوونەتە لای مامۆستا بۆ دۆعا و نوێژە بارانە، مامۆستایش داواکەی نەداونەتە دواوە و، چوونەتە دەرەوەی شار بۆ نوێژە بارانە، کە نوێژەکەیان تەواو کردووە و مامۆستا دەستی کردووە بە پاڕانەوە لە خودا، خودا دۆعاکەی گیرا کردووە و، هەور ڕووی ئاسمانی گرتووە و، تا هاتوونەتەوە ناو شار باران دەستی پێکردووە و بە تەڕیی هاتوونەتەوە ماڵی خۆیان.

هەروەها لە ڕێگەی دەستنووسەوە دۆزیومەتەوە کە مامۆستای موصەننیف نەوەیەکی دی بووە ئەویش هەر دوا قۆناغی ژیانی لە موصڵدا بووە، ئەم نەوەیشی ناوی سەید عەبدوڵڵا بووە، شاعیرێکی مەزن بووە، نازناوی شیعریی (مەئالیی) بووە، بەشێکی ژیانی لەناو شەبەکدا بەسەر بردووە، شەبەکیی زانیوە، شاعیرێکی زمانپاراو و، شیعرسوار و، تیا نەوەستاو بووە، بەشی زۆری شیعرەکانی جنێو و داشۆرینن، شێخ ڕەزایەکی دییە بۆ خۆی، بە هەر چوار زمانەکە عەرەبیی و، تورکیی و، فارسیی و، کوردیی، شیعری هەیە.

جێگەی شانازیمە یەکەم جار ئەم شاعیرەم بە مێژووی ئەدەبی کوردیی ناساند و، نموونەی شیعرەکانیم خستە سەر لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی کوردیی و، وێنەیشم لە دیوانەکەی بە دەست هێناوە و، چاوەڕێی پیاوی شارەزا و کارامەین، کە بە لێکۆڵینەوەوە بڵاوی بکاتەوە و، کەلێنێکی کتێبخانەی کوردیی پێ پڕ بکرێتەوە.

٣ـ هەر لە ڕێگەی دەستنووس و پشکنینی کتێبخانەی دەستنووسەکانەوە دەگەینە دۆزینەوەی کەرەستەی مێژوویی مێژوو:

مامۆستایەکمان هەیە بە ناوی رەسووڵ حاویی کەرکووکی، ئـەم مامۆسـتا کتێبێکـی کەموێنەی هەیە بە ناوی (دوحة الوزراء).

لە دوو لاوە مێژووی ژیـانی ئـەم مامۆسـتا ئـاڵۆزێنرا بـوو. لەلایەکـەوە: کـە تـورکیی باشی زانیبوو، زۆر لە داوود پاشـای والیـی بەغـداوە نزیـك بـوو، کتێبەکـەی بـە تـورکیی نووسـیبوو، پێـشکەشی کردبـوو بـە داوود پاشـا... مـۆرکی تورکایـەتیی نـرا بـوو بـە نێوچاوانی ئەم مامۆستا مەزنەوە و، مێژوونووسان نووسـیبوویان: بـە رەچـەڵەك تورکـە. خۆشبەختانە لە رێگەی دەستنووسـەکانەوە گەیـشتمە ئـەو ئەنجامـە کـە ئـەم مامۆسـتا مەزنەیش مامۆستایەکی کوردە و، خەڵکی شاری (سـنە) بـووە و، لـەوێوە هـاتوون، وەك گەلێ کوردی هەڵکەوتووی دیکەی ئـەو شـارە مەزنـەی کوردسـتان. قۆنـاغ بـە قۆنـاغ بـە سلێمانیی و کەرکووکدا هاتوون و، ئەنجام بلیمەتیی خۆیان گەیاندوونیە جێگـەی بـالا لـە دەرباری والیی بەغداداو، لەوێ لەنگەریان گرتووە، ئەم پیاوە جگە لە خـۆی چـەند بـرای دیکەی بلیمەتیشی لە تەکدا بـوون و، وەك ئەسـتێرە درەوشـاونەتەوە، بـەلام نەخۆشـی سیل بڕیبەستی لێ بڕیون و، زوو ئەم ئەستێرە پرشنگدارانە ئاوا بوون.

لایەنی دووەمی ئاڵۆزاوی ژیانی ئەم مامۆسـتا مەزنـەی کـورد کتێبەکـەی بـووە، کـە هەندێ کەس لایان وابووە کتێبەکەی دوو بەرگ بـووە، هەنـدێکی دی لایـان وابـووە هـەر یەك بەرگی داناوە و، مامۆستا موسا کاظم نەورەسی کـە بـەرگی یەکـەمی کتێبەکـەی لـە تورکییـەوە کـردووە بـە عـەرەبیی، پێـی لەسـەر ئـەوە داگرتـووە کـە بـەرگی دووهـەمی کتێبەکـەی دانـەناوە. خۆشـبەختانە بـەرگی دووەمـی ئـەم کتێبەیـشم دۆزییـەوە و ئـەم شانازییەیشم پێ براو، بە هەموو خوێنەران و گوێگران دەڵـێم: ئـەم کتێبـە سـیخناخە لـە مێژووی کورد و کوردستاندا و، بەشی زۆری بۆ مێژووی بابـان و ئـەو جـەنگ و رووداوانـە تـەرخان کـراوە کـە لـەو سـەردەمە تـا سـەردەمی دانـانی کتێبەکـە کـە سـاڵی (١٢٣٧ - ١٢٤١)ه تـەرخان کـراوە و، کتێبەکـە یەکێکـە لـەو سەرچـاوە مێژووییانـەی نـەبوونی کـەلێنێکی گەورەیـە لـە مێـژووی کـورددا و، دووبـارە - داوای لێبـوردن دەکـەم - خۆشبەختانە توانیم وێنەی لێ بگرمەوە و لە لەناوچوون رزگاری بکەم و، ئـەم نوسـخەی

تاکە نوسخەیەتی کە ئێستە چاوەڕێی تورکیزانێکی کارامەیە کە بیکا بە عەرەبی یان بە کوردیی و، کتێبخانەی کوردیی پێ دەوڵەمەند بکات.

٤ـ نامەویٚ درێژە بە وتارەکەم بدەم و کاتی بەڕێزان زۆر بگرم و، ئەمەی لێرەدا دەیخوێنمەوە هەر نموونە هێنانەوەیە بۆ بابەتگەلی جیاجیا کە لە مێژووی کورددا یان هەر تۆمار نەکراون، یان بە کەموکووڕیی و لاوازیی لە دەستدان. کوردستان لە ساڵانی دێریندا گەلێ دەرد و گرانیی و قات و قڕیی بەسەردا هاتووە، جاری وا هەبووە خەڵکەکە لەبەر برسێتی و گرانیی خاك و شوێنی خۆیان و زێدی باوباپیرانیان بەجێهێشتووە و، بەناچاریی ڕوویان لە شوێنانی دیی کردووە و، لەو کۆچ و ڕەوەیشیاندا کەمیان گەیشتوونەتە جێگەیەك تیایدا لە مردن ڕزگاریان بێت و، دوایی ئەگەر گەڕابنەوە بۆ شوێنی خۆیان داڵەوازیان گەڕاوەتەوە.

کە مێژوونووسانمان ئەمەیان تۆمار نەکردبێت و، بمانەوێ شتێك لەم لاوەوە بزانین، لەوە باشتر و دروستترمان لە دەستدا نییە کە فەقێ و مەلایانمان لە پەنای دەستنووسەکانیاندا تۆماریان کردوون. بۆ نموونە (گرانیی گەورەکە لە گرانیی یوسف گەورەتر بوو، عەلبەی دەۆك گەیشتبووە بیست قەران، باتمانی مێوژ لە موسڵ گەیبووە ٢٤ قەران، مەنی گەنم لە ناوچەی دۆسکان بە بیست قەران بوو، مەنی هەرزن و کزن و گاڵ گەیبووە ١٥ قەران، زۆربەی خەڵك لە برسانا مردن. تەغاری گەنم گەیبووە هەشتصەد قەران. ئەو گرانییەی ساڵی ١٢٩٧ بەجۆرێك بوو ٥ پێنج قەران لە گرانیی زەمانی حەزرەتی یەسف زیاتر بوو! ئەمە بەشێك بوو لە دەیان زانیاریی کە مامۆستایەکی ڕووداو نووسمان ـ لابەلا ـ لە پەنای دەستنووسێکدا تۆماری کردوون.

٥ـ هەروەها کاتێ کە دەزانین زۆری مێژووی جەنگ و ڕووداوەکانی سەر خاکی کوردستان بە دەستی دوژمن نووسراوە و، ئەوانیش چۆنیان ویستبێت وەها نووکی قەڵەمیان گێڕاوە و، ڕووی ڕووداوەکانیان وەرچەرخاندووە و، ئەگەر ئێمەیش دوای ئەوەی ئەوان ئەنجامیان داوە، بمانەوێ بۆ ڕووی ڕاستیی ڕووداوەکان بگەڕێین و بزانین کەی و لە کوێ و چۆن ڕوویانداوە، لە دەستنووسەکانی ناو حوجرەکانمان بەولاوە سەرچاوەی جێگەی بڕوا و متمانەمان بە دەستەوە نییە و، ئەگەر بتوانین ئەوانەی لەو

لاپەڕانەدا نووسراون کۆ بکەینەوە و، لە یەکیان بدەین و مێـژوویان لێ پێکبهێـنین، ئـەوە ئەو لاپەڕانە باشترین و دروستترین سەرچاوەی ئەو باسانەن و، دەستنووسەکانمان گـەلێ لـەو بـاس و ڕووداوانـەیان تێدا تۆمـار کـراوە و، لـە بەرگـەکانی بووژاندنـەوەی مێـژووی زانایانـدا لاپەڕەگـەلێکم کۆکردوەتـەوە کـە پـەردەی ڕووی شـاراوەی گـەلێ ڕووداویـان هەڵماڵیوە و، بە پوختکردن و یەکخستنیان زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

٦ـ یان بمانـەوێ دەربـارەی میرنـشینێك لـە میرنـشینە کوردەکـان شـتێك بنووسـین چیمان لە دەستدایە؟ ئەگەر شتێك دەربارەیان لە مێژوودا نووسرابێت ئەوە ـ بە زۆریـی ـ لایـان لـە ڕووداوە خوێنـاویی و، جەنگـە کارەسـات ئاوەرەکـان کردوەتـەوە و، تیـشکی زۆریان خستوەتە سەر دووبەرەکیی و ناکۆکیی ناو میرە کوردەکان و، چییان دژ بە یـەك کردبێت، یان پەنایان بۆ ئەملا و ئەولا و ناحەزانی کورد بردبێت، ئەوە بە ئـاب و تـابێکی کەموێنەوە بە تان و پۆیدا چوون، بەڵام قەڵەمیان لە عاسـتی جـوامێریی و، نانبـدەیی و، زانا پـەروەریی و، خزمـەتگوزاریی هاووڵاتیـان و مـەلا و مەدرەسـە و ... دا کـول و کـۆڵ بووە، جا ئەگەر یەکێك لە ئێمە بیەوێ بە دروستیی لا لە یەکێك لەو لایەنانـە بکاتـەوە و، بۆ ڕووی ڕاستیی باسەکە بگـەڕێت لـە دەستنووسـەکانی مامۆسـتایان و فـەقێیانیان بـەو لاوە شتێکی ئەوتۆی لە دەستدا نییە.

بـۆ نموونـە ئەگـەر بیـەوێ نـاو و ژیـان و بەسـەرهات و بەرهـەم و دانـراو و... ی مامۆستایانی عیمادییە کۆ بکاتەوە دەبێ چی بکات؟ گومان لەوەدا نییە کە لە هەندێ لە سەرچاوەکاندا ناوی چەند مامۆستایەکی دەستدەکەوێت، بەڵام ئایا ناوی هـەموویان یـان زۆربەیانی دەستدەکەوێت؟ ئایا ناوی دانراوەکانیان و سەردەمی ژیانیـان و، مامۆسـتا و، هاوەڵانیان و، ئەو شوێنانەی تیایانـدا خوێنـدوون و، ئـەو مامۆسـتایانەی ئیجازەیـان لـێ وەرگرتوون و، ئەو مەلایانـەی ئـەمان ئیجازەیـان داونـەتێ و .... چـەندین لایـەنی دیکـە وەدەست دێنن؟ من لەم بابەتانەدا دوودڵ و بە گومانم و، ئەوەی دیومـە و دۆزیومەتـەوە دەڵێ: تا دەستنووسەکان نەپشکنین ناگەینە ئەنجامی شیاو و دڵخۆشکەر.

من بە هـەوڵ و کۆشـشی تـەنیا بـاڵیی خـۆم دەربـارەی میرنـشینی عیمادییـە نـاو و بەرهەمی چەند مامۆسـتام دۆزیوەتـەوە ـ بـەگوێرەی گـەڕان و پـشکنینی خـۆم ـ لـەهیچ

سەرچاوەیەکدا نەمدیون و کەس پێش من پـەیی پێنـەبردوون، دیـارە خـۆ ئەگـەر چـەند کەسێك لە جوغزێکی فراوانتردا بگەڕێن لەوانەیـە زاناگـەلێکی دیکـە بـە مێـژووی زانایـانی کورد بناسێنن.

بۆ نموونە چەند دانـەم لـە کتێبـی (اعـلال التـصریف) دۆزییـەوە کـە مامۆسـتا مـەلا عەبدوڵڵای کوڕی شێخ ئیلیاسی (کلکوری) ساڵی (١٠٩٩ك) لە قەڵای عیمادییە دایناوە و، بۆ حەمادی کوڕی داناوە و، ئەو سەردەمە سەردەمی عوثمان بەگی کـوڕی سـەعید خـان بووە.

ئەمە جگە لە مامۆستا مەلا حامیدی کوڕی مەلا شێخ عەلی عیمـادیی و، عیمـادەدین و، شەهابەدین و، عەبدوڕەحمان و چەندین مامۆستای دیکە....

هەر لە ڕێگەی دەستنووسەکانەوە دەزانین کە شـاعیرێکی عیمـادیی خـاوەن دیـوان هەبووە بە ناوی صادقی عیمادیی، بەڵام دیوانەکەی ئێستە لە دەستدا نییە.

هـەروەها لـە ڕێگـەی دەستنووسـەکانەوە زانیمـان مامۆسـتایەکمان هەیـە بـەناوی ئیـبراهیم، چـەند دانـراوی بـۆ ئێمـە زانـراوی، لـە تەفـسیری قورئـانی پـیرۆزدا هەیـە و، دانراوەکانی پێشکەشی بەهرام پاشا کردووە.

هەروەها لەناو دەستنووسەکانەوە دەزانـین لـەناو بنەماڵـەی عیمادیـدا چـەند زانـا و مامۆستای بەڕێز هەبوون، کە خوێندن و زانیاریی و بڵاوکردنەوەی ڕۆشـنبیریی پیـشەیان بووە و، تەنها شانازییان هەر لەو ڕێگە پیرۆزەدا بووە و، تەنانەت ناوی (عەللامە)یان بـۆ کوڕەکانیان داناوە و، چۆنیان ویستووە و ئاواتیان بووە وەها بووە و، ئەو (عەللامـە)انـە بە ڕاستیی عەللامە و خوێندەواری باڵا بوون.

دەبێ ئەوەیش بزانین وەك دەڵێن: چەپڵە بە دەسـتێك لێنـادرێ، ئـەم مامۆسـتایانە بێ پشت و پەنا نەبوون و، بە تەنها و لە خۆیانەوە ئەو ڕێگـە پیرۆزانـەیان بـۆ نـەبڕاوە. بـەڵکو میرانـی عیمادییـە هانـدەر و یارمەتیـدەر و پـەنایان بـوون لـەو کارانەیانـدا و، مامۆستایانیش ئەوەیان لەبەرچـاو بـووە و، ئـەو بایەخـەی میرانیـان لـەبیر نـەکردووە و، بەرانبـەر بـەو کـارەی ئـەوان ئـەمانیش دانراوەکانیـان و، بـەری بـیر و کۆشـشیانیان

پێشکەشی میرانی عیمادییە کردووە و، لە ڕێگەی دەستنووسەکانەوە نموونەی ئەم بایەخدانە دوو قۆڵییەی میران و مامۆستایانی عیمادییە وەردەگرین.

٧ـ ئەوەی بۆ میرنشینی عیمادییە و میرانی و، مامۆستا و زاناکانی دەگوترێ بۆ میرانی: بابان و، ئەردەلان و، سۆران و..... شوێنانی دیش بە شێوەگەلی جیاجیا دەگوترێت.

وەك گوتم مێژوونووسان بۆ میرنشینە کوردەکان و میرەکانیان ـ بە زۆریی ـ پێیان لەسەر لایەنی جەنگ و هەرا و دووبەرەکیی نێوانی میرەکان داگرتووە و، بایەخی زۆریان بەوە داوە بڵێن: فلان ساڵ فلان میر لەشکرکێشی کرد بۆ سەر فلان برای خۆی و، دەستی سوپای بێگانەی گرت و، لە وڵاتی خۆی وەدەرینا و، ماوەیەك دوای ئەوە ئەمیش بە لەشکرێکی گەورەترەوە دایەوە بەسەر براکەیدا و، رایفراند، یان گرتیی و، وای لێ کرد و وای لێ کرد... ئیتر مەگەر بە راڕەو بەلای باسگەلی دیدا چووبن، بۆ وێنە میرانی بابان وەك لە جەنگ و هەرای نێو خۆیاندا دەورێکی دیاریان بووە، هەرگیز لایەنی رۆشنبیرییان پشتگوێ نەخستووە و، رێزنان لە مامۆستایان و زانایان و، دروستکردنی مەدرەسە و مزگەوتی گەورە بۆیان و، وەقفکردنی زەوی و زار و باخ و ئاش و ... لەسەر مەدرەسەکانیان و، تەنانەت گەڕان و ناردن بە شوێن زانایانی ناودار و شارەزای ئەو شوێنانەیشدا کە لەژێر رکێف و قەڵەمڕەوی خۆیاندا نەبوون و، هێنانیان و رێزلێنانیان ... کارێك بووە میرانی بابان لەناو خۆیاندا پێشبڕکێیان تێدا کردووە.

بەڵام ئەمە لە مێژووی باباندا کەمتر رەنگی داوەتەوە و، مێژوونووسانێ کەم لایان لە مێژووی بابان کردوەتەوە، کەمتر کاریان بۆ ئەم لایەنە کردووە، کەچی کە چاوێك بە دەستنووسەکانی ئەو دەڤەرەدا دەگێڕین دەیان دەستنووسی گەورە و نایاب دەبینین کە میرانی بابان یان بە کڕین و هێنانیان لە وڵاتانەوە، یان بە فەرماندانیان بە خەتخۆشان بۆ نووسینەوەیان دەستیان خستوون و، لە کتێبخانەکانی مامۆستایانی میرنشینەکەیاندا کۆیان کردوونەتەوە و، دوایی وەقفیان کردوون لەسەر مامۆستایان و کتێبخانەکانیان.

## ملخص البحث

## دور مخطوطات علماء الكرد في كتابة تأريخ الكرد وعلمائه

### محمد علي قرداغي

يعاني التاريخ الكردي جرّاء مالحق الشعب الكردي خلال تاريخه الطويل من الويلات والنكبات، وما تبع ذلك من احراق المدارس والمكتبات وإتلاف كتبه وموروثه الثقافي... يعاني جراء ذلك من نقص في تاريخه. ووجود تغرات كبيرة وحلقات مفقودة في ماضي أجياله.

واذا اردنا تدارك مايمكن تداركه من ذلك التاريخ الطويل، واعادة النظر في الكتب والابحاث التي تناولت التاريخ الكردي، فلا نجد أصح واوثق مما بقي في بطون المخطوطات، وهوامش وحواشي العلماء، وتتمات وخواتيم النساخ الذين يدونون ـ بقصد ومن غير قصد ـ حوادث كثيرة كانوا شاهدها العيان، او جزءاً من اشخاص دارت عليهم رحى الكوارث... فتعد المخطوطات ـ بحق ـ كنزاً غير مكتشف حتى الآن، ولم تتناولها ايدي الخبراء والباحثين ليستقوا من ذلك المعين الصافي، ويرتوا من جداوله الرقراقة، ويروّا التاريخ بزلال فيضه الدافق.

نحاول من خلال هذه الصحائف التأكيد على اهمية هذه المصادر، وبيان ما لها من قيم علمية عالية، علها.

**'Abstract'**

## The Role of Kurdish manuscripts in writing the history of Kurd and its scholars

**M.A. Kardagi**

Kurdish history suffers great deficiency in sources due to those disasters and suppressions, our nation experienced through its long history.

To set right our history, we must turn to manuscripts, footnotes and postscripst of the scholars or the epilogues and continuing sections of some transcribers who recorded a lot of events as eye witnesses. So I try my best throhg this study to confirm the importance and worth of those sources.